





## کورتەیەك لەمەڕ نووسەر

ئەلکساندەر ئەلکساند روڤیچ فادایف ، نووسەری نێوداری شورەوی لە ساڵی 1901 دا لە خێزانێکی گوندنشین ، لە توڤەر لە دایك بووە، دەورانی منداڵیی لە رۆژهەڵاتی دوور گوزەرانداووە، بابی مامۆستای شارو دایکی پەرستار بوو، لە پاڵ کاری خۆیاندا کاروباری کشتوکاڵیشیان کردووە، بۆیە ئەلکساندەر هەر لە منداڵییەوە ئاشنایەتی نزیکی لەگەڵ بارودۆخی ژیان و گوزەرانی جوتیاران و کرێکاران پەیداکردووە ئەم نووسەرە لەگەڵ پارتیزانەکاندا دژ بە هێزەکانی ئەدمیرال کلْچاك و پەلاماردەرە ژاپۆنیەکان جەنگیوە، ئەم کتێبەشی بەرەنجامی ئەو ئەزموونە فرانەیە کە لەو جەنگەدا بە دەستی هێنان، فادایف لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبەدا شۆرەتی دەرکرد و وەکو نووسەرێکی پرۆلیتێری ناسرا. (گاردی لاو) کتێبێکی تری مەنشوریەتی کە بریتی یە لە شەرحی خەباتی قارەمانانەی پارتیزانەکان دژ بە داگیرکەرانی فاشیست. ئەم نووسەرە نێودارە لە 1956/5/13 دا ماڵئاوایی لە دنیاکرد .

## کورتەیەك دەربارەی کتێبەکە

ئەم چیرۆکە شەرحی حاڵی دەستەیەك نیشتمانپەروەرە کە بەرانبەر بە هێزە بێگانەکان و کلچاك بەرگری لە ولاتی خۆیان دەکەن و لەم رێگایەدا گیان بەخت دەکەن، قارەمانەکانی فادایف لەگەڵ ئەوەدا کە خەڵکی نێو ژیانی ئاسایین و هەمان خوو و خەسڵەتی چاك و گەنی بەشەریان هەیە ، بەلاّم دەست دەدەنە کاری گەورە خەبات دەکەن و سەرەنجام سەر دەکەون، زۆربەیان خۆشەویستن جێگای متمانەو باوەڕن، تەنانەت ئەوانەیشیان کە لە ژیانی ئاسایی خەڵکا بەرەڵلاو بیّ بار دێنە بەرچاو ، لە کاتی تەنگانەو ناسك دا لە کاتێکا کە بابەتی ئەرکی سەرشان دێتە پێشەوە وەکو ئینسانە واقیعی و لە خۆبوردووەکان کاردەکەن کە بۆ شوێنی خۆی شایانی ستایشن، لە ماوەی ئەم جەنگ و هەرایەدا ژمارەیەکی زۆریان گیانی خۆ لە دەست دەدەن و تەنیا ژمارەیەکی کەمیان بەسەلامەتی دەردەچن و دەگەڕێنەوە خاك و زێدی خۆیان، گەرچی ئەم دەستەیە دەشکێن بەلاّم شکستەکەیان بەهیچ جۆریّ شکستی ئەو باوەڕو ئامانجە ناگەیەنیّ کە ئەوان خەباتیان لە پێناودا کردووە، چونکە هاوزەمان لەگەڵ هەمان رووداو و لەگەڵ هەمان چەشنە گیانبازی دا گەورەترین رووداوی سەدەکە روودەدا .

**ماروسكا**

ڤنسون ، لە حاڵێكدا كەونە شمشێرە ژاپۆنیەكەی بە تەقەتەق لە پلەكانی قاڵدرمەكە دەخشا، خۆی بە حەوشەكەدا كرد، لە كێڵگەكانەوە بۆن و بەرامەی خۆشی گەنمی رەشگوڵ دەهات، هەتاوی تەموز لە نێو تەمێكی گەرم و سوورو سپی دا مەلەی دەكرد .

ماروسكا هەندێ گەنمی كێوی لەسەر لەتە سوالەتێك وشك دەكردەوە بە قامچی كۆمەڵێ چێرگی دەدا یە دوواوە .

ڤنسون زەرفێكی موركراوو داخراوی بۆ درێژكردو گوتی :وەرە ،ئەمە بەرە بۆبەشی شالدیباوپێ ی بڵێ كە ... نا، پێویست ناكا هیچی بێ بڵێ ێ ، لە نامەكەدا هەموو شتێكم نووسیوە.

ماروسكا بە روو گرژییەوە رووی لێ وەرگێڕاو بە توندی قامچییەكەی لە حەوادا بادا. نەیدەویست بڕوا . لەم هاتوچۆ رەسمیانە، لەم نامە بێ ئەنجامانەو زیاد لە هەموو ئەمانەش لەو نیگا سەیرەی چاوانی ڤنسون بێزارو وەرز ببوو . جووتێ چاوی درشت و مەنگ كە وەكو دەریا سەراپای ماروسكایان دادەگرت و گەلێ شتیان لێ بەدی دەكرد كە رەنگە بە خۆی لێیان بێ ئاگا بووبێ .

تەتەرەكە بە خەمبارییەوە چاوی دەتروكاند بە هێوری خۆی دواند (ئەی حەرامزادە !)

ڤنسون پرسی : باشە ماتڵی چیت ؟

– باشە هاوڕێ فەرماندە ، بۆ دەبێ هەمیشە ماروسكا بەملاوبەولادا بنێرن ؟ كەسێكی دی بەدی پەیدا نابێ ؟

بە ئانقەست پێی گوت (هاوڕێ فەرماندە) تا لایەنی رەسمی بە نارەزاییەكەی بدات . چونكە زۆر ئاسایی ڤنسونی بە نێوی خۆیەوە گازدەكرد .

ڤنسون بەرەقی وتی : كەواتە دەبێ خۆم بڕۆم ، ها ؟

– جا بۆ خۆت ؟ ئەم هەموو خەڵكە لێرەن ...

ڤنسون بە چەشنی پیاوێكی جدی كە كاسەی سەبری لێوڕێژ بووبێ ، نامەكەی خستە گیرفان و بە ساردییەكی كوشندەوە گوتی : بڕۆ ، بڕۆ تفەنەگەكەت بدە اموری چەكەكان من پێویستم بە هەر لات و بەرەڵا یەك نییە .

شنەیەكی سازگار لەسەر چۆمەكەوە دەهات و قژە ناڕێكەكەی ماروسكای دەشێواند. كولوكان لە نێو گیا وشەكەكانەوە و لە نزیكی عەمارەكەوە بە شێوەیەكی بێ ئامان هەوا گەرمەكەیان شەق دەكرد .

ماروسكا بە روو گرژییەوە ووتی : سەبركە ، نامەكەم بەرێ .



له کاتێکا نامەکەی دەخستە ژێر بلووزە سوپاییەکەیەوە ، شتێکی وت کە پتر لەبەرخاتری خۆی بوو تا لڤنسون (لقەکەم جێ بهێڵم ، چەك دابنێم ؟ مەحاڵە !) کلاوەتوزاوییەکەی خستە پشت سەری و بە دەنگێگی دڵسۆزانە کە نیشانەی شادییەکەی چاوەڕوان نەکراو بوو ، گوتی : هاورێ لڤنسون ، ئێمە لەبەرچاوی کاڵی سەرکار نەبوو دەستمان بە خەبات کرد !من بە زمانی بابایەکی مەعدەنچی سادە ئەمەت پێ دەڵێم .

فەرماندە بە پێکەنینەوە گوتی : هێشتا قسان دەکەی ئەوەندە کەللە رەق مەبە گەوجە .

ماروسکا دوگمەی چاکەتە سوپاییەکەی فەرماندەی گرت و بەرەو لای خۆی رایکێشاو بە جۆرێکی تایبەتی بە گوێی دا چپاند : بزانە برادەر من خۆم ئامادە دەکرد کە بچم بۆ نەخۆشخانە تا ڤاریا ببینم ، کەچی رێك لەو کاتەدا تۆ بەم نامە نەحلەتیەت هەموو شتێکت لێتێك دام ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە تۆ گەوجیت .

بەچاوە قاوەیی یە مەیلەو سەوزەکانی ، چاوێکی لێ داگرت و قاقا پێکەنی ، لەپێکەنینەکەی دا – بە ئێستاشەوە وەختێ دەربارەی ژنەکەی قسانی دەکرد – خاڵێکی تاریك بەدی دەکرا کە دەمێ ساڵ بوو وەکو ژەنگ ناخی دەخوارد .

لڤنسون ئەو پیاوەی گازکرد کە لەبەر هەیوانەکەدا وەنەوزی دەداو چاوەکانی دەتروکاند تا خەوەکەی بتارێنێ : تیموشا ، وەرە ئاگات لەم گەنمە بێ، ماروسکا بە ئیش دەڕوات .

کونچارنکوی مینەر لەسەر تەشتێکی دەمەوقڵب لە نزیکی تەویلەکانەوە دانیشتبوو ، کۆڵەپشتە چەرمیەکانی دەدورییەوە ، کلاوی لەسەرنەبوو ، دەموچاوی تاوە سووت ببوو، ردێنێ چڕوسوور بوو . دەموچاوە زبرەکەی بەسەر کۆڵە پشتەکانەوە شۆڕکردبۆوەوە . دەرزیەکەی بەجۆرێ بەکاردەهێنا دەتگوت چنگاڵی بەدەستەوە بوو . شانە بێ هێزەکانی لە ژێرکراسە زبرەکەیەوە وەکوو بەرداش دەجولاَن .

مینەرەکە پرسی: چییە، هەمدیس دەڕۆی؟

مینەرەکە قیت راوەستاو تەمەنایەکی سوپایی کردو گوتی : بەڵێ ، سەرکار ، جەنابی مینەر !

گونچارنکو لە کاتێکا بەسەلاری و هێمنی وشەکانی خۆی هەڵدەبژارد وتی : ئازاد بە ! منیش سەرزەمانێ لەم تەشەقەڵەبازیانەم دەکرد، بۆچ کارێ دەچێ ؟

– هەروا ، فەرماندە دەیەوێ بە تۆبزی مژوولم بکات ، دەترسێ ئەگەر بێ کاربم دەست بە هەندێ کاران بکەم ، بڕۆم زۆڵ فرێ بدەم .

مینەرەکە بۆلاَندی : گەوجە ! ساچانی کەروچەناباز !

ماروسکا ئەسپەکەی لە تەویلە دەرهێنا . ئەسپە یاڵ بژەکە بەرقەوە گۆێچکەکانی قوت کردەوە ، میشکا ئەسپێکی بەهێز , کوڵکن وقەڵەو بوو. زۆر زۆر لەخاوەنەی دەچوو؟ بەچاوە ڕۆشنە قاوەیی یە مەیلەوسەوزەکانی بەلاقە ئەستورو قەوسەکانیا , بەچاوە زیت وبزۆزەکانیا. ماروسکا بەدەم تەنگك وپاڵوو دانی ئەسپەکەوە, بەئەسپایی وبە خۆشەویستی یەوە دەیلاواندەوە: میشکا!شەیتان!میشکا! نەحلەتی توولە سەگ!.گونجارنکو سەلارانەو بەم جۆرە لەسەری رۆیی: بەخوا ئەگەر ئەسپەکە ئەقڵی بەسواریدا دەشکا , ئەو سواری تۆدەبوو نەك



تۆسواری ئەوبی. ماروسکا بەنەرمە غارێك لە حەسارەکە دەرچوو. جادەکە,کە گیا هەموولایەکی داپوشی بوو,رێك بەکەناری چۆمەکەدا دەرۆیی. تەبارە گەنم وجۆلەو بەر چۆمەکەوەو لەژێر تیشکی هەتاودا کەرۆیشکەی دەکرد. قوتە شین باوەکانی زنجیرە چیای (سیخوتە ئالین) لەدەریای تەم دا مەلەی دەکرد.

ماروسکا رۆڵەی کرێکارێکی مەعدەنچی بوو, بەخۆیش هەر مەعدەنچی بوو.باپیری کە خەلك وخوا دەستیان لێ شۆردبوو,لەمەزراکانی ساچاندا کێلگەی دەکێلاْ, بابیشی لەم دواییانەدا زەوی رەشی مەعدەنی تەرك کردبوو. ماروسکا لەیەکێك لە کوختە کرێکارنشینەکاندا ,نزیکی تونێلی ژمارە((2)) رێك لەودەمەدا کەدەنگی تیژی شاورێك نۆرەکاری سەرلەبەیانی رادەگەیاند, لەدایك بوو.کەپزیشکی مەعدەن لەکوختەکە هاتبووە دەرێو هاوخەمی خۆی بەبۆنەی کوڕبوونی نەوزادەکەوە راگەیاندبوو,بابی پرسی بووی:هەمدیس کوڕ؟ئەمە چوارەمە. لەحاڵێکدا خۆی بە قەزاوقەدەردەسپارد, بەمجۆرە قەسەکەی کورت کردەوە:ژیانێکی چەند خۆشە!.ئەوجا قەمسەڵەکەی کەلەگەردوتۆزی مەعدەندارەش هەڵگەرا بوو,لەبەرکردو بەخشەخش چوو بۆسەر ئیشەکەی. ماروسکا لە((2))ساڵیدا, تایە لیخۆرین, قسەی قۆڕو9 بێ سەروبەرو بادەنوشی بەچاکی فێربوو- لەکانەکانی ساچاندا بە ئەندازەی خەلکە مودمینەکەی بارهەبوو-دۆڵەکە 200 هەنگاوێك لەولای تونێڵەکەوە کۆتایی دەهات وگردولکە بورکانیەکان دەستی پێدەکرد.دار سنوبەری زەلام لەداوێنی ئەم گردولکانەوە بەخەمباری‌یەوە دەیانڕوانی یە ماڵەکانی خوارەوە. لەبەیانیانی تەماویو سپیواژدا کەڵە کێوی یەکان بەدەنگی بەرز یەکدیان گاز دەکرد.ترێلەکان گشت رۆژێ بەنێو شەقی سپیواژی گردۆڵکەکانداو بەسەر رێبازە نشێوەکاندا بەدرێژایی جادە بێ کوتاییەکان بەرەو وێستگای کانگاوز دەچوون. لەسەر گردۆڵکەکان, مەکینەی نەوتاوی چاڵ هەڵکەندن کەبەردەوام لە جووڵەدا بوون, سیمی خزیان بەدەوری خۆیاندا دەپێچا.لەخوار رێبازگەکەوە,لەو شوێنەدا کەتەلاری بەردین لێرەولەوێ لەنێو سنۆبەرە بۆن خۆشەکاندا گیرسابوونەوە, خەڵکانێ لەهەوڵ کوشش دابوون بێ ئەوەی بزانن ئەم هەوڵ وتەقەللایەیان لەپێناوی چ کەسێکدایە. مەکینەی قیتارەکان بەجۆرێکی نارێك شوتیان لێدەدا ,باڵاڕۆکارەباییەکاکان دەنگیان دەهات. ژیانێکی خۆش بوو.ماروسکا لەو ژیانەدا لەهەوڵی شێوەگەلی تازەدا نەبوو,تەنیا کەوتبووە شوێن هەمان کاروانی سەقامگیرو کۆن. لەکاتی خۆیدا کراسی ئاوریشم وپوتی چەرمینی بۆ خۆی دەکڕی ,رۆژانی پشوو لەدۆڵەکەوە بەرەو گوند دەڕۆیی,لەوێ لەگەڵ لاوانی گوند دا ئوکوردیۆنی لێ دەدا , بەدەنگی بەرز گۆرانی دەچڕی و کیژانی گوندی لەرێ دەر دەردکرد. لەڕێی گەرانەوەدا(دۆستانی مەعدەنچی)گوندۆرەو ئارووی سیسەوە بوویان دەدزی , لەچۆمە قوڵەکانی داوێنی کێوەکاندا مەلەیان دەکرد. بەغەلبەغەڵب ودەنگی پڕخرۆشیان هێوری لێڕو بێشەکەیان دەشلەقاند, مانگك لەپشت ئاسۆکەوە و لەبەرزی‌یەوە تەماشای دەکردنو بەخیلی پییان دەبرد. تەمێکی گەرم وشێدار بەسەر چۆمەکەوە وێستابوو. زەمانێکیش لەمەخفەرێکی پۆلیس دا کە بۆنی بۆگەنی گەنەسوورکەو ئەرەقی پێی لێ دەهات , توندیان کرد. ئەمە دەقاودەق لەهەڕەتی مانگرتنەکەی نیسان دا رووی دا .رێك لەکاتێکا



بوو کەئاوی لێڵی ژێرِ زەوی وەکوو ئاوی چاوی ئەو ئەسپەکوێرانەی لە مەعدەنا کاریان دەکرد, شەو ورۆژ دەچکایە نێو تونێڵەکانەوەو هیچ کەسێکیش نەی دەرِشتە دەریَ حەپسیان کرد , هەڵبەتە نەك لەبەرئەوەی کارێکی گەورەی ئەنجام دابوو , بەڵکو تەنیا لەبەر ئەوەی پیاوێکی چەقاوەسوو وزۆربڵێ بوو: پۆلیس بیری لەوە دەکردەوە دەتوانێ بەهەرِەشە ناچاری بکات نێوی رێبەرانی مانگرتنەکە بڵێ. **ماروسکا** لەکاتێکدا لەو ژووره بۆگەنەدابوو لەگەڵ قاچاخچیانی مەی ناوچەی (مایخە)دا رۆژی بەسەر دەبرد , گەلێك حەکایەتی بێ سەرو بەری کردبوو ,بەلاّم هەرگیز وشەیەکی دەربارەی کارگێرِان و بەرێوەبەرانی مانگرتنەکە نەهاتبووە سەرزار . سەردەمێکیش چووە جەبهەو پەیوەندی بەسنفی سوارەوە کرد.لەوێدا وەکو هەموو سەربازێکی سوارە فێر بوو کە(سەربازانی پیادە) ببوفزێنیَ و بەسووکی تەماشایان بکات .شەش جار بریندار بوو,دوو جار پارچە توپ ئازاری پیَ گەیاند , ئەنجام لەدەوروبەری شۆرِش گەورەدا لە خزمەتی سەربازی مەرەخەس بوو . وەختێ گەرِایەوە نیشتیمان پاش دوو هەفتە بادەنۆشی لەرِادەبەدەر لەگەڵ ژنێکی میهرەبان وسووك دا کە ماموری عارەبانە دەستیەکانی تونێڵی ژمارە((1)) بوو, زەماوەندی کرد.ماروسکا کابرایەکی بێ موبالات بوو, ژینی بەلاوە وەکوو ئارووی نێو بێستانەکانی ساجان ,سادەو رۆشن بوو. رەنگە هاندەرێکی وەختی وای لیَ کرد بیَ لەساڵی1918 لەگەڵ ژنەکەی دا راپەرِیَ وبەرگری لەشوراکان بکات . بەهەرحاڵ لەوساڵە بەد وواوە ئیدی رێگای گەرانەوە بۆ مەعدەنی لیَ گیرا: ئەوان نەیانتوانی شوراکان بپارێزن .رژێمی تازەش بەگومان و دوودڵی یەوە دەرِوانی یە ئەو بابەتە خەڵکانە. میشکا کە ناڵەکانی بەجورێکی ترسناك تەقەتەقی دەکرد ,بەچوارناڵە جادەکەی دەبرِی .خەرەنگێزە زەرد باوەکان شێت ئاسا بەدەوری گوێچکە یدا ویزە ویزیان دەکرد وخۆیان بەنێو تووکە زبرەکەیدا دەکرد وئەوەندە یان دەگەزی تاخوێنی لیَ دەهات .ماروسکا گەییە بەشی سوپایی سڤیاگینو .گوندی کریلوفکا کە مەقەرِی دەستەکەی شالدیبای تێدا بوو ,کەوتبووە پشت گردێکی سەراپا بەدرەختی سەوزی فندق ,پۆشراو. ویزە ویزی بێزارکەری مێشە لاسارەکان دەگەییە کویَ . دەنگی تەقینەوەیەك وناڵەیەکی سەیر لەپشت گردەکەوە هەستاودنیای هێنایە لەرزە .دووا بەدووای ئەوە ,ناڵەی دووەم وسێیەم هەستا ,دەتووت گیانلەبەرێکی درِندە زنجیری پچرِاندووەو خۆی هەڵدا شتووەتە نێو دەوەنەکانەوە .ماروسکا کە بەتوندی جڵەوەکەی رادەکێشا لەژێرلیوەوە گوتی:سەبرکە!میشکا کە هەیکەلی خورتی خۆی بەتەندی دەبردە پێشیَ ,لەرِووی گویَ رایەلی یەوە وەکو بەرد لەجیَی خۆی چەقی .ماروسکا لەکاتێکا کەخۆی لەسەر زەوی‌یەکە خپ دەکرد ,بەهێوری گوتی:گوێت لیَیە...گوللەی تۆپە! تۆپە,ها؟ دەنگی دەسترِێژی گرِداری رەشاشێك کەدەنگی کەرِکەری تفەنگە راوی‌یەکانی بەدەنگی تیژی کارابینە ژاپۆنی‌یەکانەوە گریَ دەدا ,لە پشت گردەکەوە دەنگی دەدایەوە .ماروسکا بەدەنگی هەڵچوّوەوە هاواری کرد: چوارناڵە- بۆپێشەوە پەنجەی پیَ یەکانی لەئاوزەنگییەکە توند کرد, بەدەستی لەرزۆك کیفی دەمانچەکەی کردەوە, میشکا بەنێو دەوەنەکاندا کەوتبووە خشەخش و بەرەو سەرکێوکە تاوی دەدا . پاش ماوەیەکی کەم گەییە لووتکەکەو ماروسکا بەتوندی لە غاوەکەی راکێشا. لەئەسپەکە دابەزی



.جڵەوەکەی خستە سەرزینەکەو وتی :لێرە بوەستە!میشکا خوڵا مێکی ئەمەکداری ئەوتۆ بوو کەهەرگیز پێویستی بە شوورە نەبوو .

ماروسکا بە سکەخشکێ خۆی گەیاندە لووتکەکە .بەدەستەراستا شەپۆلە پەیکەرێکی چکۆلەی چون یەك کە کلاوی تیلماسك سەوزو زەردیان لەسەر بوو,لەداوێنی کریلوفکاوە بەشێوەیەکی رێك وپێك لەحەرەکەتدا بوون , دەتووت لەنمایشێکی سوپاییدا دەرۆن. بەدەستەچەپا , لەنێو تەبارە جۆیەکی گوڵزێرینەدا تاقمە خەڵکێکی بێ سەرو بەرو پەشۆکاو , بەدەم هەڵاتنەوە خەریکی تەقەکردن بوون. شادیبا (کە ماروسکا بە ئەسپە رەشەکەی و بەکڵاوە قوچەکەیدا ناسییەوە) بەتورەیی قەمچییەکەی بە چەپ وراست دابادەداو جڵەوی ئەم تاقمە هەڵاتووەی بۆنەدەگێرا . ماروسکا بەچاوی خۆی دەی بینی هەندێکیان تیلماسکە سوورەکانیان هەڵدەتەقاند وتوریان دەدا.ماروسکا پەیتا پەیتا بەم دیمەنە گەشکەی دەکرد: ئەم بەرازە نەحلەتیانە مەبەستیان چیە,چ دەکەن؟دەیانەوێ چ بکەن ؟لەپاش دووا دەستەی ئەم پیاوە ترساوانەوە ,گەنجێکی باریکەلە کە دەستەسرێکی سپی لەسەرو چاکەتێکی کوڵی شاری لەبەر بوو, بەزەحمەت تفەنگەکەی هەڵدەگرت ,بەلۆقەلۆق خۆی بەکێش دەکرد .دەتووت ئەندامانی دەستەکە هێواشتر رادەکەن تا ئەوبەجێ نەهێڵن .بەڵام زوو بەزوو لە چاو وون بوون و گەنجە دەستەسرێ بەسەرەکەش بەسەر عەردەکەدا خل بووەوە. هێشتا زیندوو بوو. هەوڵی دەدا هەستێتەوەو دووی ئەوان بکەوێ .باسکەکانی بلاْوەکردەوەو بەدەم هاوارەوە شتێکی دەگووت .دەستەکە بێ ئاوردانەوەو بەخێرایی دوور کەوتنەوە.کورە گەنجەکەیان بەتاقی تەنیا بەجێ هێشت. ماروسکا کە پەنجە لەرزۆك وعارەق کرووەکانی بەتفەنگەکەیەوە دەگوشی هاواری کرد:زۆڵینەی نامەرد ینە!ئەوە چ دەکەن. بەدەنگێ کەدەتووت دەنگی ئەونی یە,گازی کرد: میشکا !وەرە بۆ ئێرە. میشکا لەکاتێکاکە پەرەی لووتی ئاوسا بوو, حیلەیەکی هێدی بۆکردو بەلەشی رووشاوو خوێناوییەوە بەرەو سەرگردەکە غاری دا. پاش کەمێك ,وەك چۆن باڵندەیەك بەدەم فرینەوە باڵی کردبێتەوە, ماروسکا بەنێو تەبارە جۆیەکدا تێی دەتەقاند. گیزەگیزی باڵی خەرەنگیزە بۆرەکان رقی هەڵدەستاند . پاشەڵی ئەسپەکە قورس بوو بوودەتووت کەوتووەتە گێژەنگەوە. گوڵە جۆیەکان لە ژێرپێیدا خشەخشی دەکرد.ماروسکا لەودەمەدا کەلایەکی هەوسارەکەی شل دەکردو بەقاچێکی دەی ژەنیە قەبرغەی میشکاوە, هاواری کرد یخ بە!میشکا کەئامادە نەبوو لەژێر دەست رێژی گوللەدا یخ بێ ,بەدەوری جەستەی پرناڵەی ئەو گەنجەدا کە دەستەسرێکی سپی خوێناوی بە سەرەوە بوو, چەپۆکانی دەکرد. ماروسکا بەدەم راتەکاندنی هەوسارەکەوە لالغاوەی ئەسپەکەی بریندار کردو بەتورەییەوە هاواری کرد:یخ بە!میشکا چۆکە لەرزۆکەکانی دادایە سەر زەوی .لەکاتێکا ماروسکا گەنجە بریندارەکەی بەسەر عاردیدا بکێش دەکرد, گەنجەکە نالاْندی:سوتام ....سوتام ...گەرچی جۆگەلەی خوێن لەسەر روومەتی رێچکەی بەستبوو ، بەڵام دەموچاوی ساف ، بێ موو، پاك و سپی بوو .



ماروسكا بە ئاسپایی گوتی : كڕیە لەش بە دۆشاوی بەناز ! پاش تۆزێك ، لە كاتێكا جلەوەكەی مێشكای بەرەڵلا كردبوو، هەردوو دەستی كردبوو بە چەپەر بۆ بارەكەی ، رووی كردە ئەو گردەی كە بارەگای لقەكەی لفنسونی لێ بوو، بەچوار ناڵە لە گردەكە دوور كەوتەوە .

-2-

## متچێك

بەراستی ماروسكا خۆشی بەو گەنجەدا نەدەهات كە رزگاری كردبوو. ماروسكا پیاوی بەنازو ناسكی خۆش نەدەویست. بە پیاوی بێ كەڵك و بێ نرخ و بێ باری دەزانین . وێڕای ئەمانەش گەنجە بریندارەكە هەر لە یەكەم ساتەوە بێ ورەیی وكەم زاتییەكی زۆری نیشان دابوو . وەختێ كە گەنجە بێ هۆشەكەیان لە كۆختەكەی ریاپیتسر دا لەسەرتەختێك رادەكێشا ماروسكا لە ژێر لێوەوە بۆلاندی : حیزەڵەی ژن سیفەت ! بەو برینە سوكە بورایەوە ، دەیویست تانەوتوانجی چزوداریێ لێ بدا ، بەلام نەیدەتوانی، بەپەستی یەوە كەوتە بۆڵەبۆڵ : چلمن ، وەكوو هەموو ئەوانەی دیكە ...

لڤنسون بەرەقی قسەكەی بڕی و وتی : دە بەسە ئیتر ، چەنەبازی مەكە ! باكلانوف خێراكە ئەم كوڕە بەرە بۆ نەخۆشخانە ، زووكە دنیا خەریكە تاریك دەبێ .

زامەكانی بریندارەكە دەرمان كران ، لە گیرفانی تەنیشتی چاكەتەكەیدا هەندێ پارە ، ناسنامەیەك بە نێوی (پاڤل متچیك) ، دەستەیەك نامە و وێنەی كێژێكی جاحێلیان دۆزییەوە .

نزیكەی "20" كەسێك بە روخساری لێل، توكن، رەش و تا وەسووتەوە ، بە ریز وێنەكەیان وەرگرت و بە وردی كەوتنە سەرنجدانی روخساری نەجیب و پەرچەمی جوان و زولفی كیژەكە پاشان بە بێدەنگی یەكی سامناكەوە وێنەكەیان گەڕاندەوە شوێنی خۆی . كوڕە گەنجەكە بورابووەوە . لێوەكانی بێ جوڵەو بێ رەنگ بوو . دەستەكانی بەسستی و بە خاوی كەوتبوونە سەر پەتۆكە .

گەنجەكە هەستی بەوە نەكرد كە بەو بولێلی ئێوارە گەرمە بەگالیسكەیە كی شەق و شرِلە گوندەكە برد یانە دەرێ. كەخستیانە دەستە بەرەوەئەمجا بەهۆش هاتەوە.لەئەنجامی هەڵ تەك وداتەكی بێ وچانوئارامی دەستەبەرەكەوە ولەژێر ئاسمانی پرئەستێرەی بەر دیدەكانیدا ,شەپۆلە هەستیكی ئالۆزو تاریكی چەشنی هەستەكانی خۆ لادروست بوو,تێكرا تێكەڵ بەیەكدی بوون .تاریكی چەشنی باڵندەیەكی رەش لە هەموو لایەكەوە بەرەو زەوی دادەكشا.بۆنی كەسكوون و ناخۆشی گەلای دەرزی ئاسای درەختی كاژ وپەلكی رزیو كە دەتووت لەنێومەیدا خوسێنراوە ,كەپووی پرٍ دەكرد .



هەستی پێ زانین بەرانبەر بەوپیاوانەی کە بەو جۆرە هێواش وهێدی هەڵیان دەگرت لەدەروونیا جۆشی سەند .پڕبەدڵ حەزی دەکرد لەگەڵیاندا بدوێ. لێوەکانی جولاند. بەلام هەمدیس لەخۆی چوو و فریا نەکەوت تاقە وشەیەك بدرکێنێ.

کەئەمجارە هاتەوەهۆش رۆژ بوو بووەوە .هەتاوی شادی بەخش بەسەر لق وپۆپی دار سەروودا پەخش دەبووەوە. متچیك لەسەر تەختێك, لەژێر ساباتەکەدا راکشابوو. پیاوێکی بالا بەرز بە بەروانکەی خەستەخانەوە لەلای راستی یەوە وەستا بوو. سیمایەکی ژنانەی کپ وئارام لەلای چەپی یەوە بەسەریا دانەوی بووەوە.سەرنجی لەسەر قەفی پرچە هۆنراوە زێڕینەکەی کە بەسەر شان وملیا هاتبووە خوارێ, گیرسایەوە. هەستێکی خۆشەویستی ئامێزو دڵسوزانەی بێ پایان ودوور لەهەر مەبەستێکی دیار,متچیکی بزواند- واتە هەستێك کە سەرچاوەکەی سیمای ئارام, چاوانی درشت وخۆمار ,قەفی پرچی نەرم ودەستی گەرم وگەنم رەنگی ژنەکە بوو-

متچیك بە ئاسپایی پرسی :ئێرە کوێیە؟

پیاوە بالا بەرزەکە بەئەسپایی دەستە لاوازەکەی گرت ونەبزی گرت. بە ئاسپایی وتی:بەسە ,ڤاریا هەموو کەرەستەکانی تیمارکردن ئامادە بکە ,خارنچکوش گازبکە ...ماوەیەك بێدەنگ بوو, دیسان وتی:...هەروا..متچیك بەزەحمت چاوی هەڵیناو لەخاوەن قسەکە راما.دەموچاوی درێژکۆلەو زەرد بوو. چاوەکانی جوان وبەقوولا چوو بوون .ئەم چاوانە راستەوخۆ دەیانڕوانییە متچیك . چاوێکیان بەشێوەیەکی پێکەنین هێنەرو چاوەڕوان نەکراو دەتروکا .

کەپارچە سارغی یە زبرەکانیان دەخستە نێو زامە برژێنراوەکانیەوە ,هەستی بەئازارێکی زۆرکرد . بەلام چ ئاخ و ئوفێکی نەکرد .سوکنایی دڵی خۆی بە نەوازشی ئارامی دەستی ژنەکە دەدایەوە

.

وەختێ پیاوە کەڵەگەتەکە خەریك بوو لەتیمارکردنی دەبووەوە ,بەدەم کارکردنەوە وتی :زۆر چاکە ,سێ شەبەقی گەورە وسووکە زامێك بەسەرییەوەیە .دەبێ هەر هەمووی لەماوەی مانگێکدا چاك ببنەوەو, دەنا نێوم ستاشینسکی نییە .کەمێ گورج تر بوو, پەنجەکانی خێراتر کەوتنە جوڵە .بەلام هێشتا هەمان تیشکی خەمناك بەچاوەکانی یەوە دیاربوو. چاوی راستی هەر لەخوڕا دەتروکا.

دەست ودەموچاوی متچیك ))یان شۆرد. کەکارەکەیان تەواو بوو, متچیك خۆی خستە سەر ئانیشکەکانی وروانییە دەورەبەر.تاقمێك لەدەوروبەری کەپرەکان هەراوهوریایان بوو. تۆپەڵە دووکەڵی چڕو شین باو لەدووکەڵ کێشەکانەوە دەهاتە دەرێ. دارە شۆکە کرتووەکانی کەپرەکان خۆری بەرەو خۆرادەکێشا .دارکون کەرەیەکی گەورە لەخوار دارستانەکەوە پەیتا پەیتا تەقەتەتەقی دەکرد.پیرەمێردێکی مەند,بەردێنێکی جوانەوە,بەبەرهەڵبێنەی خەستەخانەوە,قورسایی خۆی دابوو بەسەر دارعاسایەکاو بەچاوانی پڕ لەخۆشەویستی یەوە دەیڕوانییە ئەو دەوروبەرە.

کپی وبێدەنگی دارستانەکە باڵی بەسەرپیرەمێردەکەو کەپرەکان و جێگاکەی متچیك داکێشابوو.نزیکەی سێ هەفتە بەر لەئێستا, وەختێ متچیك کارتی ماموریەتی لە پێڵاوەکەی



داشـاردبووەوە,دەمانچـەکەی لـەگیرفانیا بـوو, لەشـاردەهاتە دەرێ وتـەنیا وێنەیـەکی ئـاڵۆزی دەربارەی هەموو ئەو رووداوانە لە زەینـی خـۆی دا دروست کرد بـوو, بەسـادەیی یـەوە ئاوازێکی گەرمی شاری بەفیکە لێدەداو خوێن لەدەمارەکانیا دەجۆشا, شەیدای کارو کوشش بوو.

هەرچەندە متچیك ئەو خەڵکەی کە لەگردۆولکە بورکانیەکاندا دەژیان, تـەنیا لـەرێگای چاپەمەنی یـەوە دەناسـی,بـەڵام وەك خـەڵکانێکی قارەمـان و لـە دووکـەڵ وباروتداغـەرق بـوو, لەبەرچـاوی بەرجەستە دەبوون.

تێکراٍی رامان و ورد بوونەوەو بەرزەفڕیو بیرەوەرییو یادی شیرین وسازگاری ئەو کیژە مەکتەبلی یە پەرچەم جووانەی لەبەرچاوزیندوو بوو بووەوە کەبەیانی قاوەو پسکیتەکەی دەخوارد و پاشان کتێبە شین باوەکانی دەخستە بن هەنگڵی وبە پەلە بۆ قوتابخانە دەچوو.

وەختـێ لـەکریلوفکا نزیـك دەبـووەوە ,پیـاوانی چـەکدار کـە تفەنگـە (بـرادن)ەکانیـان ئامـادە بەدەسـتەوە بـوو,لـەنێو دەوەنەکانـەوە هاتنـە دەرێ. یـەکێکیان دەموچـاوی سـێ گوشـەیی بوو,کلاَوێکی سوپایی لەسەر بوو,پرسی:کێی؟

ـ منم...لەشارەوە ناردوومیان...

ـ وەرەقەت پێیە؟

میتچیك دەبووایە بۆ دەرهێنانی وەرەقەکەی پێڵاوەکەی دابکەنێ.

((کۆمیتەی ناوچە. ی ...دەریا ـ یی ...شۆڕـ ش ـ گێڕانی ...سوسیالیست.))

دەریاوانەکـە بەحونجـە نامەکـەی خوێنـدەوەو مۆڕەیـەکی لەمتچـیك کـرد.لـە کاتێکـا وشـەکانی بەنامەفهومی دەدرکاند وتی:بـ ـ لـ ـ ێ ـ ئاو ـ ها.

کوت وبڕ خوێن زایی یە دەموچاوییو یەخەی چاکەتەکەی متچیکی گرت و نەڕاندی: چۆن,قەحپە ـ داك !...

متچیك شڵەژاو کەوتە منجەمنج: چی؟ چی؟ خۆ نامەکە هی ماگزیمالیستە. بیخوێنەوە هاوڕێ

– بی پشکتن!

پاش کەمێك ,هیلاك وماندوو بەچەك کراوی بەرەو لای پیاوێکی کلاَوقووچ دەڵەکیان دا .نیگـای چاوە رەشـەکانی ئـەم پیـاوە سـەراپای متچیکی گـەرم راهێنـا. متچیك بـەدەم هەنسـك هەڵدانو گریانـەوە کەوتـە دەمـەلاَڵکێ: ئەمانـە حـاڵی نـەبوون...لەنامەکـەدا نووسـرا بـوو ـــ هـی ماگزیمالیستەکانە...

ــ کوا وەرەقەکەیم بدەنێ!

کـابرای کلاَوقـووچ چـاوی بڕییـە کاغەزەکـە.کاغـەزە لـۆچ بووەکـە بەراسـتی لـەژێرنیگا ئـاگراوی یەکەیدا دووکەڵی دەکرد.ئەوجا رووی کردە دەریاوانەکەو بەگرژییەوە وتی :ئەحمەق !نابینی هـی ماگزیمالیستەکانە! متچیك هەناسەی خۆشحاڵی هەڵکێشاو گوتی: ئـەها، فـەرموو! بـەخۆم پـێم گوتیت هی ماگزیمالیستەکانە! ئەمجار مەسەلەکە دەگۆڕێ, نا؟

دەریاوانەکە بە نائومێدییەوە گوتی: گاڵتە بازاڕەکە، کەواتـە ئـەو هـەموو زەحمەتـەمان بـەخۆڕایی چوو.



ئیدی متچیك لەو رۆژەوە مافی تەواوی هەر ئەندامێکی دیکەی لقەکەی درایێ. دەوروبەرەکەی بەهیچ کلۆجێ لەو خەڵکانە نەدەچوون کەلە خەیاڵی گەرم وپڕ جۆشی خۆیدا دروستی کردبوو.ئەمانە خەڵقەندەی چەپەڵتر نەگریستر, سادەترن بوو. فیشەکی یەکدیان دەدزی.لەسەر بچوکترین شت بەشەڕ دەهاتن .لەسەرپلە گۆشتێ بەگژ یەکد یدا دەچون لەسەر بچوکترین شت بیانوویان بەم دەگرت وجنێویان پێ دەدا:لەسەر چاکەتە شاری‌یەکەی, لەسەر ئەوەی بەدروستی قسەی دەکرد ,لەسەر ئەوەی نەیدەزانی چۆن تفەنگەکەی پاك بکاتەوە. تەنانەت لەسەر کەم خۆریش گاڵتەیان پێ دەکرد. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا گەرچی ئەمانە ئەو خەڵکە نەبوون کە متچیك لەکتێبان دا شتی لەسەر خوێندبونەوە, بەڵام خەڵکانێکی راستەقینەو زیند ووبوون.

ئەوەتا هەرکە لەم شوێنە سەوزو هێمنەی دارستانەکەدا ئیسراحەتی کرد, دووبارە کەوتەوە نێو کتێبان. ئێستا داخی بۆئەوە دەخواردکە بەو هەستە سادەو لەهەمان کاتدا راستگۆیەوە پێوەندی بەلقەکەوە کردبوو. متچیك داخ وکەسەرێکی تایبەتی بەرانبەر بەتەنگەوەهاتن وخۆشەویستی ئەوان وبەرانبەر بەبێدەنگی دارستانەکە نیشان دەدا.

خەستەخانەکە کەوتبووە سەرخاڵی یەکانگیربوونی دوو چۆمەوە. دارکۆنکەرەیەك بەردەوام لەخوار دارستانەکەوە تەقەتەقی بوو ، رەشە درەختی ئەفرا کە ئەرخەوانی دەینواند، سەریان کردبوو بەیەکاو رازو نیازیان دەکرد ، لەخوارترەوەو لەپاڵ شیوەکەدا ، چۆمەکان بەئاوازی خوڕەی بێ کۆتایی گیاکانی دەوروبەری خۆیان دەلاواندەوە، نەخۆش و برینداری کەم لە نەخۆشخانەکەدا بوون تەنیا برینی دوانیان خەتەر بوو یەکێکیان پارتیزانێکی ساچانی بوو بە نێوی فرولف کە گوللەیەك لەسکیا مابووەوە . ئەوی تریان متچیك بوو .

هەموو رۆژی کەبەیانیان ئەوانیان لەکۆختە تەنگەبەرەکە دەبردە دەرێ، پیکای پیرەمێرد بەرِدێنە جوانەکەیەوە دەچووە کن متچیك . سیمای پیکا ، بیرەوەری وێنەیەکی لەبیرکراوو کۆنی لەمێشکیا زیندو دەکردەوە:

لە سوچی خەڵوەتگایەکی کۆنی قەوزە گرتوو و لە دنیایەکی کپ و بێدەنگدا ، پیرەمێردێکی مەندو نورانی کلاو لەسەر، لە کەنار دەریاچەیەکی سەوزی زمرودی دا دادەنیشت و ماسی دەگرت، ئاسمانی ساف بەسەر سەرییەوە بوو، چوار دەوری بەدرەختی ئارام بەخشی کاژ داپۆشرابوو .

زەل و قامیش سەر دەریاچەکەی داپۆشی بوو، هەموو لایەك کپ و بێدەنگ و خەون و خامۆشی فەرمان رەوا بوو .

ئایا روحی متچیك تاسەو ئەڵهای ئەو چەشنە خەونەی دەکرد؟ پیکا وەکو شەماسە بە زمانێکی سادەو رەوان باسی کورەکەی خۆی بۆ متچیك دەکرد، کوڕەکەی یەکێك بوو لە ئەندامانی کۆنی گاردی سوور: بەڵێ، من لە نێو باخی هەنگەکەمدا نیشتەجێ بووم، ئەوسا دەهاتە کنم... ئاخر ئیدی لەکوێ دانیشم؟ ... لە مێژە یەکدیمان نەبینیوە هەڵبەتە یەکدیمان ماچ دەکرد، بەڵام سەیرم دەکرد بیرێکی لەسەردایەو دەڵێ : (بابەمن دەبێ بچم بۆ شار ، بۆچیتا.) من پێ ی دەڵێم بۆچی ئەو دەڵێ (ئیدی باوکە ژمارەیەك چیکوسلوفاکی مەلعوون لەوێ پەیدا بوون .) من پێ ی دەلێم کە



چیكوسلوفاكی چی پێوەندیەكیان بەتۆوە هەیە؟ پێی دەڵێم تۆ لێرە وەمێنەو بزانە چ ژیانێكی باش چاوەڕێتە. بەڕاستی باخی مێشەكەم وەكو بەهەشتی سەررووی زەمینە . درەختە زەلامەكانی تێ دەگەی درەختی لیمۆ ترشە پڕ شكۆفەكانی و ئەو مێشە چكولانانەم كە بێ وچان خەریكی ویزەویزن .

پیكا بە خۆشحاڵییەوە كڵاوە رەشە نەرمەكەی دەحوڵێنێ (لات وایە چ بوو؟ ئەو نەمایەوە ! رۆیی و ئیدی چ هەواڵێكی نەبوو، كلچاكەكان باخەكەمیان داغان كرد. كوڕەكەشم بۆنەما ئاخر ئەمە چ ژیانێكە ! )

متچیك بەتاسەوە گوێی بۆ پیكا رادەدێرا . حەرەكەی هێمن و دەنگی ساف و زوڵاڵی پیكای خۆش دەویست و وای هەست دەكرد لە ناخی روحییەوە هەڵدەقوڵێ .

پیكا هێشتا حەزی دەكرد پەرستارەكە روو بداتە ئەو. ڤاریا بە خۆی پینەو بەڕۆو جل شتنی نەخۆشەكانی ئەنجام دەدا ، كە مرۆڤ ڤاریای دەدیت هەستی بەعەشق و خۆشەویستییەكی بێ سنوور دەكرد، ڤاریا زیاد لە پێویست بەتەنگی متچیكەوە دەهات و خۆی لێ هەڵدەسوو متچیكیش كە وردە وردە بەرەو چاك بوونەوە دەچوو لە لای خۆیەوە بە چاوی نەوسنەوە دەیڕوانی یە پەرستارەكە . پشتی ڤاریا بە ئاستەم چەمی بووەوە نەختێك بێ رەنگ بوو، دەستەكانی بۆ ئافرەت كەمێ گەورە بوون، ڤاریا بەغرور و هەنگاوی پتەوەوە ڕێ ی دەكرد، لەپشت پەردەی ئاوازی قسەكانیەوە شتێ خۆی مەڵاس دابوو ، وات هەست دەكرد هەمیشە وادەی شتێكی دەدا .

كە لەسەرتەختەكەو لەتەنیشت متچێكەوە دادەنیشت متچیك بەجارێ ئۆقرەی لێ دەبڕا ، متچیك هیچ كاتێ ئەم چەشنە هەستەی دەرهەق بە كچە پەرچەم جوانەكە نەكردبوو .

جارێك پیكا گوتی : نێوی ڤاریایە ، ئافرەتێكی سووكە ، مێردەكەی نێوی ماروسكایەو لەهێزە . ئەمیش لێرە دەژی، ژنێكی زۆر بێ حەیایە .

متچیك سەیری ئەو شوێنەی كرد كە پیكا بەچاو ئیشارەتی بۆ دەكرد . پەرستارەكە لە شوێنێكی رووتەنی دارستاكەدا جلی دەشت. خارچنكوی پزیشكیار لە دەوروپشتیا پیاسەی دەكرد، ناوبە ناو بەرەو رووی دادەنەوییەوەو ئیشارەتێكی بۆ دەكرد. ڤاریاش كە كارەكەی خۆی فەرامۆش كردبوو بە چاوانی تەماوییەوە سەیری دەكرد، وشەی (سووك) متچێكی بە تەواوی خستە سەر سیك و سەودا. لە كاتێكا هەوڵی دەدا هەڵچونەكەی وەشێری ، لە پیكای پرسی : ئاخر بۆچی ..... وایە ..... وایە ؟

خوا دەزانێ بۆ ئەوەندە بە ئاڵۆشە . ماڵوێرانە وشەی "نە" ی لای نیە. متچیك یەكەم بیرەوەری خۆی دەربارەی پەرستارەكە وە بیرهێنایەوەو قینێكی سەیر لە دەروونیا جۆشی سەند، لەو ساتە بە دواوە بە ووردی ولە نزیكەوە كەوتە تاقیب كردنی، دەیبینی زۆربەی كات لەگەڵ پیاواندایە ، جا هەر پیاوێ بێ كە لە پیاوەتی نەكەوتبێ ، بەهەرحاڵ ڤاریا تاقە ژن بوو كە لە نەخۆشخانەكەدا كاری دەكرد .



ڤاریا بەرەبەیانێك پاش تیمارکردنی متچیك کەوتە ڕێکخستنی تەختەکەی. متچیك سوور هەڵگەراو بەشەرمەوە پێی گوت : تۆزێ لام دانیشە .

ڤاریا بەنیگایەکی قووڵی پرسیار ئامێزەوەلێی ڕاما. هەمان نیگای ڕۆژی جل شتنەکە بوو کە دەی بڕیە خارچنکۆ . ڤاریا بەسەرسامی و بێ ئیختیار پرسی : تۆش ....

بەهەرحاڵ پاش ئەوەی جێگاکەی ڕێکخست، لە پاڵیا دانیشت . متچیك لێی پرسی : خارچنکوت خۆش دەوێ ؟

ڤاریا وەکو ئەوەی قسەکانی ئەوی هەر نەژنەوتبێ لەکاتێکا گرفتاری چاوە درشت و خومارەکانی خۆی کردبوو وەڵامی حەزەکانی ناو مێشکی خۆی دایەوە : زۆر گەنجە ، زۆر. پاشان هاتەوە سەرخۆ ووتی : خارچنکۆ ؟ پیاوێکی چاکە ئێوەی پیاو هەمووتان هەروەکوو یەکن .

متچیك دەستی بردو بەستەیەکی بچوکی لە ژێر سەرینەکە دەرهێنا. سیمای ئاشنای کیژێك لە ناخی وێنە ڕەنگ کاڵ بووەکەوە تەماشای ئەوی دەکرد. ئەمجارە وەکو جاران بەلایەوە دڵڕفێن نەبوو. سیمای سەیرو پڕ جۆش و خرۆش دەستکردو ساختە دەینواند ، گەرچی متچیك لە دڵی خۆیدا نیگەرانی ئەوەبووکە جاران نەیدەزانی بۆ ئەوەندە بیری لەو کردووەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە نەی دەزانی بۆ بەو چەشنە گیرۆدەی بووبوو ، ئاخۆ ئەو کارەی دروست بووە یان نا ، وێنەکەی دایە دەستی ڤاریا .

پەرستارەکە وێنەکەی وەرگرت و یەکەم جار لە نزیکەوە و پاشان لە دوورەوە تەماشای کرد ، لە پڕ هاواری کردو وێنەکەی دا بە زەویا . لەسەر تەختەکە ڕاپەڕی و مۆڕەیەکی لە متچیك کرد .

دەنگێکی گرو پێکەنیناوی لە پشت دار ئەفراکانەوە بەر گوێ کەوت: قەحپەیەکی خشکۆکە .

متچیك دەست بەجێ ئاوڕی دایەوە و ڕووانی یە سەنتی دەنگەکە. نیگای لەسەر سیمایەکی یەکجار ئاشنا گیرسایەوە کە قژە خورماییەکەی لە ژێر کڵاوەکەیەوە هاتبووە دەرێ . چاوە ڕەشەکانی مایەی پێکەنین بوون. حاڵەتی دەموچاوی گەڵێك لەوە جیاوازتر بوو کە لە هزری متچیك دا بوو. دەنگە گڕەکە بە هێمنی لەسەری ڕۆیی : باشە بۆ ترسایت ؟ خۆ بە تۆم نەبوو. بەم وێنەیەم بوو. لەگەڵ ژنانی زۆردا ڕامبواردووە بەڵام هیچیان هەرگیز وێنەیەکیان نەداوەمەتێ ، ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان وێنەیەکم بدەیتێ .

ڤاریا هاتەوە سەرخۆ و لە قاقای پێکەنینی دا : ترساندمت ! بە دەنگێك ئەمەی گوت کە هەرگیز لە دەنگی خۆی نەدەچوو. بە شێوەی ئافرەتێك کە ڕازو نیاز لەگەڵ مێردی خۆی دا بکات لەسەری ڕۆیی : مەیموونی توکن ئەوە لە کوێوە وا لە پڕ هەڵتۆقیت ؟ پاشان ڕووی کردە متچیك ووتی : ئەمە ماروسکایە. مێردمە. زۆر قۆشمەیە. زۆر.... ماروسکا بەخاوییەوە گوتی : ئا ، بڕێ یەکدی دەناسین ، تاکیدێکی تایبەتی لەسەر وشەی (بڕێ) کرد.

متچیك کە نەی دەتوانی تاقە وشەیەك بڵێ خەمبارو شەرمەزار وەکو مرۆڤێکی گێژوکاس لە جێگاکەی دا ڕاکشا .

ڤاریا کە ئیدی وێنەکەی فەرامۆش کردبوو ، بەدەم قسەکردنەوە لەگەڵ ماروسکادا پێی خستە سەر وێنەکە و متچیك لەشەرمەزاری دا نەیتوانی تکای لێ بکات کە بیداتەوە .



وەختێ ژن و مێرد کە بەدووقۆڵی بەرەو دارستانەکە چوون متچیك بەلەقە لەق و لە کاتێکا لەتاو ئازاری پێی لێوی دەکرۆشت، وێنە پێشێلکراوەکەی لە عاردەکە هەڵگرتەوەو پارچە پارچەی کرد
.







## هەستی شەشەم

ماروسکا و ڤاریا دەمەو خۆرئاوا ، شەکەست و ماندوو بەدەم دزەنیگاوە لە دارستانەکە گەڕانەوە ، ماروسکا خۆی بە شوێنێکی بەر بەتاك و رووتەنی دارستانەکەدا کرد ، دوو قامکانی خستە دەمی و سێ فیکەی قایمی کێشا. کەئەسپە کوڵکنەکە – بەچەشنی ئەفسانە کۆنەکان – بەتەقەتەقی سمەکانیەوە لە دارستانەکە هاتە دەرێ، متچیك بیری کەوتەوە کە ئەم ئەسپ و ئەسپسوارەی لە کوێ بینیبوو .تەتەرەکە بەسۆزەوە کەوتە لاواندنەوەی ئەسپەکەی: میشکای ئازیز هەی قەحپەداك زۆر ماتڵ بوویت ماتڵ نەبوویت ؟

کە ئەسپ سوارەکە بەتەنیشت متچیك دا رەت بوو، بزەیەکی تاڵی بە روویا دا. پاشان لەو دەمەدا کە بە لاپاڵی دۆڵە سەوزو نزارەکاندا دادەگەڕاو هەڵدەگەڕا ، پتر لەچەن جارێك بیری لە متچیك کردەوە : بۆئەم جۆرە خەڵکانە پەیوەندی بە ئێمەوە دەکەن ؟ بەرقەوە بیری کردەوە : کە ئێمە دەستمان پێکرد کەس دیارنەبوو ، ئێستاش کە کارەکانمان هەموارکردووە هەموو دێن و خۆمان پێوە هەڵدەواسن دەتگوت گوایە متچیك بەراستی چاوەڕێی ئەوە بووە ئەوان (کارەکان هەموار بکەن) ئەوجا پەیوەندیان پێوە بکات . خۆ هەنووکەش هێشتا رێگایەکی درێژو دژواریان لەبەرە . ماروسکا لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: بابایەکی حیزەڵەی ژن سیفەتی وەکو ئەو کابرایە دەێتە ئێرەو بەسووکە برینێك دەبورێتەوەو ئەوجاش دەبێ ئێمە باجەکەی بدەین . ئاخر ئەم ژنە گەوجەی من خۆشی بەچی ئەودا دێ ؟

ماروسکا وای دەهێنایە بەرچاوی خۆی کە ژیان بەردەوام دەئالۆسکێ، ژیانی کۆنی ساچان بەرەو بڕانەوە دەچوو، ئەویش ناچاربوو رێگایەکی تازە بۆ ژیان و گوزەران پەیدابکات. هێندە غەرقی بیری پەریشانی خۆی بوو، ئاگای لێ نەبوو کە گەییوەتە شیوەکە، جووتیاران لە گەرمەی کاری سەختی رۆژانەیان دا بوون، داسەکانیان لە نێو چەودەری چڕو گیای بۆن خۆشدا دەنگی دەدایەوە، ردێنیان بە ئەندازەی چەودەرەکان چڕبوو ، کراسە کوڵەکانیان لە ئارەقدا هەڵکشا بوو، بە ئەژنۆی چەماوو هەنگاوی پتەوەوە دەچوونە پێشێ و گیای تورت و بۆنخۆش بەخشەخش لەبەرپێیاندا دەرژایە سەر زەوی .

هەرکە ئەسپ سوارێکی چەکداریان بینی، بەکاوەخۆ دەستیان لەکار هەڵگرت، دەستە زبرەکانیان کردە سێبەری چاوەکانیان. قەدەرێ لە دوواوە تەماشایان کرد. سوارییەکەیان بەدڵ بوو، کە ماروسکایان بینی لەسەر ئاوزەنگی یەکە وەستا بوو، لەسەر زینەکەوە کەمۆیەك باڵای بۆ پێشەوە بردبوو، چەشنی شو لەی مۆم بێ جوڵە وەستا بوو گوتیان: ئەڵێی چنارە !

ماروسکا لە پشت پێچی چەمەکەوەو لە نزیکی بێستانێکدا کە بێستانی ریابیتسی کوێخای گوند بوو جڵەوی ئەسپەکەی گرت ، بێستانەکە لە بێستانی کەوتبوو. کاتێ جوتیار دەچووە کاری



هەرەوەزی ئیدی مەزراکەی لە پوش و گیادا وێران دەبوو، زنجی باووباپیرانی دادەڕوخا، گوندۆرەی گەورە و بۆنخۆش لە نێو گیاو پۆنگەی بۆنخۆشدا بەکاوەخۆ دەگەیین. داهۆڵی نێو کێڵگەو مەزراکان لە باڵندەی مردارەوە بوو دەچوون .

ماروسکا دز ئاسا کەوتە سەرنج دان و تاقیب کردنی دەروبەری خۆی . ئەوجا ئەسپەکەی بەرەو زنجێکی وێران ئاژووت، بۆدڵنیایی سەرێکی کێشایە نێو زنجەکە، کەویلەکە چۆل بوو. کۆنە داسێکی ژەنگاوی و هەندێ توێکڵی سیسەوەبووی کاڵەك و ئاروو لە نێو کەوێلەکەدا کەوتبوون. ماروسکا خورجەکەی لە پاشکۆی ئەسپەکە داگرت ، خۆی هەڵدایە خواریٔ و بەسکەخشکێ خۆی خزاندە نێو بێستانەکەوە، بەپەلەپەل کاڵەکی لە برگەکان دەکردەوەو دەیتەپاندە نێو خورجەکەوە. هەندێ جار بەپەلە کاڵەکێکی بە ئەژنۆی دا دەکێشاو بەتاسووقەوە قووتی دەدا .

میشگا بەدەم کلك بادانەوەو بە نیگای وریاکردنەوەوە سەیری خاوەنەکەی دەکرد، لە پڕەنگێکی غەریبی ژنەوت، گوێچکە کۆلکنەکانی قوت کردەوە، بەپەلە کەللە کوڵکنەکەی بەرەو چۆمەکە وەرگێڕا . پیرەمێردێکی ردێن درێژی دەموچاو رەقەلەکە پانتۆلێکی میلداری لە پێ بوو ، سەرکلاوێکی لبادی قاوەیی لەسەربوو ، لەنێو دارستانە چڕەکەوە هات و گەیشتە قەراغ چۆمەکە. تۆڕێکی بەدەستەوە بوو. ماسیەکی گەورە لە نێو تۆڕەکەدا گیانەلای بوو. خوێنێکی ساردو گەش لە پانتۆڵە موقەلەمەکەیەوە دەچۆڕاو جوگەلەیەکی سووری لەسەر دەبەست .

میشکا هەیکەلی زەلامی ریابیستی ناسییەوە ، چونکە ریابیتس خاوەنی ماینێکی کەحێلی کەفەڵ پڕبوو ، ماینێك کە رۆژگاریٔ لە نزیکی میشکاوەو لە نێو یەك تەویلەدا کە تەنیا چەپەرێکیان لە نێوان بوو، ژیابوو. ماینێ کە بەعەزرەتی میشکاوە بوو. میشکا سەری هەڵبڕی . وەك یەکێك سەلام بکا گوێچکەکانی قوت کردەوە. بە کەیفەکەرانەوە حیلاندی .

ماروسکا خورجەکەی بەهەردوو دەست گرتبوو . بە ترسەوە لە جێی خۆی راپەڕی .

ریابیتس بەدەنگێکی نیگەران و لەرزۆکەوە پرسی : ئەوەچ دەکەی لەویٰ ؟ چاوە رقن و سەرزەنشت ئامێزەکانی بڕی یە ماروسکا. ریابیتس هێشتا تۆرەکەی بە دەستەوە بوو، تۆرەکە بەجۆرێکی سامناك دەجولاٰ . ماسییەکە لەناو تۆڕەکەداو لەپاڵ قاچی ریابیتسەوە هەڵدەپلاٰ .

دەتووت دڵە پڕ ئاشووبەکەی خۆیەتی و لە ئەنجامی وشە رقگرتووەکانیەو هاتبووە گوڵ و جۆش ماروسکا ملی لە نێو شانەکانیا خوس کرد. خۆرجەکەی بەجیٰ هێشت و بەرەو ئەسپەکەی غاری دا . کە سوار بوو ئەمجا بیری کەوتەوە دەبووا گوندۆرەکان هەڵرێژیٔ و خورجەکە لەگەڵ خۆیدا بینیٔ ، تا چ بەڵگەیەکی لە شوێن بەجیٔ نەمینیٔ . بەڵام کەزانی تازە درەنگە و کار لە کارترازاوە پاژنەکانی بەقەبرغەی ئەسپەکەدا ژەند و وەکو باوبۆران بۆی دەرچوو، بێستانەکەی بەجێهێشت .

ریابیتس لە دوواوە هاواری دەکرد: سەبرکە ! دەبیٔ وەلاٰم بدەیتەوە ! دەبیٔ وەلاٰم بدەیتەوە !

لە کاتێکا تاکیدی لەسەر دوو وشە دەکرد، هێشتا باوەری نەدەکرد کە ئەو پیاوە پیاوێکە وەکو کوری خۆی بەمانگ نانی دا بوویێ و جلی بۆ کردبوو، بێت کاڵەکیان لیٰ بدزیٰ ، ئەویش لە کاتێکا کەجووتیاران سەرگەرمی کاری هەرەوزین و مەزراو بێستانەکانیان لەگیاوپۆشدا وێران بووە .



لڤنسون لە سێبەری باخە چکۆلەکەی ریابیتس دا کەونە نەخشەیەکی لەسەر مێزێك والآ کردبووەوە و هەواڵ و دەنگوباسی لە دەوریەك دەپرسی کە تازە لەماموریەت گەڕابووەوە .
دەورێیەکە پاڵتۆیەکی لۆکەی دێهاتی لەبەربوو جووتێ پێلاوی کەتان ئاسای لە پێدا بوو. دزەی کردبووە ناوهێزی ژاپۆنەکانەوە. دەموچاوی خڕو تاوەسووت بوو گۆناکانی وەکوو یەکێك کە لە مەترسیەکی گەورە رزگاری بووبێ لە خۆشیاندا سوورهەڵگەرا بوو. بەپێی قسەی دەروێیەکە ئۆردوگای سەرەکی هێزەکانی ژاپۆن لە یاکوفلنکادا جێگیرببوو . دوو لق لە سپاسك . پریمور سکەوە بەرەو — ساندا گوا حەرەکەتیان کردبوو .قوتە بەرزەکەی سوپاگینو چۆك کرابوو. بۆیە دەورێ یەکە لەگەڵ دوو پارتیزانی چەکداری لقەکەی شالدیبادا بە قیتار خۆیان گەیاند بووە سەرچاوەکانی شابونوفسکی .

– شالدیبا بۆ کوێ پاشەکشێ ی کردووە ؟

– بەرەو مەزرای کۆریایی یەکان .

دەوری یەکە هەوڵی دەدا جێی مەزراکان لەسەرنەخشەکە دیاری بکا. بەڵام دیاری کردنی شوێنی مەزراکان بۆ ئەو ئاسان نەبوو، چونکە نەشی دەویست خۆی بشکێنێتەوەو بە زەلامێکی بێ توانا بناسرێ ، هەر لە خۆوە پەنجەی بەسەرخاڵی جیاوازی نەخشەکەدا دەگێڕا. بەبێ تاقەتییەوە کەوتە منجەمنج: لە کریلوفکادا پیس شکان. تائێستا نیوەی زەلامەکانی گەڕاونەتەوە بۆ دێهاتەکانی خۆیان. شالدیباش هەموو زستانەکەی لە مەزرایەکی کۆریاییەکاندا گوزەراندووە. خواردنیشی "چامی زای "رووت بووە، ئەڵێن یەکجار زۆر دەخواتەوە. بەتەواوی ئەقڵی لە دەست داوە.

لڤنسون رۆژی پێشوو هەندێ مەعلوماتی لەلایەن ستیرك شای قاچاغچی مەشروب و چەند زەلامێکی دییەوە کە خۆی بۆ ئەو مەبەستە ناردبونی بۆ شار، بۆ هاتبوو. کە هەواڵە تازەکانی لەگەڵ ئەو معلوماتە بەراوورد دەکرد، هەندێ لە هەواڵە تازەکان لە درۆ دەچوون، لڤنسون لەم رووەوە کابرایەکی زۆر بەهەست بوو، دەتوانرێ بگوترێ وەك چۆن شەمشەمەکوێرە لە تاریکی دا بەهەستە ئەویش هەمان هەستی شەشەمی هەبوو .

چەند خاڵێك هەبوون کە مایەی گومان بوون، هاوکاری ئەو کوێخایەی کە نەی توانی بوو لەماوەی ئەم یەکدوو هەفتەیەدا لە سپاسکویەوە بگەرێتەوە . دانیشتنی هەندێ لە جووتیارانی ساندا گوکە کوت و پڕو دوو سێ رۆژ لەمەوپێش کەوتبوونە بیری ماڵ و ژیانی خۆیان ,لیڤۆ شەلی قاچاغچی کە قەراربوو رێ نوینی لقەکە بکات و بیگەینێتە ئابوورکا، کەچی لەبەرهۆیەکی نادیاربەرەو جۆگەکانی سەرووی چۆمی (نیودزین) گەرابووەوە .

لڤنسون چەند جارێك پرسیارەکانی دووبارە کردنەوەو بە دەم پرسیارکردنەوە سەیری نەخشەکەی دەکرد، کابرایەکی یەکجار بەسەبرو کۆڵنەدەر بوو، لەو پیرە گورگەی جەنگەڵان دەچوو کە سەرەرای لە دەست دانی زۆربەی ددانەکانی هێشتا هەر بە زەبری هێزو جلەوکیشی ئەقڵی پێشینانی خۆیەوە دارو دەستەکەی وا لێ دەکرد پەیرەوی بکەن .

– باشە هەستت بە هیچ بۆنێکی تایبەتی نەکرد؟



دەوریێیەکە بێ ئەوەی لەمەبەستەکەی تێ بگات، گەوجانە تەماشای کرد، لڤنسون وەك بیەوێ بەسەری پەنجە تۆزێ نمەك هەڵگرێ پەنجە کەڵەو پەنجەی شادەی لێك خشاندو لە کەلەپووی دەوریێیەکەی نزیك کردەوەو وتی : بەکەپووت !

دەوریێیەکە وەك یەکێك خەتابار بێ تەماشایەکی کردو وەڵامی دایەوە : نە راستیت دەوێ ، ناتوانم بڵێم هەستم بە هیچ نەکرد، لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: چما من سەگم ، چیم؟ کاس و پەشێو لە پڕ گۆناکانی سوور هەڵگەران، سیمای هێندە گەوجانە دەینواند دەتووت سیمای ژنە ماسی فرۆشەکەی بازاری سانداگویە .

لڤنسون بەدەم دەست جولاندنەوە گوتی : زۆر چاکە ، برۆ.

چاوانی دەوریێیەکە چەشنی دەریاچەیەکی قووڵ شین بوون، بە شێوەیەکی پێکەنین هێنەر نەختێ تیل دەینواند .

کە لڤنسون بەتەنیا مایەوە، بەدەم بیرکردنەوەوە کەوتە پیاسەکردن بە دەوری باخەکەدا، لە پاڵ دارسێوێکدا وەستا ، کەوتە سەرنج دانی قاڵۆچەیەکی کەللە زل کە تۆێکڵی دارەکەی کون دەکرد، پاش بیرکردنەوە گەییە ئەم سەرەنجامەی کە ئەگەر زوو فریانەکەوێ و چارەیەك نەدۆزێتەوە ئەوا ژاپۆنییەکان هەموو هێزەکەی داغان دەکەن، لەبەر دەرگای باخەکەدا توشی ریابیتس و باکلانف ی سەر لق بوو . بکلانوف گەنجێکی "19" ساڵەی رەقەڵە بوو قەمسەڵەیەکی خاکی لەبەربوو. دەمانچەیەکی سمسی بەلاقەدەوە بوو .

باکلانوف چارەی دا بەیەکاو لە کاتێکا گڕی قین لە چاوییەوە دەردەپەڕی لە پڕ لڤنسونی گازکرد : ئاخر ئێمە چی لەم ماروسکایە بکەین، چووتە بێستانەکەی ریابیتسەوەو کاڵەکی دزیوە، تۆ ئەمە نێو دەنێ ی چی ؟ کەمێك دانەوییەوە، دەستی لەلای لڤنسونەوە بەرەو لای ریابیتس درێژکرد وەك ئەوەی بەیەکدیان بناسێنێ، لڤنسون لە مێژ بوو بکالانوفی بەو جۆرە هەڵچوونەوە نەبینی بوو .

لڤنسون بەکاوەخۆ وەڵامی دایەوە: هاوار مەکە ،چ هاوارێکی پێ ناوێ ، ئێستا پێم بڵێ بزانم چی رووی داوە؟ ریابیتس بەدەستی لەرزۆکەوەخورجەکەی ماروسکای خستە بەردەستی لڤنسون: هاورێ فەرماندە باوەڕ بکە نیوەی بێستانەکەمی داوە بەیەکا. ئا ئەمەی کردووە! خۆ دەی بینی، وەختێ چووم سەیری تۆڕەکە بکەم هەرکاتێ دەرفەتم ببێ بەیانیان زوو سەر لە تورەکەم دەدەم ................

کاتێ لە نێو داربیەکانەوە هاتمە دەرێ ....

هەر لەسەری رۆیی و لەسەری رۆیی ، تاکیدی لەسەر ئەو حەقیقەتە دەکرد کە کرێکارێکی وەکو ئەو چویتەکاری هەرەوەزی و بەناچاری وازی لە سەردانی بێستانەکەی هێناوە، دەزانی ژنەکانمان لە بری ئەوەی بڕۆن گیای نێو مەزراکانمان بژاربکەن، وەك چۆن لە هەموو شوێنێکی دی عادەتە کەچی کاری هەرەوەزی مەزرا پشتی هەموویانی شکاندووە .

لڤنسون پاش ئەوەی بە ووردی و هێمنی گوێی لە کەتنەکەی ماروسکا گرت، دەستوری دا بیهێنن.



ماروسكا وەكو هەرزەكارێك كلاوەكەی لار كردبووەوەو هێدی هێدی هات، خۆی لووت بەرزو لاسار دەنواند. هەر كاتێ كەتنێكی بكردایە ئەو حاڵەتەی لەخۆ دەهێنا . دەیكرد بە هەراو هۆریا و درۆ دەلەسەیەك هەر مەپرسە . فەرماندە چاوە تیژەكانی بەسەراپایدا گێڕاو پرسی ئەم خورجە هی تۆیە ؟

– بەڵێ .

– باكلانوف دەمانچەكەی لێ وەرگرە .

– چی ؟ بۆ چەكم دەكەن ؟

ماروسكا خۆی دایە پەنایەك و دەمانچەكەی نەكردەوە .

باكلانوف رووی گرژ كرد و بە توندی هاواری كرد: دەمانچەكەت بكەوە! هەركە دەمانچەكەیان لە ماروسكا وەرگرت ئیدی كەف و كوڵی لاساریەكەی بەتەواوی نیشتەوە .

– باشە ریابیتس من چەند گوندۆرەم لە بێستانەكەی تۆكردووەتەوە؟ بۆ بە خۆرایی ئەم هەموو هەرایەت ناوەتەوە.؟ بەخوای ئەم شتە نەحلەتیانە ئەوە ناهێنن باس بكرێن ....

ریابیتس بە دەم سەر داخستنەوە پەنجە توزاویەكانی پێ ی دەجولاند. لڤنسون هەرئەو شەوە دەستووری دا شورای گوند پێك پهێندرێ، تا پێكەوە لە كارەكەی ماروسكا بكۆڵنەوەو وتی : با هەموو بزانن و بژنەون كە ماروسكا چی كردووە !

ماروسكا كەوتە پاڕانەوە: (ئوزیب ئابرامیچ) با مەسەلەكە هەر لە نێو هێزەكەدا بمێنێتەوە ، ئیدی بۆ جووتیاران كۆدەكەیتەوە ؟

لڤنسون قسەكانی ماروسكای پشت گوێ خست و رووی كردە ریابیتس و وتی: گوێ بگرە هاوڕێ، دەمویست هەندێ قسەی تایبەتیت لەگەڵدا بكەم ....

قۆڵی كرد بە قۆڵی كوێخادا و بردییە لایەكەوەو داوای لێ كرد لەماوەی دوو رۆژدا نزیكەی "10" پووت نانی وشك ئامادە بكات، هەروەها پێی وت : نابێ كەس بزانێ ئەو نانە بۆچی و بۆ كێ ئامادە دەكرێ...

ماروسكا كە زانی بوونی لەوێدا زیادەیە بەشەرمەزارییەوە بەرەو ئاسایشگاكەی خۆی رۆیی.

كە لڤنسون و باكلانوف بە دوو قۆڵی مانەوە لڤنسون پێی گوت لە سبەینێوە جۆی ئەسپەكان زیاد بكا. هەروەها وتی: بەسەرمەیتەر بڵێ بۆ هەر ئەسپێك سەتلێكی پڕی جۆ دابین بكات .

**تەنیایی**

متچیك هەرکە ماروسکای بینی ئیدی ئەو ئاسودەیی یەی نێو خەستەخانەکەی لەدەستدا ، کە ماروسکا بەتەنیشتیا تێ پەری بە سەرسامی بەخۆی گوت : بۆچی وا بەقێزەوە تەماشام دەکات ؟ راستە لەمەرگ رزگاری کردم بەلاّم ئایا ئەو کارە مافی ئەوەی دەداتێ کە تەوسم پێ بکات؟ خۆ ئەوانی دیش هەمان رەفتارم لەگەڵدا دەکەن ...

لە کاتێکا دەیڕوانییە قامکە بارێك و لاوازبووەکانی و سەیری قاچەکانی دەکرد کە لەژێر پەتۆکەوە بەتەتە هەڵبەسترا بوون هەمان سکالاّی جاران کە هەمیشە لە هەوڵی دامرکاندنەوەی دابوو، بەهێزو گوڕێکی تازەوە لە دەرونیا گڕی سەندەوەو لەتاو ئێش و ئازار دڵی تەنگ بوو .

لەو ساوە کە ئەو دەریاوانە دەموچاو سێ گۆشەیی یە بەڕەقی و بێ نەزاکەتیەوە یەخەی گرتبوو، هەموو ئەوانەی توشی دەبوون لە بری دڵدانەوەو دەست بەسەرا هێنان ، هەمان رەفتاری تەوس ئامێزیان لەگەڵ دا دەکرد کەسیان نەیان دەویست لە خەمەکانی تێ بگەن، تەنانەت کارگێڕانی خەستەخانەکەش کە کپی و بێدەنگی دارستانەکە گیانی شادی بە بەردا دەکرد، تەنیا لە رووی ئەرکەوە لەگەڵیا میهرەبان بوون، لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا پاش ئەو هەموو خوێن لەبەر رۆیشتنەی هەستی بەتەنیایی یەکی کوشندە دەکرد.

حەزی دەکرد لەگەڵ پیکادا بدوێ ، کەچی پیکاش چەرچەفەکەی لەژێر درەختێکی کەنار دارستانەکەدا راخستبوو و کلاّوە نەرمەکەی نابووە ژێرسەری و بەبێ خەمی لێی نوستبوو، هەندێ مووی زیوینی بریقەدار وەکو خەرمانە دەوری سەرە رووتاوەکەیان دابوو. دوو کوریژگە . یەکێکیان باسکی پێچرا بوو، ئەوی تریان دەلەنگی . لە دارستانەکەوە هاتنە دەرێ. لەتەنیشت پیرەمێردەکەدا وێستان . چاویان لێکدی داگرت، کوڕێژگە شەلەکە پوشێکی هەڵگرت و بروکانی هەڵبڕی و لووتی خۆی گرژ کردەوەو پوشەکەی بە کوونی لووتی پیکادا کرد، پیکا بەدەم خەوەوە منگەمنگێکی کرد، لووتی گرژکردەوە ، دەستی راتەکاند و بەقایمی پژمی. کوڕیژگەکان بە پێکەنینەوە و بەماتەمات وەکو هەر منالێکی بزێو بەدەم تەماشاکردنی پیکاوە بەرەو زنجەکە رایان کرد، : یەکێکیان لەبەر باسکی بە وریایی یەوە دەرۆیشت ، ئەوی تریشیان وەکو خەتابارێك دەلەنگی، یەکەمیان کە گەیبە بەرزنجەکەو خارچنکوی لەسەر تەختەکەو لەپاڵ ڤاریادا بینی هاواری کرد: ئەهای گۆڕهەڵکەنە ! لەتەنیشت پەرستارە کەوە دانیشت و بەدەستە ساغەکەی ڤاریای راکێشایە نێو باوەشی خۆیو بەم چەشنە لەسەری رۆیی : ئێستا نۆرەی منە ، با بزانم چ بە دەنێکی نەرم و شلت هەیە ، خۆشمان دەوێ، ئێمە



هەر تۆمان هەیە، ئەو گۆڕهەڵکەنەیە ترۆ بکە با بەو دەمو فلقە وشك و چەپەلەیەوە بچێتە ناو ....

دایکی هەر بەو دەستەی کە ڤاریای پێ لەباوەش گرتبوو هەوڵی دەدا خارچنکو دووربخاتەوە . خارچنکوش لەولاوە خۆی بە ڤاریاوە قەرساند بووو رکەبەری لەگەڵ کوڕیژگەکەدا دەکرد و بەدەم پێکەنینەوە ددانە بەجگەرە رەش و پیسەکانی بەدیارکەوت .
کوڕیژگەشەلەکە منگە منگێکی کرد: ئەدی تەگبیری منی چکۆڵەی بەستەزمان چیە؟ لەم دنیایەدا نە ڕاستی ماوە نەعەداڵەت . کێ مشوری بابایەکی زامداری وەکوو من دەخوا ، ئاخر چ بە هاوڕێ ئازیزەکانی شار دەڵێ ی ؟ بەدەم ئەو قسانەوە بە جۆرێکی سەیر دەستەکانی رادەتەکاند و برژانگە خوساوەکانی پێکا دەدا . هاوەڵەکەی شاپێکی لێ داو دووری خستەوە . خارچنکۆ قاقا پێکەنی و دەستی کرد بە ژێر بلووزەکەی ڤاریادا . ڤاریا بێ هیچ کاردانەوەیەك بە نیگای شەکەت و بێ قەرارەوە دەیڕوانی یە هەرسێکیان . ڤاریا هەرکە لە پڕ چاوی بە نیگای حەپەساوی متچیك کەوت ، لە جێ ی خۆی راپەڕی و جلەکانی رێك خستەوەو چەشنی گوڵاڵە سوورە سوور هەڵگەرا. ڤاریا وەکو شێت هاواری کرد: خەڵکانی هەوەسباز دەڵێ ی مێشن و بە دەوروخولی هەنگوینا دەسووڕێنەوە ! سەری داخست و بەرەو زنجەکە دایکێشا . داوێنی کراسەکەی لە دەرگاکە گیربوو ، بە توندی و بەرقەوە بە دووای خۆیدا رایکێشا . ئەوجا دەرگاکەی هێندە بە توندی پێوەدا کە تەپ و تۆزی درزی دیوارەکان وەری یە سەر زەوی .
کوڕە شەلەکە هاواری کرد: چما پەرستارەکە هی ئەنگۆیە! ئەمجا وەکو یەکێك برنوتی هەڵمژێ ، چارەی خۆی گرژ کرد و بەشێوەیەکی بێ لەزەت پێکەنی .
فرولوفی پارتیزانی بریندار لە ژێردار ئەفرایەکدا ، لەسەر جولاّنەیەك لەسەر پشت راکشابوو، لەتاو ئازارو سوێ رەنگی زەرد هەڵگەرابوو، بە درێژایی ئەو ماوەیە بە بێ هیچ مەبەستێك تەماشای دەکردن ، نیگای چەشنی نیگای مردووان ئاڵۆزو بێ رۆشنایی بوو . برینەکانی کاریگەر و کوشندە بوو . کاتێ هەستی بەوە کرد، کە بەدەم ئازاری گەدەوە گینگڵی دەداو بۆ یەکەم جار ئاسمانی بەشێوەیەکی ئاوەژوو هاتە بەرچاو .
متچیك وای دەزای فرولوف سەیری ئەو دەکات ، بۆیە بە بێزاری و نارەحەتییەوە رووی لێ وەرگێڕا .
فرولوف وەك بڵێ ی بیەوێ بۆ هەموو دنیای بسەڵمێنێ کە هێشتا زیندووە ، پەنجەیەکی بزواند و بە دەنگێکی کەرخ گوتی : دیسان دەستیان پێ کردووە ....
گەرچی فرولوف کەم و زۆر مەبەستی متچیك نەبوو، بەڵام متچیك تا ماوەیەك خۆی لە نیگای ئەو دەدزییەوەو وای دەزانی فرولوف بەو دەمو دانە ژەنگاوییەوەی چاوی بریوەتە ئەو .
دکتۆر ستاشینسکی ، بە جۆرێکی نارێك خۆی دانەواند بووەوە تا لە دەرگاکەوە تێ پەڕی . لە زنجەکە هاتە دەرێ ، پشتی راست کردەوە ، قرچەیەکی ناخۆش لە پشتیەوە هات، بە هەنگاوی هەڕاوەوە بەرەو لای ئەوان چوو. چاوێکی بەردەوام دەتروکا . بیری چوبووەوە کە



بۆچی بۆ ئەویٚ چووە ، بەسەرسامی یەوە وەستا ، دەستێکی بەسەرسەرەتاشراوەکەیا هێناو ئەمجا لەبەرخۆیەوە وتی : دنیا گەرمە... دکتۆر بەو نیازەوە هاتبووە دەریٚ تا پێیان بلێ ئازاری ڤاریا نەدەن، چونکە ڤاریا ناتوانیٚ لەیەك کاتدا هەم دەوری دایك و هەم دەوری ژنیان ببینیٚ. چووە لای متچیك دەستە وشك و گەرمەکەی خستە سەر تەوێلی و لیٚ ی پرسی : شوێنەکەت نارەحەتە ؟

متچیك کە کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەم خۆشەویستی یە چاوەڕوان نەکراوەوە لە وەلاما وتی : هیچ نیە ، گویٚ ی نادەمیٚ ... هەرکاتیٚ چاك بوومەوە لێرە دەڕۆم . ئەمجا بەپەلە وتی : بەلاْم ئێوە ... هەمیشە لە دارستاندان.

ئەی ئەگەر بە دەست خۆمان نەبیٚ ؟

متچیك بەسەرسامییەوە هاواری کرد: چۆن، چۆن؟

– مەبەستم مانەوەمانە لە دارستاندا . ئەمجا دەستی لەسەر تەوێلی متچیك لابرد و بۆ یەکەمین جار بەتاسەی راستەقینەی مرۆڤێکەوە لیٚ ی راما . دکتۆر چاوە رەش و گەشەکانی بڕی یە چاوانی متچیك . چاوانی متچیك غەمگین بوون، دەتووت لێوان لێوی خەمێکی خامۆشی ئەوتۆن کە روحی تەنیای ئەویان لە چیاکانی سیخوتەئالین و لە شەوانی درێژی نێو دارستاندا، لە پاڵ ئاگری دووکەلاْویدا بەتالاْن بردووە . متچیك بەدەم پێکەنینێکی دۆستانە و غەمگینەوە ، بە دەنگێکی پڕ لە ژارو ژەنگەوە گوتی : حالْی دەبم ، بەلاْم ناکریٚ لە گوندێکدا ... جێگیربین !!.. یانی ... هەرتۆ نالْێم ... متچیك بە دەم پرسیارە سەرسام ئامێزەکەیەوە لەسەری رۆیی و وتی : مەبەستم هەموو خەستەخانەکەیە .

– ئێرە سەلامەت ترە . تۆ لە کوێوە هاتی ؟

– لە شارەوە .

– دەمێکە ؟

– بەلْیٚ ، مانگیٚ پترە .

ستاشینسکی بە خۆشحالْیەوە پرسی : باشە کریزلمین دەناسی؟

– بەلْیٚ ..... بەلاْم زۆر نا .

ستاشینسکی بەدەم چاوتروکاندنەوە ، وەکو یەکێك لە پاشەوە ئەژنۆی دەلەکدا بیٚ بەپەلە لەسەرکۆتەرە دارێك دانیشت و لەسەری رۆیی : لەویٚ چی دەکا / وەزعی چۆنە ؟ کیٚ ی دی دەناسی؟

متچیك وتی : ڤنسیك ، یفرموف، گوریوف، فرانکل – بەلاْم عەینك لە چاوەکەیان نا . من هەر کورتە بالاْکەیان دەناسم ...

شتاشینسکی بەسەرسامییەوە پرسی : خۆ ئەمانە هەموویان ماگزیمالیستن! تۆ چۆنە دەیان ناسیت ؟

متچیك بە ترسەوە وتی ، لەگەلْیاندا بووم...



ستاشینسکی لەژێر لێوەوەو بە دوو دڵی یەوە کەوتە منگە منگ، بڵێ ، ئاو ـ ها ـ ها نازانم ....
ئەمجا بە دەنگێکی وشك و رەسمیانە کە دیسان غەریب دەینواند وتی : باشە ئیشەڵڵا کە چاك بوویتەوە .... ئەمجا بێ ئەوەی تەماشای متچیك بکا لە جێ ی خۆی هەستا . بەپەلە و بە هەنگاوی هەڕاو هەڕاوەوە رووی کردە زنجەکە، دەترسا نەوەك متچیك بانگی بکاتەوە .
متچیك لە دوواوە بانگی کردەوە ، قاسیوتیناش دەناسم ! دەتگوت چنگ لەشتێك گیردەکات و لە دەستی دەخزێ . دکتۆر لە کاتێکا سەیری متچیکی دەکرد و خێراتر دەرۆیی وتی : بەڵێ ، بەڵێ ...
متچیك کە زانی نەی توانیوە قەناعەت بە دکتۆر بکا ، سوور هەڵگەڕا و لە داخا کەوتە گینگڵ دان . دەمودەست یادو بیرەوەری تێکڕای رووداوەکانی مانگی رابردووی بە میشکا تێ پەڕی . جارێکی دی هەوڵیدا چنگ لە شتێك گیربکات کە دەتووت لە خزاندایە . لێوەکانی هەڵقورتاند بۆ ئەوەی جڵەوی گریان بگرێتەوە لە یەکبینە چاوی دەتروکاند ئاقیبەت چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك و بەسەر گوناکانیا هاتنە خوارەوە . سەری خستە ژێر پەتۆکەوەو جڵەوی دەسەڵاتی لە دەست بەربوو. بۆ ئەوەی بێ دەسەڵاتی خۆی بشارێتەوە ، بە هێمنی گریاو هەوڵی دا دەنگی هەنسك هەڵدان و هەڵ لەرزینی لەشی بشارێتەوە . ماوەیەکی زۆر بەسۆزەوە فرمێسکی هەڵڕشت ، بیرەکانیشی وەکو فرمێسکەکانی تاڵ و سوێر بوون، پاشان وردە وردە هێور بووەوە جوڵەی لێ بڕاو سەری لە ژێر بەتۆکەوە دەرنەهێنا .
ڤاریا چەند جارێك هاتە دیاری . متچیك بە ئاسانی دەنگی هەنگاوە قورس و پتەوەکانی ڤاریای دەناسییەوە ، چونکە ڤاریا بە شێوەیەکی ئەوتۆ ڕێ ی دەکرد دەتووت عەهدی لەگەڵ خۆی کردووە کە سەرانسەری ژیانی فارگونێکی پڕبار دەڵەك بدات .
ڤاریا بە دوو دڵییەوە تۆزێك بە دیار متچیکەوە دەمایەوەو پاشان بەجێ ی دەهێشت .
پیکا بەخشەخش هاتە دیاری و بەدەنگێکی ساف و هێمن پرسی: خەوتووی ؟
متچیك کە گیزەگیزی میشوولەکانی دەژنەوت خۆی کردە خەوتوو . پیکا بەدەم چاوەڕوانییەوە وەستا: دەبەسە ئیتر خەوبەسە ... دنیا تاریك بوو . ڤاریا و یەکێکی دی هاتنە دیار متچیك ، بە ئاسپایی لەسەر ئەرزەکە هەڵیان گرت و بردیان بۆ کەوێڵەکە . ناو کەوێڵەکە گەرم و تاریك بوو . ڤاریا بە یاریدەدەرەکەی خۆی وت : تۆ بڕۆ ... بڕۆ بەلای فرولوفەوە ، منیش هەنووکە دێم .
ڤاریا هەڵوەستەیەکی کرد ، دیقەتی تەختەکەی دا بە ئاسپایی پەتۆکەی لەسەر متچیك لادا:
پاڤل ئەزیزم چیتە ؟ نارەحەتی ؟
ئەمە یەکەمجار بوو کە ڤاریا متچیك بەنازناوەکەی خۆیەوە گازبکا . گەرچی متچیك لە تاریکی یەکەدا سیمای ڤاریای نەدەبینی، بەڵام هەستی بە بوونی دەکرد، دەیشیزانی کە هەردووکیان لە نێو کەوێڵەکەدان، متچیك بە ئاسپایی ناڵاندی : ئاه ، نارەحەتم .
– لاقت دێشێ ؟
– نە، مەسەلەکە ئەوە نیە .



ڤاریا بەپەلە نوشتایەوەوە مەمکە نەرم و گەورەکانی بە سینگی یەوە گوشی، ئەمجا ماچێکی گەرمی لێوەکانی کرد .






**جووتیاران و کرێکارانی**
**مەعدەنی زوخاڵی بەرد**

لڤنسون بە مەبەستی گەیشتنە بنج و بناوانی مەزندەکانی خۆی، ماوەیەك بەر لە کۆبوونەوەی شورا، چووە شوێنی کۆبوونەوەکە، دەیویست لەگەڵ جووتیارەکاندا تێکەڵ بیٚ و گویٚ لە رایەکانیان بگریٚ.

شورا لە قوتابخانەکەدا پێکهات، هێشتا خەڵکێکی کەم ئامادە بوو بوون. لڤنسون کە گەیشتە ئەوێن سەیری کرد بەو دەمەو ئێوارەیە خەڵکێکی کەم لەسەر پلیکانەکانەکان دانیشتبوون، ئەوانیش زۆربەیان لەوانە بوون کە لە رۆژانی زووتر لە مەزرا گەڕابوونەوە.

ریابیتس لە نێو دەرگایەکی وازدا دانیشتبوو، خەرێکی چرایەکی نەوتی بوو، دەیویست شووشە دوکەڵاوییەکەی بخاتە سەر.

جووتیارەکان بەدەم سەردانەواندنەوە دەستە رەش و زبرەکانی بەرەو لڤنسون درێژ دەکرد: سەلاّمولێك ئوزیب ئابرامیچ! لڤنسون یەك یەك تەوقەی لەگەڵ کردن و ئەوجا لەسەر یەکێك لە پلەکان دانیشت.

کیژانی گوند لەوبەری چۆمەکەوە بەشێوەیەکی نارێك دەسترین. بۆنی زبڵ و خاکی شێدارو دوکەڵی ئاگر ئاسمانی پڕ کردبوو. قەیاغێکی باربەر لەوبەری چۆمەکەوە بوو. دەنگی سمکۆڵانی ئەسپی شەکەت دەهات. لەو دەمەو رۆژئاوا گەرمەدا، لە نێو تەقەتەقی گالیسکەی پڕ بارو قۆڕە قۆڕی دوورو درێژی مانگای تێرو نەدۆشراودا، رۆژی پڕ تەقەللای جووتیاران بەرەو کۆتایی دەچوو.

ریابیتس هاتە بەر هەیوانەکەو وتی: زۆر کەس نەهاتووە، هەڵبەتە سەیریش نییە، پیاو ناتوانیٚ لەم رۆژەدا لەیەك شوێندا خڕیان بکاتەوە، زۆربەیان لە خەرمان جارەکان دەنوون.

– بۆ لەم هەفتەیەدا کۆبوونەوەی شوراتان کرد؟ ئایا زۆر پێویستە؟

کوێخا بە دوو دڵییەوە وتی: بەڵیٚ، هەندیٚ شت هەیە دەبیٚ بە ئاشکرا باس بکرێن. یەکێك لە ئەندامەکانیان –ئەو پیاوەی کە خۆم خەرجیم دەکێشا– کەتنی کردووە. هەڵبەتە زۆر گرنگ نییە، بەلاّم کارێکی زۆر خراپی کردووە. ئەوجا بە شەرمەوە سەیرێکی لڤنسونی کردو بێدەنگ بوو.

جووتیارەکان تێکڕا هاواریان کرد: ئەگەر گرنگ نییە، ئەدی بۆ شوراتان پێك هێنا؟ بە تایبەتی لەم کاتەدا کە ئێمە نامان پەرژیٚ تەنانەت سەری خۆمان بخورێنین.

لڤنسون شتێکی بۆ روون کردنەوە. پاشان جووتیارەکان بەدەم غەڵبە غەڵب و بڕینی قسەی یەکدییەوە سکاڵای خۆیان بۆ لڤنسون کرد. هەموو سکاڵایان دەربارەی کۆکردنەوەی خەلەو خەرمان و کەمی شتومەکی پێویست بوو.



- ئوزیب ئارامیچ تۆ دەبێ بزانی کە خەڵکی بەچی درەو دەکەن، کەس داسێکی ڕێکوپێکی نییە، هەموو داسەکان کۆن و پنج کراون، ئاخر ئەمە نەبوو بەکار، گیاندەرچوونێکی تەواوە بۆ خۆی!
- سیمون ئەو رۆژە چتۆ داسێکی سەقەت کرد! بێ بەلا بێ هەروا بزێوە، ئیبلیسێکە بۆ خۆی. عەینی مەکینە لەلایەکی مەزراکەوە پێ دادێ و لە پڕ داسەکەی بە بەردێکا دەدا.... وای دەشکێنێ کە هەر چاك نەبێتەوە...
- ئەرێ وەڵا داسێکی گەلێ چاك بوو، ئوباڵ بە گەردنم....

ریابیتس کەمیچ تێ فکری، منگەمنگێکی کرد: ئەمن نازانم ئەو خەڵکە ئێمە دەیانەوێ چ بکەن، داخۆ دەرەقەتی ئەو هەموو درەوە دێن؟

حاسلاتی ئەوساڵ گەلێ بە برشتە .... وای ئەگەر تا رۆژی یەك شەممە مەزرا گەورەکەیان تەواو کردبا! ... ئەرێ وەللا بابم ئەم جەنگە هەروا بەئاسانی نابڕێتەوە .

سیماو قەلافاتی تازە لە نێو تاریکییەکەوە وردە وردە دەهاتنە بەر ڕووناکی لەرزوکی چراکە ... هەندێکیان تازە لە کێڵگەکان گەڕابوونەوەو کوڵەکانیان هێشتا پێ بوو . بلووزی درێژو سپی چوونەیەکیان لەبەر بوو. چەقەچەقی دێهاتی و بۆنی قیروئارەق و گیای تازە درەو کراویان لەگەڵ خۆیانا هێنا : سلامولێك جەماعەت ....؟

- ئەهای ئەهای کوڕە ئیڤان ! بێرە پێشەوە ، بێرە پێشەوە ، با لەبەررۆشنایی یەکە سەروفەساڵت ببینم . سەیر سەیر خزمینە زەردەواڵە چ گاڵەیەکی پێ کردووە . خۆ خزمە من بینیم کە هەڵدەهاتی و زەردەواڵەکان تێت دەئالان ....

- ئاڵچاخ بۆ گیایەکەی منت رنیوە ؟

- گیای تۆ! ئەوە بەڕاستتە! من بەبست لە ئاقاری خۆم دەرنەچووم ، ئێمە پێویستمان بە ماڵی خەڵکی نییە ، شوکر بە زیادیشەوە بەشی خۆمان هەیە .

- کوڕە ئەمن ئەنگۆ چاك دەناسم ... ئەتۆ چاو چاو ، دەڵێ بەزیادەوە بەشی خۆمان هەیە ! ساڵی ئەو ساڵ بەرازەکانتان لە باخەکەی ئێمەدا بوون، هێشتاش جەنابی بەزیادە بەشی ... !

پیاوێکی کەلەگەتی چوارشانەی یەك چاو کە چاوی لە تاریکی یەکەدا دەبریسکایەوە ، لە پشت خەڵکەکەوە هات و وتی : هاورێیانی چاگویفکا دەڵێن ژاپۆنی یەکان پێرێ گەیشتوونەتە ساندوگا ، قوتابخانەکەیان داگیرکردووەو کەوتوونەتە ئازاردانی ژنەکان . ژنانی روس ... ئای زۆڵینە ! کابرا بە نەفرەتەوە تفێکی رۆکردە سەرزەوی و بە جۆرێ دەستی راوەشاند ، دەتووت داران دەشکێنێ .

- دڵنیابن دەگەنە ئێرەش !.....

- ئەمە چ نسیبەتێ بوو یەخەی گرتین !....

- ئێمەی جوتیار چ رێ یەکی نەجاتمان نیە ...

- زیان و زەرەری کوشندە هەر بەشی ئێمەیە ، بریا ئەم جەنگە زوو دەبڕایەوە .

- مەسەلەکە ئەوەیە کە چ دەرەتانێکمان نیە، جا بۆیە ئێرە یا دەبێ بە گۆرمان یا تابووتمان .



لڤنسون به بێدەنگییەوە گوێی بۆ قسەکان رادەدێرا . کلاوێك و ردێنێکی سوورو پووتێکی تا ئەژنۆ درێژ کالآی بالآی لڤنسونی پێك دەهێنا . جوتیارەکان لڤنسونیان تەواو فەرامۆش کردبوو ، بەلأم لڤنسون کە ئەم ئاوازە ناسازانەی دەبیست پێشبینی مەترسیەکی مسۆگەری دەکرد ، مەترسییەك کە هەر خۆی هەستی پێ دەکرد لڤنسون لە دلّی خۆیا وتی : وەزعێکی خراپە ... زۆر خراپ . پێویستە سبەی بەیانی زوو نامەیەك بۆ ستاشنسکی بنووسم ... پێ ی بلّێم لەهەر شوێنێ بووە بریندارەکان بشارێتەوە . پێویستە پاسدارەکانمان بەهێز بکەین .... ئەمجا سەرلقەکەی گازکرد : باکلانوف ! دەقەیەك . بزانە ... وەرە پێشترەوە پێم وایە دەبێ مشورێکی عەمارەکە بخۆین و حەرەسێکی بۆ دابنێین . هەروەها دەوریەکی سوارە تا دەوروبەی گریلوفکا بنێرین ... بەتایبەتی شەوان ، ئێمە تا ئێستا زۆر خەم ساردبووین .

باکلانوف سەرەتاشراوەکەی بەلای لڤنسون دا وەرگێرا . شلەژان و زرینگی لە چاوە پڕ گومان و بچوکە تاتاریەکانییەوە شەپۆلی دەدا . بە ترسەوە پرسی : مەسەلە چی یە ؟ خەتەرێ لە گۆڕێ دا هەیە ؟ یا مەسەلەیەکی دی یە ؟ لڤنسون بە شۆخی و خۆشەویستی یەوە وتی : برادەری ئازیز شەرە شەڕ لە کاتی شەڕیش دا خەتەر هەمیشە لە گۆڕێ دایە . لڤنسون بە جۆرێکی چاوەروان نەکراو پێکەنی و سیخورمەیەکی بە قەبرغەی باکلانوفدا کێشا : جەنگ زۆر جیاوازترە لەوەی ماروسیا ببەیتە نێو خەرمانی پوش و لەگەلیا رابوێری ، هاوڕێ ی عەزیز .

باکلانوف وەکو یەکێك ختۆکەی بدەی لە پڕ کەوتە سەرکەیف و دەستی لڤنسونی گرت و وتی : ئەی فێلّباز ، بەڕاستی زۆر زانی . ئەمجا دەستەکەی تری لڤنسونی بەپشتا باداو بەسەر پلەکاندا پالّی پێوەناو بە شۆخی یەوە بولاندی: خۆت گیل مەکە – ناتوانی لە دەستم دەرچی . لڤنسون کە خەریك بوو بە ئاسپایی دەکەتە سەر زەوی گوتی: بڕۆ، بڕۆ ماروسیا گازت دەکا ، واز لەمن بێنە ئیبلیس! نابێ لەنێو شورادا بەم جۆرە رەفتارم لەگەلّ بکەی .

– شانست هەبوو، دەنا تێم دەگەیاندی .

– بڕۆ بەلای ماروسیاوە ، چاوەڕێتە .

باکلانوف هەستایە سەرپێ وپرسی : وتت یەك حەرە س؟

لڤنسون بە نیگای پڕ لە پێکەنینەوە لە دوواوە سەیری دەکرد . جوتیارێك وتی : بەڕاستی سەرلقەکەت پیاوێکی تەواوە ، نەجگەرەکێشە نە مەشروب خۆرە ، لەمانەش گرنگتر گەنجە . پێرێ بۆ بەرۆکی ئەسپ هاتە مالّی ئێمە ، هەرچیم لەگەلّ کرد کە پێکێ ڤودگا بخواتەوە ، ملی نەدایە خەت و وتی : نەخێر ، مەشروب خۆرنیم ، گەر دەتەوێ میوان داریم بکەی ئەوا هەندێشیرم بدەرێ ، حەزم لە شیرە وەکو مندالّ نانەکەی گوشەیە کاسەیەکەوە و شیرەکەی بەسەرا کردو خواردی ، بەراستی پیاوێکی زۆر چاکە . کۆمەلّە پارتیزانێك لەنێو خەلّکەکەوە پەیدابوون، لوولەی تفەنگەکانیان دەبریسکایەوە. پارتیزانەکان پێکەوەو لە کاتی خۆیدا گەینە جێ . پاشان مەعدەنچی یەکان بەرێبەری تیمون دیبوف ی کۆنە مەعدەنچی هەرێمی ساچان و سەرد دەستەی ئێستا هاتنە ژوورەوە .



ئەوانیش چوونە نێو حەشاماتەکەوە ، حەشاماتەکە وەکو پورەی هەنگ تێکەڵ بووبوون .
تەنیا ماروسکا نەبێ بەتاقی تەنێ و بەخەمبارییەوە لەسەر کورسیەکی پاڵ دیوارەکە دانیشتبوو .
دوبوف کە ڤنسونی بینی، وەکو یەکێك لە مێژ بێ هاوڕێ یەکی خۆشەویستی خۆی نەدیێ، بەخۆشحاڵییەوە هاواری کرد: ئاه ئەوە تۆیش لێرەی؟
دوبوف بە دەستە لیرو زبرەکەی دەستی ڤنسونی گوشی و بە ئەسپایی پرسی ئەرێ ئەو هاوڕێ مەعدەنچی یە چ خەتایەکی کردووە؟ کە ڤنسون مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە ، دوبوف بە حەماسەوەوتی : تەمێ ی بکە دەرسێکی وای بدەرێ کە ببێ بەپەند بۆ ئەوانی تریش .
پیاوێکی گەنج بە نێوی سیسکین کە کلاوی قوتابی لەسەر بوو، جووتێ پوتی بریقەداری لە پێ بوو، بەسەدایەکی دلفڕێنەوە وتی : دەبووایە زۆر زوو تر تەمێمان بکردایە، هێزەکەمانی بەدناوکردووە .
دوبوف بێ ئەوەی تەماشای سیسکین بکات، قسەکەی پێ بڕی : کەس داوای رای تۆی نەکردبوو . سیسکین لێوی هەڵقورتاند و بەرەنجاوییەوەو بەرقەوە سەیری دوبوفی کرد. بەلام کە بینی ڤنسون مۆڕەی لێ دەکات ، پێچێکی کردەوە و خۆی لەنێو حەشاماتەکەدا ون کرد.
دوبوف بە توندی پرسی : ئەو حەشەرەیەت بینی ؟ بۆ لە هێزەکەی خۆت دا جێت کردووەتەوە ، دەڵێن لەسەر دزی لە قوتابخانە دەریان کردووە .
ڤنسون وتی : نابێ باوەڕ بە هەموو پرۆپاگەندەیەك بکرێ . ریابیتس بە شلەژاوی یەوە دەستەکانی دەجولاند ، باوەڕی نەدەکرد ئەم هەموو خەڵکە لەبەرخاتری بێستانە پوش گرتووەکەی ئەو لێرە خڕ ببنەوە، لەبەر هەیوانەکەوە گازی کرد، هاوڕێ فەرماندە با بچینە ژوورەوە ناکرێ تا بەیانی دانیشین ....
ژوورەکە گەرم بوو، دووکەڵی سەوز باوی سیغار قانگی دابوو . کورسی کەم تێدابوو، جووتیارو پارتیزانەکان لەنێو رارەوو ژوورەکەدا پێکەوە نووسابوون. ئەوەندە قەرەباڵغ بوو کە ڤنسون لە پشتەوە هەستی بە هەناسەی هەندێکیان دەکرد .
ریابیتس بە خەمبارییەوە گوتی : ئوزیب ئابرامچ دەست پێ بکە . ریابیتس هەم لەبەر خۆی و هەم لەبەرکاکی فەرماندە نیگەران بوو: هەموو ئەم بەزم و رەزمەی بەهەراو هوریایەکی نا پێویست و بێ ئەنجام دەهاتە بەرچاو .
ماروسکا بەچاوی مۆن و رووی گرژەوە جێ ی خۆی لەنێو دەرگا وازەکەدا کردەوە و لە تەنیشت دوبوفەوە وەستا . ڤنسون تاکیدی لەسەرئەوە دەکرد کە هیچ کاتێ لە پێناوی کاری تایبەتی دا کەسی لەکارنەکردووە. خۆ ئەگەر کارێکیش پێوەندی بەهەموو لایەکەوە بووبێ ، واتە بە جووتیاران و پارتیزانانەوە ئەوا ئەنجامدانی کارێکی پێویستە و کەس گلەیی ناکات .
ڤنسون بە زمانی سادەی جوتیاران قسەی دەکرد و لەسەر وشەکانی رادەوەستا ، ئەنجام وتارەکەی خۆی بەم رستەیە کۆتایی پێ هێنا: بریارەکانی دی لەلای خۆتانە ڤنسون بە ئاسپایی لەسەر کورسیەکەی دانیشتەوە ، ئیدی بوو بە جەستەیەکی لەبیرچوو و چەشنی



گڕی مۆمێك دامركایەوە . وازی لە شوورا هێنا تا بەخۆیان مەسەلەكە بڕیننەوە . زۆربەی ئامادەبووان لەیەك كاتدا دەستیان بە قسان كرد، زۆربەیان بە دوو دڵی یەوە كەوتنە باس و خواسی كاروباری لاوەكی و لە گفتوگۆكە دووركەوتنەوە. كە حەشاماتەكە كەوتنە باس و خواس، قسەكانیان گەلێ نامەفهوم بوو . زۆربەی قسەكەران جوتیاربوون . بۆیە پارتیزانەكان داوایان كرد ڕێ ی قسەكردن بەوانیش بدەن .

پیرەمێردێك بەناوی یفستافی . سیما ژاكاو ردێن بۆز، بەجۆرێ پەنجە لاوازەكانی رادەوەشاند دەتووت یەكێك ئامۆژگاری دەكات . زۆر جدیانە كەوتە منگ منگ: نا ئەمە ڕاست نیە .ئێستا دەوروزەمان گۆڕاوە. لە زەمانی تزار نیكولای دا خەڵكیان لەسەر ئەم جۆرەشتانە بە بازاڕو كۆڵاناندا دەگێڕا . شتە دزراوەكەیان بە ئەستۆی دزەكەوە دەبەست و بەتەنەكە لێدان دووی دەكەوتن و شەقام بە شەقام دەیان گێڕا . پیاوە چوارشانەیەك چاوەكە هاواری كرد زەمانی تزار زیندو مەكەنەوە ! كابرا دەیویست دەست راوەشێنێ ، بەڵام قەرەبالغی یەكە دەرفەتی نەدا بۆیە پتر رقی هەستا : تزار مردوو برایەوە ، مێملێكمان لە كۆڵ بووەوە ! بەڵام مەخابن عەقڵ و هەستی هەر یەكێكتان تزارێكە بۆ خۆی .

پیرەمێرەكە بە لاساری یەوەدووبارەی كردەوە : زەمانی تزار بێ یا غەیری تزار ، ئێمە دەبێ نان بە هەموو دەستەكانیان بدەین . بەڵام خۆ بۆ دز بەخێوكردن لێرە دانەنیشتوین .

پیاوەیەك چاوەكە بە دەم ئیشارەت كردنەوە بۆ كوڕی پیرەمێردەكە كە لەم دەساڵەی دوایی یەدا خۆی گوم كردبوو ، وتی : بێگومان تۆ خۆت یەكێكی لەو دزپەروەرانە، دەناكێ وتویەتی دز پەروەردە بكەین ، كەسێش دز ناحەوێنێتەوە. ئەم بەستەزمانە شەش ساڵی رەبەقە دەجەنگێ ، خۆ دنیا كاول نەبوو كە ئیشتیای چووە سەركاڵەك و چەن كاڵەكێكی كردووە ! .پێویستە یاسایەكی نوێ دابنێین . جوتیارێكی دی كە دەیویست لەچەند وچوونی مەسەلەكە تێ بگا پرسی: باشە لۆ ئەو كارەی بە دزی یەوە كردووە ؟ جا بۆچیش! بۆ كاڵەكی بێ ئەهمیەت . خۆ بهاتبایە كن من ، یەك سەتڵێ كاڵەكم دادەیێ و هەر بە خەیاڵیشمدا نەدەهات . ئێمە كاڵەك دەدەینە بەرازەكانمان ئێدی چۆن لە پیاوێكی باشی مەنع بكەین !

قسەی جوتیارەكان چ شەقڵێكی تورەیی پێوە دیارنەبوو ، زۆربەیان رازی بوون بەوەی مەسەلەكە بەپێ ی یاسای نوێ بخرێتە بەر لێكۆڵینەوە، چونكە قەناعەتی تەواویان هەبوو كە یاسا كۆنەكان بێ كەڵكن .

جوتیارێكی دی هاواری كرد: با ئێمە خۆمانی تێ هەڵنەقورتێنین، لێ گەڕێن با ریابیتس مەسەلەكە لەگەڵ خۆیاندا چارەسەر بكات . لڤنسون لە جێ ی خۆی هەستا ، چەند جارێك پەنجەی بە مێزەكەدا كێشا، ئەوجا بەكاوەخۆ بەجۆرێ كە دەنگی بگاتە هەمووان وتی هاوڕێیان بێ زەحمەت یەك یەك قسان بكەن، ئەگەر هەموو پێكەوە قسان بكەین شیرازەی كارەكەمان دەپچڕێ و هیچ بە هیچ ناكەین، ئەوە كوا ماروسكا ؟ وەرە ئێرە ! بە جۆرێ ماروسكای گازكرد كە هەموو حەشاماتەكە ئاوڕیان بۆ لای ماروسكا دایەوە ، ماروسكا بە دەنگی بەرز وەڵامی دایەوە ، شوێنەكەم باشە .



دوبوف سیخورمەیەکی لە ماروسکا داو گوتی : هەستە بڕۆ !

ماروسکا دوو دڵ بوو . لڤنسون کەمێك بە پێشا دانەوی یەوە ، نیگای چاوەکانی ماروسکای بەنج کرد، وەك چۆن گازێك مێخ لە دیوار دەرێنیٚ بەو جۆرە نیگای لڤنسون ماروسکای لەنێو قەرەباڵغی یەکە هێنایە دەریٚ. ماروسکا بە ئانیشك دڕی بە حەشاماتەکەداو بەمل کەچی و چاوشۆڕی بەرەو مێزەکە چوو ، ئازای گیانی لە ئارەق هەڵکشابوو، دەستەکانی دەلەرزین، هەرچەند سەدان چاوی پرسیار ئامێزی تیٚ برابوو بەلاٚم هەرسەری هەڵبڕی ، چاوی لەسەر سیمای گرژو توکنی گونچارینگو گیرسایەوە . سیمای گونچارینکو جدی و دڵسۆزانە بوو، ماروسکا نەیتوانی تەماشای بکا ، سەری بەلای پەنجەرەکەدا وەرگێڕا ، چاوی بڕییە ئاسمانی خاڵی و لێڵ ، بەبیٚ جوڵە لەجیٚ ی خۆی وەستا لڤنسون بەدەنگێك کە دەگەیشتە ئەوانەی بەرهەیوانەکەش وتی : بەیارمەتیتان با ئەم مەسەلەیە چارەسەربکەین ، کیٚ قسەی هەیە ؟ تۆ بابە ؟

یفستافی بە شڵەژاوی وەلاٚمی دایەوە : نەخێر هەروا لە بەینی خۆماندا قسەمان دەکرد. جوتیارەکان هاواریان کرد: ئێمە چ قسەیەکمان نیە ، بەخۆتان مەسەلەکە چارەسەربکەن . دوبوف کەهەوڵی دەدا رقەکەی دامرکێنێتەوە، لە پڕ هاواری کرد : سەبرکە بابە . بەیارمەتیت با من قسان بکەم! دوبوف لەو دەمەدا کە تەماشای یفستافی دەکرد، لە بری بابە یفستافی بە بیٚ ئیختیار بە بابە لڤنسون گازی کرد. ئاوازی دەنگی دوبوف سەرنج راکێش بوو ، بۆیە حەشاماتەکە خڕ روویان بەلای ئەودا وەرگێڕا .

دوبوف بە پاڵەپەستۆ دڕی بە حەشاماتەکەداو بەرەو مێزەکە چوو، لە تەنیشت ماروسکاوە وەستا. هەیکەلی زەلامی دوبوف بەردەم لڤنسونی گرت. دوبوف کەمیٚ دانەوییەوە ، بەڕقەوە هاواری کرد: ئێوە واتان پیٚ چاکە کە خۆمان مەسەلەکە چارەسەربکەین ! بەپەلە ئاوڕی لە ماروسکا دایەوەو چاوە ئەبڵەق و ئاگراویەکانی تیٚ بڕی : تۆ دەڵیٚ ی یەکێکی لە ئێمە – یانی بابایەکی مەعدەنچی ؟ بەگازندەو تورەییەوە پرسی: ئەهای دووڕە، کوڕە بیٚ وەفاو نمەك حەرامەکەی ساچان ! لەخۆت ناگری یەکێك بیٚ لە ئێمە ؟ دەتەویٚ دزبی ؟ تۆسەری هەموو مەعدەنچیەکانت شۆڕکردووە! زۆر باشە ئێمەش ئێستا کارەکە یەك لاییٚ دەکەوینەوە ! قسەکانی دوبوف وەکو هاڕەی داروخانی کانە زوخاڵ بێدەنگی یەکەی شڵەقاند . ماروسکا رەنگی بوو بوو بە چاوی سپی ، جڵەوی فرمێسکەکانی بۆ نەدەگیرا بە دڵی خەمگین و رەنجاوەوە سەیری دوبوفی دەکرد. دوبوف دووپاتی کردەوە، زۆر چاکە ، دزی خۆت بکە ئێمە دەرت دەکەین بابزانین بەبیٚ ئێمە چ کارێك دەکەی ! دوبوف لەپڕ قسەکەی بڕی و بەرەو لای لڤنسون کشایەوە، یەکێك لە پارتیزانەکان هاواری کرد: کیٚ دەردەکەن؟

دولوف هەنگاوێك چووە پێشەوەو بۆڵەیەکی کرد: چی ؟

دەنگێکی منگن و کز لە گۆشەیەکی ژوورەکەوە گەییە کویٚ: کوڕینە مەحز بۆ رەزای خوائەوەندە بەتوندی مەی گرن . لڤنسون لە دوواوە قۆڵی کراسەکەی دوبوفی راکێشاو گوتی : دوبوف کەمیٚ لەولاترەوە بوەستە بەچاوت گرتووم ....



دوبوف لە پڕ هێور بووەوە ، شەرمەزارانە چاوی دەتروکاند .
گونچارینکو بە قژەتاوەسووتەکەیەوە سەری هەڵبڕی و بەدەنگی بەرز هاواری کرد : چۆن کابرایەکی گەوج لە خۆمان دووربخەینەوە هەڵبەتە نامەوێ بەرگری لێ بکەم ، چونکە کارەکەی هی ئەوە نیە بەرگری لێ بگرێ، بەهەرحاڵ کارێکی ناجۆر و ناشیرینی کردووە ، من من بەشی خۆم سەرزەنشتم کردووە ، بەڵام ئێوە ببەخشن – لە شەڕدا پارتیزانیکی چاکە، پێکەوە لە بەرەی ئاسووریدا شەڕمان کردووە ، کابرا یەکێکە لە خۆمان و قەت خیانەتمان لێ ناکات .
دوبوف بەتاڵی یەوە گوتی: یەکێکە لە ئێوە ! بەڵام لە ئێمە نیە ؟ ئێمەش پێکەوە لە تونێلێکی دوزەخ ئاسادا کارمان کردووە . سێ مانگی رەبەق لەژێر یەك پاڵتۆدا خەوتووین .
دوبوف لەپڕ قسە حەقەکەی سیسکینی بیرکەوتەوەو بەبۆڵەبۆڵەوە وتی : هەر هەرچی و پەرچییەك راست دەبێتەوە دەیەوێ لێمان ببێ بە مامۆستا !
گونجارینکو ئەم توانجەی دووایی دوبوفی بردە سەرخۆی ، ئەمجا مۆریەکی لێ کردو وتی : من واتێ دەگەم نەدەتوانین چاوپۆشی لە هیچ شتێ بکەین و نەدەتوانین هیچ کەسێکیش دەربکەین !ئێمە مافی تڕۆکردنی ئەندامانی خۆمان نیە. بەڕای من پێویستە ئەو شتە لەخۆی بپرسین! دەستە زل و زبرەکانی بەجۆرێ رادەوەشاند وەك بیەوێ لایەنی دروستو نا دروستی رایەکەی خۆی لێکتر هەڵاوێرێ دروستە با لە خۆی بپرسین ، لێگەڕێن با خۆی پێمان بڵێ ئەوساکە هەموومان حاڵی دەبین کە ئاخۆ یەکێکە لە ئێمە یان نا .
دوبوف کە دڕی بەخەڵکەکە دەداو خەریکی گەڕانەوە بوو، لە رارەوەکەدا هەڵوەستەیەکی کردو سەراپای ماروسکای دایە بەر نیگای پشکێنەر.
ماروسکا کە قامکە ئارەق کردووەکانی بەسەر بلووزەکەی دا دەهێنا ، بە شلەژاوی لە نیگای دوبوف ورد بووەوە.
– بزانم دەتەوێ چ بڵێ ی !
ماروسکا بە تیلەی چاو سەیرێکی لڤنسونی کرد و دەمی هەڵێنا ، تۆ بەراستی لات وایە کەمن .... دەستبەجێ زمانی چووە کلیلە نەیتوانی مەبەستەکەی بە وشە بسپێرێ و بیدرکێنێ .
خەڵکەکە هانیان دەدا کە درێژە بەقسەکەی بدات : بڵێ، بڵێ !
– تۆ لات وایە کەمن دەتوانم .... شتێکی ئاوها ... هەمدیس وەستا، ئیشارەتێکی بۆلای ریابیتس کرد و لەسەری رۆیی : زۆر چاکە ، ئەو گوندۆرانە... تۆ لات وایە ئەگەر تۆزقاڵێ بیرم بکردایەوە ... ئەو کارەم دەکرد .... بێت وایە ئەو کارە لە رووی نەگریسیمەوە بووبێ ؟ کە منداڵ بووین دزیمان دەکرد – تۆ خۆت چاك دەزانی ... هەڵبەتە منیش دەزانم ... دوبوف گوتەنی من سەری هەمووتانم شۆڕکردووە بەڵام ئاخۆ من دەتوانم، برایان ... دووا وشەکان لە قوڵایی دڵیەوە دەردەچوون. کەمێك سەری داخست و دەستی خستە سەرسنگی خۆی و تیشکێکی گەرم و هێدی لە چاوییەوە بریقایەوە .... منێك کە ئامادەم هەموو دڵۆپە خوێنێکم فیدای یەك بە یەکی ئێوە بکەم، چۆن ناتوانم نەبمە مایەی شەرمەزاریتان !



هەندێ دەنگی بێگانە لە دەرێ را ڕژایە ژوورەکەوە: سەگێك لە دوورەوە دەوەڕی ، کیژانی ئاوایی دەسترین ، لە ماڵی کەشیشەکەوە دەنگێکی بەڕیتم و ئاهەنگ و توند و قایم دەگەیشتە گوێ . لەبەری قەباغەکەوە دەنگی ناڵەیەکی دوورو درێژ بیسترا ...

دەنگی ماروسکا هێشتا هەمان هەڵچوون و شڵەژانی پێوە دیاربوو. ماروسکا مەحکەم تر بەلاّم ریاکارانە تر قسەی دەکرد: باشە چۆن خۆم تەمێ خواردووبکەم ؟ من تەنیا گفتی کرێکارانەتان دەدەمێ کە چیدی ئەو جۆرە کارانە نەکەمەوە ...

لڤنسون پرسی : ئەدی ئەگەر گفتەکەت نەبردە سەر ؟

ماروسکا لەبەردەم حەشاماتەکەدا تەریق بووەوە ، بەروویەکی گرژەوە وتی: من قسەی خۆم ناشکێنم .

– ئەدی ئەگەر شکاندت ؟

– ئەگەر شکاندم ، چیتان پێ خۆشە وام لێ بکەن .... حەز دەکەم تیربارانم بکەن ...

دوبوف رقەکەی نیشتبووەوە ، تروسکەی شادی لە چاوانی دەباری ، بە پێکەنینەوە وتی : بەڵێ ئەوجا تیربارانت دەکەین !

خەڵکەکە لە جێ ی خۆیانەوە هاواریان کرد. باشە ئیدی تەواو. جوتیارەکان بە کۆتایی هاتنی ئەم کۆبوونەوەیە دووردرێژە خۆشحاڵ بوون ، کەوتنە دەنگە دەنگ و غەڵبە غەڵب : باوکم قسە هەزارەوە دووانی بەکارە .

– کەواتە ئەمە بڕیارەکەمان بوو ., چ پێشنیازێکی دیتان نیە ؟.

پارتیزانەکان کە تەواو وەڕس ببوون تێکرا هاواریان کرد: دەبەسە تەواوی کەن ، تاقەتمان چوو برسیمانە –ئاگاتان لە قۆڕەقۆڕی سکمان نیە !؟

لڤنسون دەستی هەڵبڕی، چاوێکی بەسەر حەشاماتەکەدا گێڕا وتی : کەمێ سەبرکەن ، ئەوە مەسەلەیەکمان چارەسەرکرد ، بەلاّم یەکێکی دی ماوە

– ئەویان چی یە ؟

لڤنسون سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و بەڕووخۆشییەوە وتی : پێم وایە پێویستە بەیانێك دەربکەین ، بەلاّم حەیفێ سکرتێرمان نیە ، ئادەی سیسکین بنووسە : (بەیانەکە : کە چالاکی عەسکەری دەوەستێت ، دەبێ پارتیزانەکان لە بری پیاسەکردن بچنە کێڵگەکان و یارمەتی جوتیاران بدەن، با ئەو یارمەتییە کەمیش بێت ....)

لڤنسون بە جۆرێ قسەی دەکرد وەك بڵێ ی بەڕاستی باوەڕی وایە دەبێ پێشمەرگەکانی یارمەتی جوتیاران بدەن . یەکێ لە جوتیارەکان وتی : بەلاّم خۆ ئێمە ئەم چەشنە داواکاریا – نەمان نیە . لڤنسون لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە : ئەوانی دی رازین . جوتیارەکانی دی قسەی جوتیاری یەکەمیان بڕیو بە نارەزایی یەوە بە رووبا هەڵشاخان : تۆ قسان مەکە بۆ خۆت گوێ بگرە ، واز بێنە با کۆمەکمان بکەن – دەستی کەرەم ناگێڕدرێتەوە .

لڤنسون دووا بە دووای بەیانەکە وتی : هەوڵ دەدەین یارمەتیەکی تایبەتی ریابیتس بدەین .....



جوتیارەکان بە ناڕەزایی و هەڵچوونەوە هاواریان کرد: جا بۆ تایبەتی بابم ؟ خۆ هەموو کەسێ دەتوانێ کوێخایەتی بکا، کارێکی گەلێك زەحمەت نیە ....

– بەسە بەسە رازین .. بنووسە .

پارتیزانەکان بێ ئەوەی گوێ بە فەرماندەکانیان بدەن هەستان ولە ژوورەکە چوونە دەرێ ... پیاوێکی توکنی لووت باریك بەپەلە بەرەو پیری ماروسکا چوو لەگەڵ خۆیدا بەرەو دەرگا رای کێشا . بەدەم خشەخشی سۆڵەکانی یەوە وتی : ئەهای ڤانیا کوڕە باشەکەم . رۆڵەکەم چڵمن ...!

پیاوە توکنەکە کڵاوەکەی لارکردەوەو دەستێکی لەناوقەدی ماروسکا ئاڵاند و بەنیمچە سەماوە بەرەو هەیوانەکە دای کێشا .

ماروسکا کابرای لەخۆی دوورخستەوە وتی : بڕۆ بۆ خۆت بڕەقسە. لڤنسون و باکولانوف بە هەشتاو بەتەنیشت ئەواندا تێپەرین . باکلانوف بە دەم دەست جولاندنەوە وتی : ئەم دوبوفە بەقەد گایەك بەکارە ! هەقە نیە بەرامبەر لە گونچارینکو بگرێ . بەڕای تۆ کامیان براوە ئەبن ؟ لڤنسون لە دەریای بیری خۆی دا بوو، ئاگای لە قسەکانی باکلانوف نەبوو، بەدەم رێ کردنەوە پێیان بە خاکی نمداری جادەکەدا رۆدەچوو. ماروسکا لەوانی دی دوواکەوت . دووا دەستەی جوتیارەکانی پێ گەیشتەوە . جوتیارەکان ئەوەندە بە نەرمی گفتوگۆیان دەکرد دەتووت لەسەر ئیش دەگەڕێنەوە نەك لە شوورا . پەنجەرەی رووناکی کەوێڵەکان بە شێوەیەکی دڵڕفێن و جوان چاوشار – کێیان لەگەڵ گردۆڵکەکاندا دەکرد و خەڵکەکەیان بۆ شێوکردن بانگ دەکرد . چۆمەکە لەتەما دیارنەبوو ، هاو ئاواز لەگەڵ دەنگی سەدان قوڵێنگ دا گۆرانی دەچڕی .

ماروسکا وردە وردە دەچووەوە دۆخی ئاسایی جارانی . کتوپڕبیری کەوتەوە کە میشکا هێشتا ئاونەدراوە .میشکا هەرکە بۆنی خاوەنەکەی کرد ، بەرقەوە کوڕماندی، دەتگوت دەڵێ : ئەوە بەئەستۆی وردت تا ئێستا لە کوێ بووی ؟ ماروسکا لەنێو تاریکی یەکەوە بە لەپەکوتێ دەستی گەیاندە یالی بژی ئەسپەکەو لە تەویلەکە بردی بە دەرێ .

کە میشکا لمۆزی تەڕی لە ئەستۆی ماروسکا هەڵسوو، ماروسکا سەری دایە دوواوە وتی : دیارە تۆش خۆشحاڵی ، هەی حیلەباز ، تەنیا حیلەبازی چاك دەزانی ، ئەوجاش هەردەبێ من لە بڕی هەردووکمان وەڵام بدەمەوە ...........






**لڤنسون**

هێزەکەی لڤنسون مانگێك پتر بوو کە لە ئیسراحەت دابوون ئەم ماوەیە هەندێ گالیسکەو ئامانی ئاشخانەو چەند ئەسپێکی ئامادە کردبوو کە فیرارە شڕپۆشەکانی لقەکانی دی چاویان تێ بڕی بوو، ئەو فیرارانەی کە گوێ رایەڵ ترین خەڵك بوون. پارتیزانەکان لە رادەبەدەر پشوویان دابوو، ئەوەندە تەمەڵ بوو بوون تەنانەت لە ئێشك گرتنیشدا دەخەوتن، لڤنسون لەبەر ئەوەی هەندێ هەواڵی سەیری پێ گەیشتبوو، سوور بوو لەسەر ئەوەی تا زووە ئەم هێزە ئەستوورە بجوڵێنێ. حەقیقەتە تازەکان بۆنی خەتەریان لێ دەهات و بیرە سامناکەکانی مێشکی لڤنسونیان دەچەسپاند. لڤنسون چەند جارێ گلەیی ئەوەی لە خۆ کرد کە پیاوێکی کەمتەرخەمو لیبراڵە — بەتایبەتی ئەو دەمەی کە ئاشکرا بوو ژاپۆنییەکان لەکریلوفکا دەرچوونو دەورییەکانی ئەم"لڤنسون" نەیانتوانی بوو لەدووری چەند میلی کریلوفکاوە پێوەندی بە هێزەکەیەوە بکەن.
بە هەر حاڵ جگە لە ستاشینسکی کەس کەس ئاگای لە بێ ورەیی لڤنسون نەبوو. هیچ پێشمەرگەیەکی هێزەکە رێی بە خۆی نەدەدا وا بیر بکاتەوە کە رەنگە لڤنسونیش دوو دڵ بێ، چونکە لڤنسون بیرو هەستو رازی خۆی بۆ کەس دەرنەدەبڕی. وەڵامەکانی هەمیشە بریتی بوون لە (بەڵێ)، (نەخێر). لڤنسون بەلای هەموویانەوە —جگە لە پیاوانی وەك دوبوف، ستاشینسکی و گونچارینکو کە نرخی راستەقینەی ئەویان دەزانی— کابرایەکی زۆر بە جەوهەرو بێ وێنە بوو. هەموو پارتیزانەکان بە تایبەتی باکلانوف لاو هەوڵیاندەدا لە رەفتارو هەڵسو کەوتیاندا لاسایی لڤنسون بکەنەوە. پارتیزانەکان وا بیریان دەکردەوە: هەڵبەتە من لاوازی زۆرم هەیە، خەتابارم، گەلێ شت نازانم، زۆر جار خوم پێ کۆنترۆڵ ناکرێ، ژنێکی خۆشەویست و دڵسۆز یا نەوبووکێکم لەماڵیدایەو ئارەزووی دیداری دەکەم، من حەزم لە گوندۆرەی شیرین و نانو شیرە، حەز دەکەم قۆندەرەی بریقەدار لەپێ بکەم، تا نیوەشەو سەما بکەمو دڵی کیژانی گوند بفرێنم. بەڵام لڤنسون —مرۆڤیکی سەیرە! چ پیاوێکە! پیاوێکە بنیادەم ناتوانێ ئەم چەشنە گومانانەی لێ بکات. لڤنسون کارامەیەو هەموو شتێ دەزانێ،هەموو کارێك بە دروستی ئەنجام دەدات، وەکو باکلانوف دوای کیژان ناکەوێ، وەکو ماروسکا گوندۆران نادزێ، تەنیا یەك شتی لە خەیاڵ دایە ئەویش کارەکەیەتی. مرۆڤ ناتوانێ باوەڕی پێ نەکات، ناتوانێ گوێ رایەڵی نەبێ، بۆ؟ چونکە پیاوێکی پیاوانەو راستو بێ غەلو غەشو کەموکوڕییە!
لەو رۆژەوە کە بە فەرماندە هەڵبژێردرا، هیچ پارتیزانێك نەی توانیبوو جگە لەو شێوەیە بیهێنێتە بەرچاوی خۆی: بەڕای پارتیزانەکان هەر بۆ فەرماندەیی خوڵقابوو. خۆ ئەگەر لڤنسون بۆی بگێڕانایەوە کە چۆن باوکی کۆنەفرۆش بووەو ئەم بە منداڵی یارمەتی داوە، چۆن باوکی هەموو خەمێکی ژیانی دەوڵەمەند بوون بووە، چۆن لڤنسون خۆی لە مشك ترساوە چۆن کەمانچەی



خراپ لێداوە، ئەوە هیچ یەکێکیان باوەڕیان نەدەکردو بە شۆخییان دەزانی. بەڵام لڤنسون هەرگیز باسی ئەم شتانەی ناکرد، کە باس دەهاتە سەر ئەم شتانە بێدەنگ دەبوو، هەڵبەتە نەك بۆ شاردنەوەیان بەڵکو لەبەر ئەوەی کە دەیزانی هەموویان وەکو (کابرایەکی بە جەوهەرو بێ وێنە ڕێزیان دەگرت) لڤنسون کەمو کوڕیو بێ توانییەکانی خۆیو خەڵکانی دی چاك دەزانی.
لڤنسون باوەڕی وابوو تەنیا ئەو کەسە دەتوانێ ڕێبەری کۆمەڵێك لە ئەستۆ بگرێ کە بە چاکی بتوانێ کەمو کوڕیو خەوشەکانی خۆیان پێ بناسێنێ، هەروەها بە دڵو بە گیان هەوڵ بدات کەمو کوڕیو خەوشەکانی خۆی نەهێڵێ. بۆیە قەت ڕیێ لە باکلانۆف نەدەگرت کە لاسایی ئەو بکاتەوە. چونکە سەردەمانێ ئەویش کە لە تەمەنی باکلانۆفدا بوو، بە هەمان شێوەی ئێستای باکلانۆف پەیڕەوی مامۆستاکانی خۆی دەکردو بەلایەوە خەڵکانێکی گەلێك پایەبەرزو بەرجەستە بوون. پاشان کە گەورەتر بوو بۆی دەرکەوت کە مامۆستاکانی بەو ڕادەیەش کە ئەو بیری لێ کردونەتەوە پایە بەرزو نموونەیی نەبوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆریان لێ ڕازی بوو. باکلانۆف تەنیا لاسایی هەڵسوکەوتو ڕواڵەتی لڤنسونی نەدەکردەوە. بەڵکو پەندو دەرسی لە سەرجەم ئەزموونەکانی، ڕەفتاری، شێوەی جەنگینو بەرنامەی کارکردنی وەردەگرت لڤنسون دەیزانی لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا ئەو شێوازانە دەگۆڕێتو دەپۆکێتەوە. بەڵام ئەزموونەکانی باکلانۆفو هینەکانی ئەوی تێکەڵ دەبنو دەوڵەمەند دەبنو بەیەك گرتنەوەی هەردوو شێوازەکە لڤنسونو باکلانۆڤ نوێ دینە مەیدانەوە. ئەمە ئەو شتە بوو کە بەلای لڤنسونەوە بوونی هەم گرنگو هەم پێویست بوو.
لە سەرەتای مانگی هەشتو لە ئاخرۆ ئۆخری شەوێکی بارانیدا تەتەرێکی سوارە لە ڕێوە گەیشتەجێ، نامەیەکی لەلای سوخوف- کوفتانی پیرەمێردەوە (سەرۆکی گشتی گروپی پارتیزانەکان) هێنابوو. سوخوف کوفتان لە نامەکەی دا نووسیبووی: ژاپۆنییەکان هەڵمەتیان بردۆتە سەر ئونوچینو، (شوێنی سەرەکی هێزی پارتیزانەکان)، شەڕێکی خوێناوی لە دەوروبەری ئیزڤستکوڤایا کراوەو سەدان پارتیزان تا دووایین هەناسە شەڕی قارەمانانەیان کردو بە خۆشی نۆ گوللەی بەرکەوتووەو لە یەکێك لە حەشارگە زستانیەکاندا -ڕاودا- خۆی پەنا داوەو مەترسی مردنی لێ دەکرێ.
گەرچی کابرای تەتەر یەکەم هەڵگری نامەکە بوو، کەچی هەواڵی شکستەکە زۆر بەخێرایی لەسەرانسەری ناوچەکاندا بڵاوبووەوە. هەر یەکێك لەو تەتەرانەی کە نامەکەی دەگەیاندە دەستی تەتەرێکی دی، وەکو ترسناك ترین هەواڵی سەرانسەری بزوتنەوە پارتیزانەکە باسی دەکرد. ترس تەنانەت ئەسپە توکنەکانیشیانی داگرتبوو. ئەم حەیوانانە بەدەمی داچەقاوو چوار ناڵەی شێتانەوە، لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی دی دەچوونو لە دوورەوە گەردەلوولی گڵو خاك لە ژێر سمیاندا بەئاسمانا پەرت دەبوو، بە توندی جادە گڵەکانیان دەبڕی.
وەختێ لڤنسون نامەکەی وەرگرت، نیو سەعات لە نیوە شەو تێپەڕیبوو. نیو سەعات پاشتر دەستەیەك سوارە بە فەرماندەیی متلیستای شوان، کریلوفکایان بەجێ هێشتو یەکسەر بە پەلە



کەوتنە سەر تولە ڕێگای پڕ پێچ و پەناکان و بە سیخوتەئالیندا هەڵەگەڕان تا هەواڵی خەتەرەکە بە بەشە سوپاییەکانی تری سوییاگینو ڕابگەیەنن.

پاش چوار ڕۆژی تەواو ئەوجار مەعلومات لە بەشە جۆراوجۆرەکانەوە کۆ کرایەوەو بۆ لڤنسون هات. هەر چەندە لڤنسون وڕو کاس بوو، پێ دەچوو پێشبینی شتی خراپ بکات، بەڵام لە ڕووا بە هەمان شێوەی هێمنی هەمیشەیی خۆی لەگەڵ پارتیزانەکاندا دەدوا. گاڵتەی بە باکلانۆف دەکرد، چونکە خۆی لە ماروسیای بێ سەروبەر هەڵدەسوو. کاتێ سیسکین لە ترسا دەلەرزی و لە پەنایەکەوە داوای لە لڤنسون کرد کە بۆ تەگبیرێك ناکا، لڤنسون بە ئەدەبەوە پەلەپیتکەیەکی بە نێوچاوانیدا کێشاو گوتی: خۆ ئەمە موشێن نییە.

ڕواڵەتی کارەکانی لڤنسون وای دەسەلماند کە لڤنسون ئاگای لە چۆنیەتی هەموو ڕووداوەکانەو دەزانێ چۆن کۆتاییان دێ، بۆیە هەموو پارتیزانەکان شتەکەیان بەلاوە خەتەرو نا ئاسایی نەبوو. چونکە بە خەیاڵی ئەوان لڤنسون دەمێکە نەخشەی دروست و بێ کەموکوڕی بۆ ڕزگارکردنیان کێشاوە. بەڵام ڕاستیەکەی ئەمجۆرە پلانە لە مێشکی لڤنسوندا دروست نەببوو، بەڵکو وەکو قوتابیەك کە کوتوپڕ خۆی لەبەردەم هاوکێشەیەکی ئاڵۆزدا ببینێتەوە بە تەواوی پەشۆکابوو. چاوەڕێ بوو لە شارەوە هەواڵی بۆ بێ. کانی کوڤ پارتیزان هەفتەیەك پێش ئەم هەواڵە ترسناکە چوو بوو بۆ شار.

کانیکۆف (5) ڕۆژ پاش هەواڵی شکستەکە، برسی و ماندوو لە شار گەڕایەوە، ڕدێنی زبرو تۆزاوی هەموو دەموچاوی داپۆشی بوو. وەك چۆن قژە سوورەکەی هیچ ئومێدێکی لێ نەدەکرا، بەو جۆرەش بێ موبالاتیەکەی هیچ موژدەیەکی خۆشی لێ بەدی نەدەکرا. بەدەم زەردەخەنەو بە لێهاتوویی وەرەق بازێکەوە دوو نامەی لەنێو جزمەکانییەوە دەرهێنا –گەرچی بە هیچ جۆرێ هەستی شادی لەلا نەبوو، کەچی نەیدەتوانی بێ پێکەنین قسان بکات– بەمجۆرە دەستی بە قسان کرد: لە شارا هەرا بوو، کریزلمان گیرا. ژاپۆنییەکان لە فلادیمێرا ئەلکساندەر فسکویەو لە ئولگادا هەڵیان داوە. هەموو خەڵکی ناوچەی ساچان ئاوارە بوون. شیرازەی کارەکان پچڕاوە! جگەرەت دەوێ؟ جگەرەیەکی قون سۆری دایە.

لڤنسون پشتی زەرفەکانی خوێندەوە، یەکێکیان خستە گیرفانییەوەو ئەوی تریانی هەڵپچڕی. ئەم نامەیە ئەو هەواڵانەی دەسەلماند کە کانینیکوف هێنابوونی. لڤنسون هەر چەندە بە ڕواڵەت شاد دیار بوو بەڵام بە ئاشکرا نا ئومێدی لە پشت پەردەی قسە ڕەسمیەکانییەوە بەدی دەکرا.

کانینیکوف بە هاوخەمییەوە پرسی: هەواڵێکی ناخۆش و خراپە، ها؟

–زۆریش نا. کێ ئەمەی نووسی– سیرخ؟

کانینیکوف سەری ئەرێی لەقاند.

لڤنسون وتی: پیاو شێوازەکەی دەناسێتەوە، لە نووسیندا قسەکانی بەش بەش دەکات. بەشێوەیەکی تانە ئامێزو بە نینۆك خەتێکی بەژێر (بەشی چوارەمدا: ئەرکەکانی ئێستا) کێشاو بەدەم بۆن کردنی جگەرەکەوە وتی: توتنێکی خراپە، وانییە؟ شخارتە.



متلیستای شوان قسەکەی پێ بڕی و وتی: ئیدی وەختی مردنتە. متلیستا وەکو هەمیشە هەڵچوو و بە مشت کێشای بەسەر مێزەکەدا، دەموچاوە مەیلەو کونجەکەی لە ئارەقدا بریقایەوەو لەسەری رۆیی: هاپۆ کوبراك! ئیدی دەبێ بەرۆکی ژنەکانت بەردەی. لە کاتێکدا پێڵاوە قایمەکانی بەسەر عەردیدا بکێش دەکردو بە قامچی کەوتبووە ویزەی چرپایەکان، کەوتە هاتوچۆ بە ژوورەکەداو لەسەری رۆیی: ئالێرەدا وەکو جوجەڵە سەرمان دەبڕن، تێ دەگەن. ئیدی وەختی مردنمانە.

ڤنسون گەرچی لە ناخەوە ئەم هەڵسو کەوتو رەفتارەی متلیستای بەدڵ بوو، چونکە متلیستا لەسەر پێ بوو، وەکو سەری قامچییەکەی سەختو ئامادەی هەڵسوڕان بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی گوت: زۆر سەختیش مەیگرە، هەندێك هێدی بە، متلیستا گەرم داهاتبوو، ئوقرەی نەبوو چاوە وریاکانی لە تینویەتیەکی لە دامرکاندنەوە نەهاتوودا دەسووتان.

متلیستا نەخشەیێ پاشەکشێکەی خستەڕوو، نەخشەکە بە ئاشکرا ئەوەی نیشاندەدا کە مێشکی پڕ خرۆشی متلیستا باکی لە درێژی رێگاوبان نییە. هەروەها نەخشەکەشی لە تاکتیکی سوپایی بەدەر نییە.

باکلانۆف لە کاتێکا ستایشی متلیستای دەکردو کەمێك بەغیلی بە بەرزە فڕی لاسارانەو سەربەخۆیی خەیاڵی ئەو دەبرد، وتی: دروستە سەری لەگەڵ لەشیدا دەگونجێ. ئەمە هێشتا هەر شوانە سادەکەی دوێنێیە، وایە. بەم جۆرە بڕوا دەبینین لە ماوەی یەکدو ساڵی تردا دەبێ بە فەرماندەی گشتمان.

ڤنسون قسەکانی باکلانۆڤ سەلماندو وتی: متلیستا؟ ئا، بەڵێ... بە قورسایی خۆی ئاڵتون دێنێ. ئەم جار رووی کردە متلیستاو گوتی: بەڵام دەبێ لە خۆی بایی نەبێو وریا بێ!

بە هەر حاڵ باسەکە گەرم بوو. لەم باسەدا هەر کەس خۆی لەوی دی بە زیرەکتر دەزانیو گوێی بۆ راوبۆچوونی ئەوانی دی نەدەگرت. ڤنسون کەڵکی لەم باسە وەرگرتو ئەم هەلەی قۆستەوەو نەخشەکەی خۆی کە سادەتر بوو، بە نێوی متلیستاوە خستەڕوو. ئەوەندە بە لێهاتوویی و وردبینییەوە ئەم کارەی ئەنجامدا، بە تێکڕای دەنگ ئەو نەخشە تازەیەی کە بەنێوی متلیستاوە خرابووە روو، پەسەند کرا.

ڤنسون لە وەڵامی نامەکانی شارو ستاشینیسکیدا نووسی کە لە ماوەی چەن رۆژێکدا هێزەکە بەرەو گوندی شیبیشیو سەرچاوەی "ئیروهدزا" دەبا هەروەها دەستووری دا کە خەستەخانەکە با جارێ لە شوێنی خۆی بمێنێ. ڤنسون شەوێ یەکجار درەنگ لە کار بووەوە, چراکەی روو لە کزی بوو. دەنگی سیسرك لە پشت سۆپاکەوەو پرخەپرخی ریابیتس لە زنجەکەی تەنیشتەوە دەهاتنە گوێ. ڤنسون نامەی ژنەکەی بیرکەوتەوە. تۆزێ نەوتی کردە چراکەوەو کەوتە خوێندنەوەی نامەکە. چ شتێکی تازەو خۆشی تێدا نەبوو. ژنەکەی هێشتا هەر بێکار بوو، هەرچی هەبوو فرۆشتبوونی، پەنای بردبووە بەر خاچی سووری کرێکارانو لەوێ دەژیا. مناڵەکانی تووشی لاوازیو کەم خوێنی ببوون. هەر دێرێکی نامەکە داستانێ بوو باسی خۆشەویستی بێ پایانی ئەوی دەگێڕایەوە. ڤنسون بە دەم بیرکردنەوەوە دەستی خستە سەر ردێنەکەیو کەوتە نووسینی وەڵامی نامەکە. لە هەوەڵەوە بێزار بوو لەوەی کە بیری خۆی بە



ژیانی تایبەتی خۆیەوە خەریك بكات. بەڵام وردە وردە جڵەوی بۆ هەستەكانی شل كرد. بە خەتە وردو لە خوێندنەوە نەهاتووەكەی دوو لاپەڕەی بە جۆرێ پڕ كردەوە كە كەس باوەڕی نەدەكرد ئەمە نامەی لڤنسون بێ. ئەمجا كەمێك كێشمانی خۆیداو چووە نێو حەوشەكە. ئەسپەكانی بە پرمە پرم لە نێو تەویلەكەدا دەلەوەڕان و سمكۆڵیان دەكرد. نۆبەچی تەویلەكە تفەنگەكەی لە شوێنێكدا هەڵواسی بوو و لە سوچێكا خەوی لێ كەوتبوو. لڤنسون لەبەر خۆیەوە وتی: ئەگەر هەموو نۆبەچییەكانمان بەمجۆرە خەویان لێ كەوتبێ چی روودەدا؟ پاش سووكە هەڵوەستەیەك، لە كاتێكدا بە زەحمەت خەوی لە چاوی خۆی دەتاراند، ئەسپەكەی خۆی لە تەویلەكە بردە دەرێ و زینی كرد. نۆبەچییەكە هێشتا لە خرپەی خەودابوو. لڤنسون لە ژێر لێوەوە وتی: هەی قەحپەداك! ئەمجا بە وریاییەوە كڵاوی نۆبەچییەكەی هەڵگرت و لە ژێر كڵاوەكاندا شاردییەوە. پاشان سواری ئەسپەكەی بوو و كەوتە رێ تا پۆستەی نۆبەچییانی شەو بەسەر بكاتەوە. كە لە دارستانەكە نزیك بووەوە بە دزە بەرەو تەویلەكان چووە پێشێ. لەگەڵ سەدای میل هێنانەوەی تفەنگێكدا، دەنگی نێری تێ خورینی نۆبەچییەك بەرز بووەوە: زەلام كێی؟

– خۆمانین،

– لڤنسون؟ بەم شەوە چ دەكەی لێرە؟

– ئەرێ شەو گەڕەكان لەم ناوە بوون؟

– چارەكێ لەمەوپێش یەكێكیان بە سواری لێرەوە رەت بوو.

– چ هەواڵێكی تازە نیە، وەعز هێدییە؟

– خراپ نییە، ئەرێ جگەرەت پێیە؟

لڤنسون كەمێ توتنی دایێ و ئەوجا لە بواری چۆمەكەوە بەرەو مەزراكان پەڕییەوە.

هەیڤۆك بەڵێڵی لە نێو پەڵە هەورێكەوە دەركەوت، تاریكی سەر بنچك و دەوەنە زەردباوەكانی رەواندەوە. لق و گەڵای دەوەنەكان لە ژێر قورسایی ئاونگدا داهاتبوونەوە. چۆمەكە بەشێویێكی بەردەڵانی و پەلدا دەڕۆیی. چەوو زیخی ئاوەڕۆی چۆمەكە هاژەی پتری بە شەپۆلەكان دەدا. لڤنسون كە تەماشای كرد (4) سواری بینی لەسەر گردێكی گەورەوە دادەگەڕان. لڤنسون گەڕایەوە نێو دەوەنەكان و بەبێ خشپە لەجێی خۆی وێستا. دەنگی سوارەكان بە تەواوی نزیك بووەوە. لڤنسون دەنگی دوانیانی ناسییەوە، دوو كەس لە شەوگەڕەكانی خۆی بوون. لڤنسون بەرەو جادەكە دایكێشاو دەنگیدان: ئەهای زەلامینە نەجوڵێن! ئەسپەكان حیلاندیان و رەوینەوە. یەكێ لە ئەسپەكان ئەسپەكەی لڤنسونی ناسییەوەو كوڕماندی. سوارەكەی بەرایی بە دەنگێكی نیمچە تورە دەنگیدا: هێی، ترساندمانت، هەی نامەرد!

لڤنسون لێیان نزیك بووەوەو پرسی: ئەوانە كێن لەگەڵتان؟

– شەوگەڕەكانی "ئوسكین"نن، ژاپۆنییەكان وان لە ماریانوفكا.

لڤنسون كەمێ خۆی لەسەر زینەكە بەرز كردەوەو وتی: ماریانۆفكا؟ ئەی ئوسكین و هێزەكانی لە كوێن؟



یەکێك لە شەوگەڕەکان وتی: لە کریلوفکان. لڤنسون کە ئەمەی ژنەوت، وەك بڵێی سەختی وشەکان باڵآیان تێکشکاند، کەمێ بە پێشا هات، ئەوجا شەوگەڕەکە لەسەری رۆیی: ناچار بووین پاشەکشێ بکەین، جەنگێکی یەکجار تووش بوو، سەنگەرەکانی خۆمان بۆ نەپارێزرا، ئێستاش هاتووین ئێوە ئاگادار بکەینەوە. بە تەماین سبەینێ بەرەو مەزرای کۆریاییەکان دایکێشین. هەموو ئەم هاوینە شتێکیان سووتاند، "4" کوژراومان هەیە، بریندار ئەوەندە زۆرە بە درێژایی هەموو ئەوەندە بریندارمان نەبووە.

لڤنسون پرسی: دەمێکە لە کریلۆفگاوە بەڕێ کەوتوون؟ بگەڕێنەوە منیش دەگەڵتان دێم.

لڤنسون کە گەڕایەوە لای هێزەکەی، دنیا تەواو رووناك بوو بووەوە، شەکەتو ماندوو سەری قورسو چاوانی خەواڵوو بوو.

لڤنسون دوای ئەوەی ئوسکینی بینی بوو، قەناعەتی کردبوو کە بڕیاری کشاندنەوەی هێزەکە، بڕیارێکی بەجێ بووە، چونکە رواڵەتی هێزەکە دروستی بۆچوونەکانی ئوسکینی دەسەلماند: هێزەکە وەکو لیژنە دارێك کە کەوتبێتە ژێر جەزرەبەی تەورەوە، لە پاڵ یەك ترازابوون، هەندێ کەس سەرپێچیان لە دەستووری فەرماندەکان دەکرد، دەستەیەکی مەستو سەرگەردانو بێ هیواش لە حەسارەکەدا هاتوچۆیان دەکرد. لڤنسون چاکی لە بیرە کە یەکێك لەوانە پیاوێکی قژ بژی ئاڵۆزکاوی رەقەڵەو لاوازبوو، لە نزیکی جادەکەدا لە مەیدانێك دانیشتبوو، چاوی بڕی بووە ئەرزەکەو لە نائومێدی دا تەقەی بە ئاسمانی تاریكو روونی بەیانیدا دەکرد.

لڤنسون هەرکە گەڕایەوە نامەکانی رەوانە کرد. بەڵام لەو کاتەدا هیچ قسەیەکی دەربارەی رەوو مەنزڵی هێزەکە لەگەڵ کەسدا نەکرد.





**دژمنان**

لڤنسون پاش شورا لە بیرچوونەوە نەهاتووەکە، یەکەم نامەی بۆ ستاشینسکی ناردبوو. لە نامەکەدا بە پەنامەیەکی نیگەرانی خۆی سەبارەت بە بارودۆخەکە دەربڕی بوو. داوای لە ستاشینسکی کردبوو کە وردە وردە خەستەخانەکە بپێچێتەوەو خۆیان لە بارو بنەی قورس بپارێزن. ستاشینسکی چەن جارێ نامەکەی خوێندەوە، کە چاوەکانی خێراتر دەتروکان، دەوروبەرەکەی ترسیان لێ دەنیشت‌و دەشڵەژان. دەتووت دڵە خورپەو ترسی لڤنسون دەرهەق بە ئایندە لە نێو زەرفە بۆرە چکۆلەکەی دەستی ستاشینسکییەوە هەڵدەچێ‌و ئەو هەستە ئارامەی کە لە قولایی هەر لاسکە گیایەك‌و لە گۆشەی روحی هەر ئینسانێکدا هەڵنیشتبوو دەتارێنێ وەرزی خۆش بە خێرایی تێدەپەڕی، هەتاو کەمتر دەردەکەوت. باران دەباری‌و درەختی ئەفرا بەر لە هەموو شتێك هەستی بە هەناسەی پایز دەکردو هێدی هێدی خۆی دەلاواندەوە. پیرە دارکونکەرەیەك بە ئارەزوویەکی تازەوە دەنووکی بە قەدی دارەکان تاقی دەکردەوە. پیکا شڵەژابوو و دەتگوت لەسەر ئاگر دانیشتووە، تووڕەو کەمدوو ببوو، هەر لە گەردی بەیانەوە تا بانگی شێوان بە نێو دارستانەکەدا دەسووڕایەوەو شەوانە شەکەت‌و ماندوو بۆ زنجەکە دەگەڕایەوە. هەر شتێکی دەکرد بۆی نەدەهات: کە جلەکانی دەدوورییەوە، دەزووەکەی گرێی تێ دەکەوت‌و دەپچڕا، کە (زارێن)ی دەکرد یەك لە دوای یەك دەدۆڕا. وەك ئاوێکی سوێر بە گەرویا بکەن، وای هەست دەکرد. لەم کاتەدا هەندێ لە هاوڕێ نەخۆشەکان. لە خەستەخانە دەردەچوون‌و دەگەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان. شتومەك‌و وردەواڵە سوپاییەکانی خۆیان کۆدەکردەوەو بە دڵتەنگی لە یەکتر جودا دەبوونەوە. پەرستارەکە بۆ دواین جار تەماشای برینەکانیانی دەکردو بەناوی دواماڵئاواییەوە یەك یەك ماچیانی دەکردو بەڕێی دەکردن. بەدەم رێ کردنەوە پێڵاوە کەتانە نوێیەکانیان رۆ دەچووە پوش‌و پەلاش، بەرە بەرە لە ناخی پڕ رەمزو شێدارو ساردی دارستانەکەدا ون دەبوون. کوڕە شەلەکە دوا کەس بوو کە پەرستارەکە بەڕێی کرد. پەرستارەکە ماچێکی لە لێوەکانی کردو پێی وت: بە دوعا برادەر بزانە خوا چەندی خۆش دەوێی، چ رۆژێکی خۆشی بۆت رەخساندووە، ئێمەی فەقیر لێرە فەرامۆش مەکە.... گەنجە شەلەکە بە پێکەنینێکی تەوس ئامێزەوە پرسی: کوا ئەو خوایەی تۆ لە کوێیە؟ خوای چی، کەی خوا هەیە! بەسەری هەردووکمان نە خوا هەیەو نە تەرەماش!....

کوڕە شەلەکە دەیویست بە هەمان شێوە شتێکی دی بڵێ، بەلام هیچی بۆ نەهات‌و ماسولکەکانی دەموچاوی گرژ بوون، بە خەمبارییەوە ئاوڕی دایەوەو دەستی هەڵبڕی، بەشەلەشەل خۆی گەیاندە جادەکەو ملی رێی گرت‌و، تەقوهۆڕی لەگەنە سوپاییەکەی لە دواییەوە بە شوومی دەنگی دەدایەوە.



هەموو برینداره‌کان لە نەخۆشخانەکە مەرەخەس کران، تەنیا فرولف و متچیك مانەوە. پیکاش لەویَ بوو، بەلاّم بیکا نەخۆش نەبوو، حەزیشی نەدەکرد ئەویَ بەجیَ بێلێ. متچیك لەسەر تەختەکە شانی دادابووە سەر سەرینەکەی خۆی و چەرچەفەکەی پێکا، ئەو بلووزەی لەبەرا بوو کە ڤاریا بۆی چنیبوو، ماوەیەك بوو سارغییەکەی سەری لیَ کردبووە، قژی هاتبووەوە، قژەکەی زەرد وەکو کارەبا بوو. جیَ زامی سەر لاجانگەکانی سیمای بە تەمەن تر دەنواند.

پەرستارەکە بە خەمبارییەوە پیّی وت: تۆش چاك دەبیەوەو بەم زوانە لێرە دەڕۆیی.

متچیك بە دوو دڵییەوە گوتی: بۆ کویَ دەڕۆم؟ متچیك لە قسەکەی خۆی سەرسام بوو. یەکەمجاری بوو کە بیری لەم مەسەلەیە دەکردوە، مەسەلەیەك کە هەستی پەرێشانی و ناڕەحەتی و نیگەرانی دەوروژاند. بە رووگرژییەوە گوتی: چ شوێنێك شك نابەم کە رووی تیَ بکەم.

ڤاریا بەسەرسامییەوە هاواری کرد: مەبەستت چیە؟ ئا هەڵبەتە دەچیتە کن لڤنسون، دەچیتە هێزەکەی ئەو! سواری دەزانی؟ هێزەکەی ئێمە، یانی بەشی سوارە زۆر باشە، تۆش بۆ خۆت فێری سواری دەبی. ئەمجا لە تەنیشتییەوەو لەسەر تەختەکە دانیشت و دەستی متچیکی خستە نێو دەستی خۆیەوە. متچیك چاوی داخست. ئیدی بیری ئەوەی کە درەنگ یا زوو دەبیَ ئێرە بەجیَ بهێڵیَ نەك هەر نەفرەت ئەنگێز بوو، بەڵکو ژەهر ئاسا تاڵیش بوو.

ڤاریا وەك ئەوەی بیرەکانی نێو مێشکی متچیکی خوێندبێتەوە، وتی: خەم مەخۆ، گەنجێکی وەکو تۆ ئەوەندە قۆزو ئەم هەموو شەرمنییە... تۆ پیاوێکی زۆر شەرمنی. ڤاریا چاوێکی بە دەوروبەری خۆیا گێڕاو نێو چاوانی متچیکی ماچ کرد. ماچەکە تام و بۆنی سۆزی خۆشەویستی دایکی لیَ دەهات. ئەوجا ڤاریا بە دڵسۆزییەوە لەسەری رۆیی: هێزەکەی شالدیبا زۆر جیاواز ترە لە هێزەکەی ئێمە. بەلاّم هێزی لڤنسون... ڤاریا بەردەوام ورتە ورتی لێوە دەهات و قسەکانی نەدەبڕایەوە: هێزەکەی شالدیبا زۆربەیان جووتیارن، بەلاّم هێزەکەی ئێمە هەموو کرێکاری مەعدەنی زوخاڵن، هەموو مرۆڤی چاکن. دڵنیام کە دەتوانی لەگەڵیاندا هەڵ بکەی. هەر کاتێکیش دەرفەتت بۆ رەخسا وەرە سەرم لیَ بدە.

متچیك وتی:" ئەی ماروسکا چی لیَ دەکەی؟

ڤاریا بە ئاسپایی پێکەنی و وتی: ماروسکا چی لیَ بکەم؟ بە دوایدا وتی: ئەی تۆچی لەو کیژە دەکەی، ئەو کچەی لە وێنەکەدا بوو؟

فرولوف لەو کاتەدا سەری وەرچەرخاند، ڤاریاش بە پەلە خۆی لە متچیك دوور خستەوە.

متچیك وتی: ئەو کچە دەڵێی؟ هەر لە بیرم بردووەتەوە، تەنانەت وێنەکەشیم دڕاند، ئەمجا بەپەلە وتی: ئەدی پارچەکانیت لە نێو ژوورەکەدا نەبینی؟

- زۆر چاکە، تۆش خەمی ماروسکات نەبیَ، ئەو لەگەڵ ئەم شتانەدا راهاتووەو خووی پیَ گرتووە. بە خۆیشی ئەم بابەتە کارانە دەکات. هەر وەختیَ ئارەزووت لیَ بوو وەرە کنم، هەمیشە پشت بە خۆت ببەستە مەچۆ ژێر باری هیچ کەسێکەوە، نابیَ لە هاوڕێیانی ئێمە بترسیت، چونکە تەنیا رواڵەتیان ترسناکە– هەڵبەت دەبیَ ئەوەش بڵێم ئەگەر لە بەریان دابێنی دەتخۆن. راستت دەویَ کەسیان لەو زەلامە ترسناکانە نین. هەر بە رواڵەت وا



نیشان دەدەن. تەنیا کارێ کە دەبێ تۆ بیکەی ئەوەیە کە تۆش چاوێکیان لێ سوور بکەیتەوەو تەواو.

– باشە تۆ چاویان لێ سوور دەکەیتەوە؟

ڤاریا کەمێك تێ فکری و وتی: ئاخر من ژنم، بەبێ ئەوەش دەتوانم ژیان بگوەزرێنم–عەشقبازی شێوازی منە. بەلام بۆ پیاوێك هەر ئەو رێگەیە هەیە کە من وتم. من تەنیا خەمی ئەوەمە کە تۆ هێشتا زۆر سادەی.

ڤاریا دیسان بەسەر متچیکدا دانەوییەوەو بە گوێدا چرپاند: رەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێ کە خاتری تۆم دەوێ –دەنا کێ دەزانێ...

متچیك هەردوو دەستی خستبووە ژێر سەری‌و چاوی بڕی بووە ئاسمان‌و تێ دەفکری: راست دەکا، من چ شەهامەت‌و زاتێکم نیە، بەلام ئاخۆ ناتوانم بەهەر جۆرێ بووە پەیدای بکەم؟ دەتوانم.. بە هەر جۆرێ بووە. وەك چۆن هەر کەسێك دەتوانێ... متچیك ئێستا هەستی بە هیچ جۆرە پەشێوی‌و تەنیاییەك نەدەکرد. هەموو شتێکی بەڕێکی‌و دروستی دەبینی. برینەکانی بە خێرایی سارێژ دەبوونەوە, گوڕو هێزی تێ دەگەڕایەوە دەیویست باوەڕ بەخۆی بێنێ کە سەرچاوەی ئەم لەش سووکی‌و هێز تێ گەرانەوەیەی، ڤاریای چاو بە خومارە، ڤاریای رووخۆش و بە دەموودوو لەبز شیرینە. متچیك وەك چۆن مندالێك دایکی خۆی خۆش دەوێ بەو جۆرە هەستی بە قەرزارباری سۆزو خۆشەویستی ڤاریا دەکرد.

بە ورەیەکی ئەوتۆوە کە تا ئێستا بە خۆیەوە نەبینی بوو بڕیاری دا: وێڕای ئەمانەش بۆ دەبێ نائومێد بم, بەڕاستی وای هاتە بەر چاو کە چ هۆیەك بۆ پەرێشانی و پەشێوی نیە, پێویستە خۆم بە هاوشانی ئەوان بزانم, نابێ مل کەچیان بم: بەڕاستی ڤاریا حەقیەتی, پیاوان لە ژنان جیاوازن, پێویستە خۆم دروست بکەم و هەر دەشی کەم. کە بگەڕێمەوە بۆ شار ئیدی هەموو شتی گۆڕاوەو کەس نامناسێتەوە دەبم بە زەلامێکی دی. بیر بەرەو شوێنی دووری دەبرد, – بۆ ئەو رۆژە گەش‌و بە شکۆیانەی کە وەکو پەڵە هەوری جۆراوجۆر بەسەر ئاسمانی دارستانە سەوزەکەوە وردە وردە دەرەوییەوەو لە چاو گوم دەبوو. خۆی‌و ڤاریای لە نێو ڤیتارێکی پڕ سەروسەودادا دەبینی کە لە پاڵ پەنجەرەیەکا دانیشتوون‌و بەرەو شار دەگەڕێنەوە.

هەوری سووباو وەکو ئەو هەورەی سەر زنجیرە شاخێکی سەر بە تەمی ئەو ناوە، بەسەر سەریانەوە دەکشا، متچیك بە چاوی خەیاڵ دەیبینی کە بە ڤاریاوە قەرساوەو بە دڵسۆزی لە پاڵ یەکدیدا دانیشتوون‌و ڤاریا ئاوازی عاشقانەی بۆ دەچڕی‌و ئەم دەست بەسەریان دێنێ‌و قەڤ پرچە ئاڵتوونیەکەی دەلاوێنێ. چونکە هەموو خەیاڵەکانی زیندەخەو بوون، بۆیە ڤاریای خەیاڵی پتر لە پیاوێکی کەتەی چوارشانە دەچوو کە لە تونێلی ژمارەیەکدا عارەبانەی داژۆت. مارۆزکا پاش چەند رۆژێك دووەم نامەی لڤنسونی گەیاندە خەستەخانە، دەتووت رەشەبایەو ترسی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، بەڕاکردن‌و هات‌و هاوارەوە لە بێشەکەوە دەرچوو، ئەسپەکەی هێنابووە گیرو گاز، ئەسپەکە هەستا بووە سەر پاشوو، ماروسکا شێت ئاسا



هاواری دەکرد، ئەو هەموو هاتو هاوارەی بۆ دامرکاندنەوەی وزەی هەڵچوی خۆی و... لە پێناوی عەیش و نۆشدا دەکرد.
پێکا لە ترسا دەلەرزی، بە هێمنی و سادەیی پرسی: ئاخر ئیبلیس، ئەوە شێت بوویت؟ "ئیشارەتی بۆ لای فرولوف کردو لەسەری رۆیی: ئەو پیاوە لەسەرە مەرگایەو تۆش بەم جۆرە هاوار دەکەی..." ماروسکا سڵاوی لێکرد: ئەهای باوکە سرافیم! ئەو بچکوڵە شلکە قژ لوولەم چوونە؟
پیکا بە پەستیەوە وەڵامی دایەوە: یەکەم من باوکی تۆ نیم، دووەم نێوم فیودورە نەك سرافیم! پیکا لەم رۆژانەدا بە تەواوی دڵی ناسك بوو بوو، زوو تووڕە دەبوو، وەختێ کە کوت و پڕ لە ترساندا راپەڕی، دیمەنێکی سەیرو گوناحی هەبوو.
– راستە فدوسی، نازمان بەسەرا مەکە... سڵاو، سڵاوی گەرم لە هاوسەرەکەم بە شێوەیەکی رەسمیانە کڕنۆشی بۆ ڤاریا بردو کڵاوەکەی خۆی داکەندو کردیە سەری پیکا!
– زۆر چاکە فیدوسی، زۆرت لێ دێ، بەڵام تۆزێ پانتۆڵەکەت هەڵکێشە، ئەڵێی هی داهۆڵەکانەو هاتۆتە خوارەوە– لەوانەیە بنیادەم لێی تێکچێ و وا بزانێ مرۆڤ نیت!.
ستاشینسکی بەدەم هەڵپچڕینی نامەکەوە پرسی: کەواتە دەبێ خێرا ئێرە چۆڵ بکەین؟ کارچنکو بێ ئەوەی گوێ بە تووڕە بوونی ستاشینسکی بدات، هەر سەرەتاتکێی بوو کە لە پشتەوە نامەکە بخوێنێتەوە، ستاشینسکی نامەکەی دوور خستەوەو بە ماروسکای وت: پاشان وەرە بۆ وەڵامەکەی.
ڤاریا لەبەر دەم ماروسکادا وێستاو بە قامکەکانی کەوتە یاری کردن بە بەرهەڵبێنەکەی بۆ یەکەم جار بە جۆرێکی سەیر لە هاتنەوەی شووەکەی نارەحەت بوو، بە ساردییەوە پرسی: ئەم چەند وەختە تەشریفت لە کوێ بووی؟ ماروسکا کە هەستی دەکرد ڤاریا زۆر لەوەوە دوورە بە تەوسەوە وەڵامی دایەوە: بیرت دەکردم، نا؟ زۆر چاکە، قەیدی نییە دەتوانیت تۆڵەی هەمووی بکەیتەوە هەر ئێستا پێکەوە دەچینە نێو دارستانەکە، ماروسکا سووکە هەڵوەستەیەکی کردو قسەیەکی بە تویکڵی کرد... دەچین خاکی دنیا بەسەری خۆدا دەکەین.
ڤاریا کە هەموو هزرو هۆشی لای متچیك بوو، بێ ئەوەی سەیری ماروسکا بکات، بە وشکی و مەیلەو تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە: تینوو هەر ئاوی لە بیرە. ماروسکا کە هێشتا چاوەڕێی وەڵامی ڤاریا بوو، بە دەم قامچی بادانەوە پرسی: ئەدی تۆ؟
– بۆ من شتێکی تازە نییە، نەخێر شتێکی تازە نییە، دەڵێی یەکدی ناناسین! ماروسکا بە دوو دڵییەوەو بێ ئەوەی لە جێی خۆی بجوڵێ گوتی!، هەنووکە دێی یان نا؟
ڤاریا داوێنی بەرهەڵبێنەکەی بەردا، پرچە هۆنراوەکەی هەڵدایە پشتەوەو بە قەراخ جادەکەدا کەوتە رێ. ڤاریا وا خۆی دەنواند کە بێ خەمە، بەڵام لە جەنگێکی سەختا بوو دژ بەو هێزە نادیارەی ناچاری دەکرد ئاوڕ بداتەوەو سەیری متچیك بکات، ڤاریا دەیزانی متچیك بە



**چاوانی خەمبارو پەشێوەوە بەڕێی دەکات و هەرگیز پەی بەوە نابات کە ناچارە ئەم ئەرکە قورس و تاقەت بەرە ئەنجام بدات.**

**ڤاریا لەوە دەترسا کە ماروسکا لە پشتەوە پەلاماری بدات، بەڵام مارۆزکا لێی نزیک نەکەوتەوەو ماوەیەك بەو چەشنە دوور لە یەکدی ڕێیان کرد. کەسیان ورتەیان نەکرد، ڤاریا سەبری سوا، وێستاو بەسەرسامی بەرەو لای گەڕایەوە. ماروسکا نزیکتر بووەوە، بەڵام چ بایەخێکی بە ڤاریا نەدا. ماروسکا لە پڕو بە دوو دڵی و تووڕەییەوە گوتی: تۆ بە کەڵکی چی دێی قەحپەی بەرەڵڵا! عاشق بوویت؟**

**ڤاریا سەری هەڵبڕی، بێ حەیایانە چاوانی بڕیە چاوی ماروسکاو وەڵامی دایەوە: ئەوە پێوەندی بە تۆوە نییە، چ پێوەندیەکی بە تۆوەیە؟**

**ماروسکا بە تەواوی ئاگادار بوو کە ڤاریا بە دزییەوە دەست لەگەڵ پیاوانی دیکەدا تێکەڵ دەکات. وەکو چۆن پێش ئەوەی زەماوەندیش بکەن هەروا بوو. ڕاستت گەرەکە ماروسکا لە یەکەم شەوی زەماوەندەکەیانەوە بەمەی زانی بوو. ئەوە شەوە لە ژوورێکا بوون کە کۆمەڵێك لە پاڵ ئەوانەوە خەوتبوون، کە بەیانی چاوی کردەوە سەیری کرد ژنە شەرعیەکەی لە باخەڵی براسیمی مێ بازدایە، براسیم کرێکاری تونێلی ژمارە چوار، بەڵام ماروسکا ئەو زەمانە هێشتا شارەزای ژیانی خێزانداری نەبوو، تەنانەت ماوەیەك لەوە پاشیش هەر وابوو، زۆر لە ئێستای جیاواز بوو. ماروسکا هەرگیز خۆی بە مێردێك حسێب نەدەکرد، بەڵام هەنووکە ئیدی بەلایەوە ئەستەم بوو کە ژنەکەی گەنجێکی لە بابەتی متچیکی خۆش بوێو لەگەڵیا بخەفێ.**

**ماروسکا لە کاتێکا بە پێکەنینێکی ژەهراوی تانە ئامێزەوە خۆی لەبەر نیگاکانی ڤاریادا ڕادەگرت و هەوڵی دەدا نیگەرانی و ناڕەحەتی خۆی وەشێرێ، بە ئەدەبەوە پرسی: ئاخر منیش دەمەوێ بزانم ئەمە کێیە؟ هەمان ناسکە کوڕ نییە!**

- **گریمان ئەوە؟ ماروسکا وەکو ئەوەی تەئیدی قسەکەی ڤاریا بکا لەسەری ڕۆیی: پیرۆزە، ڕێك و پێك و قۆزیشە، بەڵام دەبێ دەستەسرێکی بۆ دروست بکەیت تا دفنە چڵمنەکەی بسڕێ.**

**ڤاریا کە خەریك بوو لە ڕقا شەقی دەبرد، ڕووی تێکردو لەسەر ڕۆیی: چ قەیدیە، دەستەسرێشی بۆ دروست دەکەم، گوێت لێیە؟ بە خۆم لووتی دەسڕم، پێویست ناکا پیاوەتی خۆت بەسەرمندا بنوێنی! پیاوێ نەتوانێ بە سێ ساڵان منداڵێك دروست بکات فایدەی چییە؟ هەر دەمیت، بە ڕاستی قارەمانیت! ماروسکا قسەکەی بڕی و گوتی: جا چاڵە کۆنێ بە هەموو هێزەکە هەر خەریکی بن چۆن بە من پڕ دەکرێتەوە! هاوار مەکە... ئەگینا....**

**ڤاریا بە گڕیا چووەو گوتی: ئەگینا چی؟ ڕەنگە بتەوێ لێم بدەی، فەرموو! زۆر حەز دەکەم بزانم کە ....!**

**ماروسکا وەك بڵێی ئیلهامێکی چاوەڕوان نەکراوی بۆ هات، بە سەرسامی کەوتە قامچی بادان، لەکاتێکا هێشتا دوو دڵ بوو لەوەی کە لێدانی کارێکی دروست نییە، گوتی: نا، هەر**



چەند موستەحەقی لێدانی، بەڵام لێت نادەم، خەیاڵت خاوە کە کارێکی وا بکەی دەست لە ژنێك هەڵبێنمەوە. چەشنە ئاوازێکی پەنهان لە پشت پەردەی دەنگی ماروسکاوە هەست پێ دەکرا، کە ڤاریا هەرگیز لەمەوبەر هەستی پێ نەکرد بوو: زۆرچاکە تۆش بڕۆ بە دووی بەختی خۆتا، بەڵکو ڕۆژێ لە ڕۆژان ببی بە ژنێکی بەختەوەر، ئەوجا لەسەر پاژنەکانی وەرچەرخاو لە حاڵێکا گوڵو دەوەنی دارستانەکەی بەر قامچیان دەدا، بەرەو زنجەکە ڕۆیی.

ڤاریا سۆزی هاتە کوڵو بە بەزەییەوە هاواری کرد: هێی ڤانیا، بوەستە.

ماروسکا بە تەوسەوە، وەڵامی دایەوە: من پاشماوەی نەجیب زادان ناخۆم، ئەمە هەر لە شانو شەوکەتی ئەوان دێ.

ڤاریا دوو دڵ بوو لەوەی بە دووی ماروسکادا غار بدات یان نا، بەڵام ئەنجام بڕیاری نەڕۆیشتنیداو ماوەیەك چاوەڕێی کرد تا ماروسکا لە پێچی جادەکە ڕەت بوو، پاشان لێوە وشکەکانی بە زمان تەڕکردو هێدی هێدی کەوتە ڕێ.

متچیك کە بینی ماروسکا بە دەست ڕاوەشانو هەنگاوی قورسەوە لە دارستانەکە گەڕایەوە، بۆی دەرکەوت کە لەگەڵ ڤاریادا ڕێك نەکەوتووە چونکە متچیك مایەی ئەمە بوو، جۆشو خرۆشێکی ترسێنەرو هەستی خەتابارییەکی لە وەسف نەهاتوو لە دەروونیا جۆشی سەندو تەواو ترسی لەوە پەیدا کرد کە ڕوو بە ڕووی سیمای پیا کوژانەی ماروسکا ببێتەوە.

میشکای توکن لە دەوروبەری تەختەکەی متچیکدا دەلەوەڕی. گەرچی هەستێکی ئاڵۆزو نادیار مارۆزکای بەرەو لای متچیك بکێش دەکرد، بەڵام پێ دەچوو بۆ لای ئەسپەکەی بڕوات نەك متچیك. چونکە ئەو ماروسکایەی کە سەراپای غرووری بێ ئەندازە بوو، پێی نەنگ بوو تەنانەت لە دڵی خۆیشیا دان بەم بەزینەدا بنێ. تا ماروسکا نزیکتر دەبۆوە، هەستی تاوانباری لەلای متچیك قووڵو قوڵترو گیانی خاوو خاوتر دەبووەوە، بە جۆرێ چاوە بچووكو ترساوەکانی بڕیە چاوانی ماروسکا، کە توانای گواستنەوەیانی نەبوو.

ماروسکا هەوساری ئەسپەکەی گرت، ئەسپەکە دەتگوت بە هەموو شتێکی زانیوە، بۆیە بەسەر، ماروسکای بۆ لای متچیك وەرچەرخاند، تا سیمای تووڕەو ڕەشو زەبری ماروسکا بە جارێ متچیکی نەخۆش لە پەلو پۆ بخات. متچیك لەم ساتە کورتەدا ئەوەندە ترسابوو تەنانەت نەیتوانی تاقە وشەیەك لەوهەموو قسەیەی هاتبووە سەر زاری بدرکێنێ.

ماروسکا بە تووڕەییەوە تفێکی کردە سەر زەوی بۆ خۆت ڕابوێرە لە پشتی جەبهەوە! متچیك چ ئیعتیرازێکی نەکرد، ماروسکا لەسەری ڕۆیی: جەنابی بلوزی چەرمینی لەبەر کردووە.

ئەگەر چی ماروسکا بە خۆیشی هۆی ڕاستەقینەی تووڕەییەکەی نەدەزانیو دەترسا کە متچیك وا بزانێ حەسوودی پێ دەبات، وێڕای ئەمەش ئاگری قین لە دەروونیا هەر کڵپەی سەندو زۆر بێ حەیایانە تێر جنێوی کرد.

متچیك دەهری بوو، و پرسی: بۆ جنێو دەدەی! و هەر کە ماروسکا لە جنێودان کەوت، متچیك بە شێوەیەکی لە وەسف نەهاتوو هێدی بۆوەو گوتی: لاقیشم لە پشتی جەبهەوە شکا! بەدەم لەرزینەوە ئەو وشانەی بە غروورو شانازی سەربازێکی زامدارەوە درکاند. لەو ساتەدا



دەتگوت هەر بە راستی باوەڕی وایە کە لاقەکانی لە شەڕدا لە دەست داوەو ئەوەی هەنووکە بلوزی چەرمی لە بەرەو لەسەر تەختەکە دانیشتووە، ماروسکایە نەك ئەو، ئەمجا بە رەنگی پەڕیوەوە لەسەری رۆیی: ئێمە زۆر شتمان دەربارەی ئەو قارەمانانەی ریزی پێشەوەی جەبهە بیستووە، بە رەنگی پەڕیوەوە گوتی: ئەگەر قەرزار بارت نەبوایەم، حاڵیم دەکردیت... هەر چەند بە داخەوەم کە....

ماروسکا لە هەژمەتدا سمکۆڵی دەکردو دەیوست وا بنوێنێ کە گوێی لە قسەکانی متچیك نییە، تێی خوڕی: ئەهای، لە بیرت چۆوە! لە بیرت چوو کە چۆن لە نێو ئاگرا دەرم هێنایت... رزگارکردنی کەسانی وەکو تۆ هەمیشە مایەی هەندێ گرفتاریو سەریەشەیە بۆ ئێمە! ئەمەی بە جۆرێ دەوت، وەك بڵێی کارو پیشەی هەر ئەوە بووە خەڵکی چەشنی شا بەڕوو لە نێو ئاگردا دەربێنێ، دووپاتی کردەوە: بەڵێ مایەی هەندێ سەریەشە! ئەوجا بە پەستیەوە کێشای بە پشتی ملی خۆیداو لە سەری رۆیی: تۆ بوویتە مایەی ئەوەی کە ئەستۆم بداتە ژان!

ستاشینسکی و کارچنکو بەغار لە زنجەکە هاتنە دەرێو فرولوف بە سەرسامی و نارەزاییەوە سەری بۆ لایان وەرگێڕا.

ستاشینسکی بە دەم چاو تروکاندنەوە پرسی: ئەوە چیە بۆ هاوار دەکەن؟ ماروسکا لەوەڵامی ئەم پرسیارەی متچیکدا: ئەوە عەقڵت لە کوێیە؟ لە حاڵێکا بە سەرو بە دەست حەرەکەی لاسارانەو ئیشارەتی ناشیرینو کرێتی دەکرد، شێت ئاسا هاواری کرد: ئەقڵم لە کوێیە لێرەیە، لێرەیە!.

وەختێ ڤاریاو پیکا لەدارستانەکەوە بە دادو فریاددەوە بۆ لای ئەمان غاریان دەدا، ماروسکا خۆی هەڵدایە سەر پشتی ئەسپەکەو بە قامچی تێی بەربوو -کارێ کە تەنیا لە رۆژانی توندترین رقا ئەنجامی دەدا- میشکا هەستایە سەر هەردوو پاشوو بە جۆرێ دەرپەڕی، دەتگوت ئاوی کوڵە کوڵیان پێدا رشتووە.

ستاشینسکی بە هەڵچوونەوە هاواری کرد: ماروسکا، سەبرکە، وەڵامی نامەکە بەرەوە بەلام ئیدی ماروسکا لە چاو ون بوو، تەنیا دەنگی چوار ناڵەی شێت ئاسای میشکا لە نێو دارستانەکەوە دەبیستراو ئەویش هێندە درێژەی نەکێشاو بڕایەوە.





## یەکەمین پاشەکشێ

جادە دوورو درێـژو بـێ کۆتاییەکـە بـە خێرایـی لـە دوایـەوە جـێ دەمـا، لقـی شـۆڕەو بـووی درەختانی ئەم بەرو ئەو بەری جادەکە کە سەریان هێنابووە ناوەندی جادەکە،دەمووچاویان ئازار دەدا، ماروسکا کە لە نێو گڕی رق‌و کینەو رەنجاویدا دەسووتا، بەردەوام دەی ژەنییە ئەسپە شێت ئاساکەیەوە، هەندێ لەو قسە ساردو ناشیرینانەی کە لەگەڵ متچیکدا بە یەکیان گوتبوو، و هەر یەکەیان لەوی تریان تاڵترو بە سوێ تر بوو، میشکی گڕ گرتوویـان دەهەژانـد. هێشتاش هەستی دەکرد رق‌و نەفرەتی خۆی وەکو پێویست نەڕشتووە. بۆ وێنە دەیتوانی ئەوە بە چاوی متچیکدا بداتەوە کە چۆن بەترسێکی شێتانەوە دەستە رەق بووەکانی لەم ئالانـد بـوو و، چۆن لـە پێنـاوی ئـەم ژیانـە نـزمو سووکەیدا ترسێکی تـەواو نیشتبووە سـەر چاوانی. دەیتوانی زۆر بە توندی لەسەر عەشقبازی سەرزەنشتی بکا، عەشقبازی لەگـەڵ ئـەو کیژە پرچ جوانەدا کە رەنگە هەنووکەش وێنەکەی لە گیرفانی چاکەتەکەیدا بێ‌و لەسـەر دڵـی هەڵی گرتبێ. دەیتوانی نزمترین سیفەت بداتە پاڵ ئەو کیژە خنە. لەم کاتـەدا هەمـدیس بیری کەوتەوە کە متچیك هەنووکە دەست لەگەڵ ژنەکەی ئەمەدا تێکەڵ دەکات‌و گوێ بە رەنجانی ئەو کیژە نادات. سەرەڕای هەستی پڕ کینەی دیسان هەستی دەکرد سووکایەتیەکی ئـەوتۆی پێکراوە کە تۆڵەی ناکرێتەوە.

میشکا لە بێ ئینسـاف خاوەنەکەی تەنگـەتاو بوو بـوو، تـەنیا ئـەو کاتـە ریتمـی خێراییەکـەی دەپاراسـت کـە لغاوەکـە پـتر لا لغـاوە بریندارەکـەی زامـدار دەکـرد، وەخـتێ هەوسـارەکە شـل دەبوو، هەنگاوەکانی خاو دەکردەوەو هەستی دەکرد کە ئیدی خاوەنەکەی فشاری لێ ناکات. میشکا وەکو مرۆڤێك چۆن ئازارێکی توندی پـێ گـەیی بـێ‌و بـە تـەنگ حـەیای خۆیـەوە بـێ، هەوڵی دەدا بە پەلە هەنگاو بنێ، تەنانەت ئاگای لەو قەلە رەشانەش بوو کە زۆرترو بـێ هـۆتر لە جاران بەم دەمەو ئێوارەیە دەیان قراند.

دارسـتانەکە لـە بێشـەیەکدا دەبڕایـەوە کـە درەخـتی غـان لـە دەوروبـەریا رووا بـوو، تیشـکی کزەتاو لە نێو لق‌وپۆپی درەختەکانەوە سیمای ماروسکای روناك دەکردەوە، لـەم بێشـەیەدا هەموو شتێك ناسك‌و جوان‌و مایەی گورج‌و گۆلی بوو، لێرەدا چ هـەواڵێك لـە هـەراو هوریـای گەوجانەی ئینسان نەبوو، ماروسکا ئارامی گرت ئێستا ئەو جنێوانەی لـە مێشـکی خۆیـدا ئامادەی کردبوو کە بە متچیکی بدات، ئەو توندی‌و گیانی تۆڵە ئەستێنییەی جارانی نەمابوو و، بەلایەوە بوو بوو بە شتی بێ تام‌و بێ مانا. ئێستا ژێوان بـوو لـەو گێرمـە وکێشـەو دەنگە دەنگـەی لەگـەڵ متچیکدا نایـەوە. ئـەو متچیکەی کـە نـەیتوانی تـا کۆتـایی بـەرگری لـە خـۆی بکات، ئێستا هەستی دەکرد کە زیاد لە پێویست بیری لە ڤاریا کردۆتەوە، دڵنیا بوو کە ئیدی



هەرگیز ناگەڕێتەوە لای. تا ئێستا ڤاریا لە هەموو کەس پتر لێوەی نزیك بوو، ڕۆژگاریٚ ئەویش وەکو هەر ئینسانێك دەژیاو هەموو شتێکی بەلاوە ساف و سادە بوو، لەبەر ئەو هۆیانە ئیدی لێکدی دابڕان، وەك بڵێی ئەم ژیانە نەمرو لە پڕ کۆتایی هات. ئەوجا نۆرەی ئەوەیە دەست بە ژیانێکی نویٚ بکات.

هەتاو لە ژێر قەراخی کلاوەکەیەوە لە چاوی دەدا، هەتاو چەشنی چاویٚکی ساردو ئەبڵەق رووی کردبووە کێو، بەلاٚم مەزراکان خەمبارو سست بوون، ماروسکا چاویٚکی بەو مەڵۆ جۆیانەدا گێرا کە هێشتا لە نێو کێڵگە نیوە دوراوەکاندا مابووە، پاشان تەماشایەکی ئەو بەر هەڵبێنە ژنانەی کرد کە بەسەر گیاکانەوە مابۆوە، ئەمجا چاویٚکی بەو کەردووەدا گێرا کە بەسەر جۆگەلەکەی کەناری کێڵگەکەدا هەڵواسرابوو، قەلەڕەشێك لەسەر شارا جۆیەك کە لەلایەکەوە سکی دابوو، وەکو هەتیو بە تەنیٚ و بە خەمبارییەوە هەڵنشتبوو، چ شتێك لەمانە شوێنەوارو نیشانەیەکیان لە مێشکی ماروسکادا بەجیٚ نەهێشت. بیرەوەری و یادگاری کۆن باڵیان بەسەر مێشکیا کێشایەوە، ئەوانەش شتێکی تازەو کەیف بەخشیان تێدا نەبوو، بەڵکو بارێکی گران و بێزارکەر بوون و باری شانیان قورس دەکرد. هەستی بێکەسی و تەنیایی ئازاری دەدا، دەتگووت بەسەر دەشتێکی بەرین و بێدەنگ و خەمبارا دەفڕیٚ.

لە پڕ دەنگی هێواشی سمی ئەسپێك لە پشتی گردەکانەوە هاتو ماروسکای هێنایەوە سەرخۆ، سەری هەڵبڕی و چاوی بە هەیکەلی وردیلەی دەورێیەکی سوارە کەوت کە پشتێنێکی توندی لە پشت بەستبوو. پێك گەیشتنەکەیان هێندە کوت و پڕو چاوەڕوان نەکراو بوو، کە ئەسپی دەورێکە هەستایە سەر هەردوو پاشوو.

دەورێکە لە کاتێکا خەریك بوو، کلاوە پەڕیوەکەی خۆی دەگرتەوە گوتی: ئەوە تۆی نەحلەتی! تۆی ماروسکا، خێرا بگەڕێوە، ماتەڵ مەبە، بە پەلە بگەڕێوە بۆ ماڵیٚ، تۆ نازانیت لەویٚ چ حەشرێکە! وەڵلا من سەرم لە کارەکەیان دەرنەکرد!

– چۆن، چما چی بووە؟
– هەندیٚ لەوانەی کە لە دەست ژاپۆنییەکان هەلاٚتبوون، شتی سەیریان دەگێڕایەوە. بە کورتی لەوانەیە هەر وەختیٚ بیانەویٚ، بگەنە ئێرە. هەموو جوتیاران کێڵگەکانیان بەجیٚ هێشتووەو هەلاٚتوون، ژنان دەگریان گالیسکەکانیان کە پڕ بە شاریٚ بوون، بە بارەوە بەرەو قەیاغەکە دەچوون، چ وەزع و حاڵیٚ! چ دیمەنێك! شتێکی نەمابوو کە قەیاغەوانەکە بکوژن، دڵنیام هێشتا نەیتوانیوە هەموویان بپەڕێنێتەوە ئەوبەر. نا دڵنیام هێشتا نەیپەڕاندو نەتەوە. گریشکا بە درێژایی دە فەرسەخ ئەو دەوروبەرە گەڕا. بەلاٚم چ شوێنەوارێکی ئەوانی بەدی نەکرد –هیچ شوێنەوارێك. هەموو ئەمانە قسەی بیٚ سەروبەرە، حەرامزادانە درۆ دەکەن! پێویستە لەسەر ئەم درۆیانەیان بکوژرێن، بەلاٚم حەیفە فیشەکیان لیٚ خەسار بکریٚ– بەڵیٚ بە راستی حەیفە فیشەك...

دەورێکە بە شپرزەییەوە تفێکی رۆ کردە سەر عاردی. قامچییەکەی بادا، کلاوەکەی لەسەری داکەندو هەمدیس کردیەوە سەری و پاشان بە شانازی و خۆ نواندنەوە، بە جۆریٚ میلی



تفەنگەکەی هێناو برد وەك ئەوەی بیەوێ بڵێ وێڕای هەموو ئەمانە هاوڕێ سەیری من بکە! چۆن هەموو کیژان بۆم دەمرن.

ماروسکا بیری کەوتەوە کە هەمان زەلا م، دوو مانگان لەوە پێش پەرداخێکی فافۆنی لێ دزی و پاشان سوێندی بۆ خوارد کە لە ڕۆژانی جەبهەی ئەڵمانیاوە هەی بووە.

گەرچی ئەمەی بەلاوە ناخۆش نەبوو، بەڵام کوتوپڕ بیری گەڕاندەوە بۆ رابردوو، "تەنانەت ئاگای لە قسەکانی دەورێکە نەبوو و، لە دەریای بیری خۆیدا مەلەی دەکرد" گەڕاندیەوە بۆ شێوەی ژیانی ئاشنای ناو هێزەکە... گەڕانەوە لە کانونیکف.پاشەکشەی ئوسوکین! ئەو پڕوپاگەندانەی دەربارەی –ئەو هێزە دەکران کە ئەو تێیدا ژیا بوو– لەپڕ تەوژمی شوتی خەتەر، سەراپای داگیرکردو تاڵی ڕۆژگاری رابردووی راماڵی و لەگەڵ خۆیدا بردی.

قسەی دەورێکەی بڕی و پرسی: فیرارەکان؟ ئەوە چ دەڵێی؟

دەورێکە بەسەرسامی برۆکانی بەرز کردەوەو راوەستا، کڵاوەکەی کە تازە لەسەری داکەندبوو، و دەیویست بیکاتەوە سەری، لە حەوادا مایەوە.

ماروسکا بەدەم گازاندەوە گوتی جاشەکەر، هەموو هۆش و بیرت لای ئەمەیە کە خۆت قۆز بنوێنی، بە رقەوە لغاوی ئەسپەکەی راکێشاو پاش کەمێك گەییە لای قەیاغەکە.

قەیاغەوانەکە پیاوێکی توکن بوو، لنگێکی پانتۆڵەکەی هەڵکرد بوو، دومەڵێکی گەورە لە ئەژنۆی هاتبوو، راستت دەوێ توانای لێخوڕینی قەیاغەکەی نەبوو، هێشتا یەك دنیا شت و مەك لەم بەری چۆمەکەوە مابوو، هەر کە قەیاغەوانەکە پێی دەخستە قەراخ چۆمەکە، حەشاماتێکی زۆر، جانتا، عەرەبانە، منداڵی چاو بە گریان و بێشکەی منداڵان بە هات و هاوارەوە بە سەریا دەڕژان. هەر کەسەو دەیوست پێشتر لەوانی دی بگاتە سەر قەیاغەکە. هەر هەموویان هاواریان دەکرد. دادو بێدادیان بوو، یەکتریان دەڵەك دەداو بە عاردیدا دەکەوتن.

قەیاغەوانەکە بە تەواوی دەنگی گیرابوو. فشاری لە گەرووی خۆی دەکردو بە هەوڵی بێ فایدەوە، دەستوورەکانی دووبارە دەکردەوە. ژنێکی لووت پان کە پێ دەچوو هەندێ قسەی لەگەڵ فیرارەکاندا کردبێ و بۆی تەواو نەکرد بن، بۆیە دوو دڵ بوو لەوەی کە ئایا بە پەلە بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ یان پاشماوەی قسەکانیان بۆ تەواو بکات، لەبەر خۆشحەکایەتی خۆی بۆ سێیەم جار لە قەیاغەکە بەجێ ما. جانتاکەی لە خۆی زلتر بوو، سیخناخی کردبوو لە پەلکە چەوەندەر بۆ بەرازەکانی، جانتاکەی دایە عەرداو لە ژێر لێوەوە کەوتە دوعاکردن: خوایە، ئەی پەروەدگار! ئەمجا سەر لە نوێ هاتەوە سەر قسەکردن، بە چەشنێ دەستی پێکردەوە پێ دەچوو بۆ جاری چوارەم لە قەیاغەکە بەجێ بمێنێ.

ماروسکا هاتبوو بە سەریا... "هەر بۆ خۆشی و پێکەنین" کارێ بکات کە ناچاریان بکات رابکەن. بەڵام لەبەر هەندێ هۆ ژێوان بۆوەو خۆی بە نێو حەشامەتەکەدا کرد. لە ئەسپەکە دابەزی و کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیانداو دڵنیای کردن کە ئەم پڕوپاگەندانە درۆیە.

ژنێکی دێهاتی بە شپرزەییەوە قسەی دەکرد. ماروسکا قسەکەی پێ بڕی و گوتی: بەسە، بی بڕەوە واز لە قسەی پڕوپوچ بێنە. کوا ژاپۆنی، چ خەبەرو هەواڵێك لە ژاپۆنیان نیە! گازی



ژەهراوی گازی ژەهراوی بێگومان گوندنشینە کورياييەکان ئاگريان کردۆتەوەو ئەميش باسی گازی ژەهراوی دەکات!.

جووتيارەکان ژنەکەو حەکايەتەکەيان پشت گوێ خستو لە دەوری ماروسکا ئەڵقەيان بەست. ماروسکا کتو پڕ هەستی کرد کە بووە بە پياوێکی گرنگو پڕ مەسئوليەت، بەم دەورە نا ئاساييەی خۆی دڵشاد بوو، زۆری کەيف بەوە هات کە بەسەر خۆيدا زاڵ بوو و کارێکی وای نەکرد کە "هەڵێن" ماروسکا گاڵتەی بە قسەو باسی هەڵاتووەکان دەکردو بەدرۆی خستەوەو سەرەنجام هەموويانی هێور کردەوە. کە قەياغەکە گەڕايەوە ئيدی ئەو غەڵبەغەڵبو هەراو هوريايە نەمابوو، ماروسکا بە خۆی سەرپەرشتی پەڕينەوەو هاموشۆی گاليسکەکانی دەکرد، جووتيارەکان کە لە ترساندا زوو مەزراکانيان جێ هێشتبوو و، دەستيان لە کار هەڵگرتبوو، هەنووکە لەو کردەوەيەی خۆيان ژيوانو بێزار بوونو جوێنيان بە ئەسپەکانيان دەدا، ژنە دێهاتيە دفن پانەکەش لە ئەنجاما خۆیو جانتاکەی تەپاندە نێو گاليسکەی پياوێکەوە، لە دوورەوە لە بەينی سەری ئەسپەکانەوەو لە پشت سمتی قەبەی کابرای دێهاتيەوە دەبينرا.

ماروسکا بەسەر تەيمانی قەياغەکەدا دانەوييەوەو کەوتە سەير کردنی ئەو بڵقە سپييە کەف ئاسايانەی کە بە دەوروپشتی قەياغەکەدا دەخولانەوە. کەس نۆبەبڕی لە کەس نەدەکرد، ڕێكو پێکی حەشاماتەکە ئەم بيرەی بە مێشکيا گوزەراند کە ئەو –ماروسکا– دروستکەری ئەم ڕێکوپێکييە بووە، ئەمەی بەلاوە شتێکی پەسندو لەبەر دڵان بوو.

لە نزيکی عەمارەکەوە تووشی هەندێ حەرەس بوو کە لە ئيسراحەتا بوون، (5) کەسی هێزەکەی دوبوف بوون، بە سڵاوو پێکەنينو ڕوو خۆشیو شۆخی بازييەوە پێشوازييان لێکرد، هەميشە بە ديداری ماروسکا خۆشحاڵ بوون، ئەوان جگە لەم قسە سووکانە چ شتێکی تريان نەبوو کە خەڵاتی يەکدی بکەن. حەرەسەکان هەموو گەنجی تەندروستو بە خۆوە بوون.

دنيا خەريك بوو تاريك دادەهات، هەوا ساردو لەزەت بەخش بوو ماڕۆسکا بەغيلی بە حەرەسەکان دەبرد، لە دواوە هاواری کرد: بڕۆن بۆ دۆزەخ!، ماروسکا پڕ بە دڵ خۆزيای بەوە دەخواست کە لەگەڵياندا بووايەو بەم شەوە ساردو خۆشە هاوبەشی پێکەنينو شۆخیو سواری سەختيان بووايە. کە ئەوانی بينی، ئەوجا بيری کەوتەوە کە وەڵامی نامەکەی ستاشنيسکی لەگەڵ خۆيدا نەهێناوەو کارێکی نابەجێی کردوە، شوراکەی بيرکەوتەوە، ئەو شورايەی خەريك بوو بڕياری تڕۆکردنی بدات کوتوپڕ دڵی داخورپا. لەبەر خۆيەوە بيری کردەوە کە ئەم کارەی نابەجێترين کارێ بووە کە لە مانگی رابردوودا کردوويەتی بەڕاستی لەوکارەش نابەجێ تر بووە کە لە خەستەخانەکە کردبووی.

چنگی لەياڵی مێشکيا گيرکردو کەوتە دەردە دڵ بۆ ميشکا: ميشکا، دۆستی ئازيزم، من ئيدی لە گشت شتێ تێر بووم، بەڵێ برام، لە گشت ئەم کارە تاقەت بەرانە بێزارم.

ميشکا سەری هەڵبڕیو پرمەيەکی کرد. هەر بەو دەقەوە کە بەرەو ئوردوگا دەچوو، لە دڵی خۆيدا بڕياريدا: کە ئيدی واز لە هەموو شتێ بێنێو، داوا بکات بينێرن بۆ هێزی عەسکەریو لەگەڵ هاوڕێکانيا بێ، تا لەم کارە تاقەت بەرانەی تەتەری ڕزگار بێ.



لەبەر هەیوانەکەدا وێستا، باکلانۆف تەحقیقی لە چەند هەڵتوویەك دەکرد، هەڵتووەکان چەك کرابوون، دەست بەسەر بوون، باکلانوف لەسەر یەکێك لە پلیکانەکان دانیشت بوو، و ناونووسی دەکردن.

یەکێکیان تەواو ملی کێشابووە دەریێ، بە دەنگی لەرزۆك و نەرمەوە وەڵامی دایەوەو گوتی: ئیڤان فلیمونف.

باکلانۆف بە توندی پرسی: چی؟ هەموو لەشی بە چەشنی لڤنسون بەلای هەڵتووەکەدا وەرچەرخاند —(باکلانۆف وای دەزانی لڤنسون بۆیە ئەم حەرەکەیە دەکات تا بایەخێکی تایبەتی بە قسەکانی بدرێ، هەنوکەش کە ئەم لە مێژبوو ملی پێکرا بوو، بە هۆی نوقوستانی بەدەنییەوە ناچار بوو لە کاتی پێویستدا لە بری ئەستۆی هەموو لەشی پێکەوە وەرچەرخێنێ).

– فلیمونف؟ نێوی شۆرەتی بابت چییە؟

ماروسکا پرسی: لڤنسون لە کوێیە؟ پیاوێك بەسەر ئاماژەی بۆ لای دەرگاکە کرد، ماروسکا دەستێکی بە قژی خۆیدا هێناو چووە کوختەکەوە.

لڤنسون لە سوچێکی ژوورەکەدا، لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوو، سەرگەرمی کار بوو، ماروسکا بە دوو دڵییەوە کەمێك یاری بە قامچییەکەی کرد. ماروسکاش وەکو هەموو ئەندامەکانی تری هێزەکە بەچاوی رێزو گەورەییەوە دەیڕوانییە فەرماندە. بەڵام چونکە کۆمەڵێك ئەزموونی ژیان وای فێرکرد بوو کە ئەو چەشنە پیاوە خەیاڵییە لە دنیادا نییە، بە پێچەوانەوە هەوڵی دەدا قەناعەت بە خۆی بکات کە ئەگەر لە سەرانسەری دنیادا تاقە حیلەبازێکی زرنگ هەبێ ئەوا ئەم "لڤنسون"ـەیە هەر بۆیەش دانی بەوەدا دەنا کە لڤنسون ئاگای لە هەموو شتێکەو مەیلەو مەحاڵ دەهاتە بەرچاو کە کەسێك بتوانێ هەڵی خەڵەتێنێ.

وەختێ تووشی لڤنسون دەبوو و، قسانی لەگەڵ دەکرد، هەستی دەکرد کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دەدا ئەنجام بەم چەشنە دەستی پێکرد: تۆ کە هەمیشە وەکو مشکان دەچیتە نێو کاغەزەکانتەوە! کاغەزەکەتم بەساغ و سەلامەتی گەیاندە جێ.

– چ وەڵامێکی نەبوو؟

– نـ . . . ـە...

لڤنسون نەخشەکەی خستە لایەکەوەو لە جێی خۆی هەستا:

– زۆر چاکە.

ماروسکا دەستی بە قسان کرد: سەیرکە لڤنسون، مەجبورم داوات لێبکەم، ئەگەر قەبوڵی بکەیت سوێند دەخۆم کە تا دوا هەناسە هاوڕێت بم!

لڤنسون بە پێکەنینەوە دووبارەی کردەوە: هاوڕێم، تا دووا هەناسە؟ باشە وەرە پێشەوە بزانم چیت دەوێ؟

– بمنێرەوە شوێنەکەی خۆم.

– شوێنەکەی خۆت؟ بۆ؟



ماروسکا گرژ بوو بوو، دەستەکانی دەجولاند، دەترسا شتێ بڵێ کە هەموو ریسەکەی ببێتەوە بە خوری، لەسەری رۆیی: بە کورتی و کرمانجی

– لەم کارە بێزار بووم، هەست ناکەم پارتیزان بم، تەنیا یەك....

– ئەدی کێ ببێ بە تەتەر؟

ماروسکا بە پەرۆشەوە گوتی: ئەها، ئا ئفمیکا: سوارێکی بەتەجرەبەیە، من دەزانم –ئەوسا لە سوپای کۆندا خەلاتی وەردەگرت!

لڤنسون جارێکی دی دووبارەی کردەوە: گوتت هاوڕێیەکی هەمیشەیی؟ لڤنسون ئەو رستەیەی بە جۆرێ درکاند کە ماروسکای پێ پەست بکات و تێی بگەیەنێ کە لە جیاتی نەقڵەکەی بەرتیلی هاوڕێیەتی دەداتێ!

ماروسکا رقی هەستا: واز لە گاڵتە بێنە توخمە شەیتان، من هاتم مەبەستێکت لەگەڵدا باس بکەم کەچی تۆ قا قا قا....

– زۆر چاکە، نارەحەت مەبە– شەرمە بۆ تۆ، بە دوبوف بڵێ یفیمکا بنێرێ. تۆش... دەتوانی بڕۆی...

ماروسکا گەلەك خۆشحاڵ بوو. هاواری کرد: تۆ دۆستی راستەقینەی منی... پیاوەتیەکی چاکت دەرحەقم کرد! بەڕاستی فەرماندەیی هەر لە خۆت دێ لڤنسون! کڵاوەکەی داکەندو بە ژوورەکەدا توڕیدا..

لڤنسون کڵاوەکەی ماروسکای هەڵگرتەوەو گوتی: گەوجە.

ماروسکا کە گەیشتە بەشەکەی خۆی دنیا تاریك بوو. کە چووە زنجەکەوە ژمارەیەك لە هاوڕێکانی دانیشتبوون.

دوبوف وەکو یەکێك سواری ئەسپ بوبێ، هەردوو لاقی بەملاو بەولای تەختێکدا شۆڕ کرد بووەوە دەمانچەکەی لەبەر روناکی چراکەدا دەکردەوە.

دوبوف لە ژێر لێوەوە مڕەیەکی کرد: ئەهای توخمە شەیتان! کە بوخچەکەی بە دەستییەوە بینی، بە سەرسامی پرسی: بەو بەرو بوخچەیەوە چ دەکەی لەم ناوە؟ گەڕایتەوە لای خۆمان، مەسەلە چییە!

ماروسکا هاواری کرد: هاوڕێ تەواو! رزگارم بوو! وەکو باڵندە پەڕم دەرکردو ئازاد بووم، ئیدی لە قەفەزا نیم! یفیمکا بنێرە با بڕوات– فەرمانی فەرماندەیە!

یفیمکا بە تەوسەوە گوتی: گوایە بە حسێب دەبێ مەمنونت بم ها؟

یفیمکا پیاوێکی وشك و تووڕەو هەڵچوو بوو.

– بڕۆ، بڕۆو هیچ مەڵێ، کاکە یفیم سیمیونیویچ بە کورتی پیرۆزبایت لێ دەکەم، تازە قەرزارم بوویت.

لە خۆشی ئەوەی جارێکی دی خۆی لە نێو هاوڕێکانیا بینییەوە. هەمیشە شۆخی لەگەڵ دەکردن، عەزێتی دەدان و نوقورچی لە کەیبانۆی ماڵەکە دەگرت، بە دەوری ژوورەکەدا غاری دەداو سەمای دەکرد و ئاخری کەوت بە سەر فەرماندەیاو زەیتەکەی بەردەستی رشت.



دوبوف بۆڵاندی: گەوجە، تۆش هەموو بورغوو بزمارەکانت ژەنگیان گرتووە. دوبوف مشتێکی ئەوەنــدە قــایمی بــە پشــتیا کێشــا دەتگــوت ســەری لــە بــەدەنی جیــاکردەوە.

گەرچی مشتەکەی دوبوف ئازاری دا، بەڵام لە دڵی نەگرت و نەتۆرا، ماروسکا تەنانەت لەزەتی لـە قسـە رەق و وشـە قرتـاوو نـا مەفهومـەکانی دوبـوف -کـە کـەس لێیـان حـاڵی نـەدەبوو- وەردەگرت. هەموو ئەو شتانەی لێرەدا روویان دەدا بەلای ئەوەوە ئاسایی و خۆش بوون.

دوبوف گوتی: زۆر باش بوو، لە کاتی خۆیدا هاتیتەوە. تۆزێ دەرنگیش بووە. لەوێدا بوو بـووی بەشـتێکی هـیچ و پـووچ، عـەینی برغویـەکی کـۆن و ژەنـگ گرتـوو، مایـەی سـەر شـۆڕی هەموومان بووی.

هـەموو پارتیزانـەکانی دوبوف بـە گەڕانـەوەی ماروسـکا خـۆش حـاڵ بـوون، بـەڵام هـەر یەکـەیان لەبەر هۆیەك خۆشحاڵ بوو، زۆربەیان ماروسکایان لەبەر هەندێ خاسیەت خۆش دەویست کە دوبوف لێیان بێزار بوو.

ماروسکا هەوڵی دەدا یادگاری دیدارەکەی خەستەخانە لە مێشکی خۆی دەربکات، بۆیە بەم پرسیارە: ژنەکەت چ دەکات؟ قەڵس دەبوو.

دوای تۆزێـك لەگـەڵ هاوڕێكانیـا بـۆ ئەسـپ ئـاودان چـوون بـۆ چـەم، پـەپوەکان بەسـەر درەختەکانەوە دەیان خوێند، دەنگیان هێواش بوو، بەڵام شووم نەبوو، چونکە ئاوەکە هەڵمی لێ هەڵدەستا، بۆیە سەری ئەسپەکان بە سەر ئاوەکەوە تەواو نەدەبینرا، دەوەنە چڕەکانی ئـەم بەرو ئەو بەری چۆمەکە هەر چەند شەونم بەسەر پەلکەکانیانەوە بوو، بەڵام لەو سەرمایەدا سیس و ژاکاو دەیان نواند.

ماروسکا لەبەر خۆیەوە گوتی: بەمەش دەڵێن ژیان، بە خۆشەویستییەوە کەوتە فیکە کێشان بۆ ئەسپەکەی.

مەعدەنچیەکان لـە پشـت زنجەکـەوە خـەریکی چـاك کردنـەوەی زینـەکان و پـاك کردنـەوەی چەکەکانیان بوون.

دوبوف بە دەنگی بەرز ئەو نامەیەی دەخوێندەوە کە لە مەعدەنەوە هاتبوو، کە شەوێ گەڕایەوە زنجەکە، ماروسکای بە بۆنەی گەڕانەوەیەوە بۆ لای ئەمان- کرد بە ئێشکچی شەو.

ماروسـکا بـە درێـژایی ئـەو شـەوە وای هەسـت دەکـرد کـە هەنووکـە بـووە بـە سـەربازێکی راستەقینەو مرۆڤێکی بەسوود. لـە نیوە شـەوا ئازارێکی توند دایە پەراسووەکانی دوبـوف و خـەوی لـێ زڕانـد.. لـە جێـی خـۆی هەسـتا، بـە ترسـەوە هـاواری کـرد: چـی؟ چـی؟ هێشـتا چاوە خـەواڵووەکانی تـەواو هەڵنـەهێنا بـوو کـە سـەیری شـولەی چـراکە بکـات، لـە دوورەوە دەنگـی گوللەیـەکی ژنـەوت، یـا وای هەسـت کـرد. پاشـان تەقـەی گوللەیـەکی دی لـە ئاسمانـدا دەنگـی دایەوە.

ماروسـکا لـە پـاڵ تەختەکـەیدا وێسـتاو بـە دەنگـی بـەرز هـاواری کـرد: رابـن، لـەزێ بکـەن، لـە دەورووپشتی چۆمەکە تەقەیە!

لەمەودایەکی دیارەوە دەنگی چەند گوللەیەك دوا بە دوای یەك هاتە گوێ.



دوبوف دەستووری دایە ماروسکا کە: هاوڕێیان هەستێنە! خێرا هەرو سەر بە زنجەکاندا بکە! راکە، بلەزینە!
ماروسکا پاش چەند دەقیقەیەك تەدارەکی تەواوی لە خۆداو بە غاردان لە کوخەکەوە دەرچوو، دنیا ساردو کپ، لە رووناك بوونەوەدا بوو، ئەستێرەکان لەنێو رێگای دەست لێ نەدراوو تەمومژاوی کاکێشاندا، کە پێی چ زی روحێکی تێ نەکەوتبوو، بە ترسەوە هەڵدەهاتن.
پارتیزانەکان یەك یەك لە کادێنە پڕەکەوە دەردەکەوتن، بە خوتەو بۆڵەوە فیشەکدانەکانیان دەبەست و ئەسپەکانیان دەهێنایە دەرێ.
مریشکەکان بە فرەفرو قیرە قیری ترس ئامێزەوە لە کۆڵانەکان دەردەپەرینە دەرێ. ئەسپەکان هەڵدەبەزینەوەو دەیان حیلاند.
دوبوف فەرمانیدا: بەغار بچنە دەرێ. سواربن. دمیتری سیمیون خێرا هەموو برادەرانی نێو زنجەکان بێدار بکەوە!
راکێتێك بەدەم دووکەڵ کردنەوە بە ئاسمانی مەیدانەکەی بەرانبەر ئوردوگاکەدا گڤەی کرد, ژنێکی دێهاتی بە چاوی خەواڵوەوە سەری لە پەنجەرە هێنایە دەرێو بەپەلە سەری بردەوە ژوورێ.
دەنگێکی پەشێوو لەرزۆك بەرز بۆوە: پەنجەرەکە داخە! یفیمکا بە پەلە لە ئۆرودوگاکە چووە دەرێو لەبەر دەرگای هەر زنجێکدا هاواری دەکرد: چەك و تاقم ببەستەو راکە دەرێ. بگە شوێنی کۆبوونەوە!
سەری ئەسپەکەی لە دەرگای زنجەکان بەرزتر بوو. یفیمکا لەگەڵ هاوار کردندا هەندێ شتی دی دەتگوت کە مەفهوم نەبوون، بۆیە بە فیڕۆ دەچوون.
وەختێ مامورانی بێدارکردنەوەی پارتیزانەکان گەڕانەوە، دەرکەوت کە پتر لە نیوەی ئەندامانی دەستەکەی دوبوف شەوێ لە ئۆردوگادا نەبوو بوون، تومەز چووبوونە شەوانە کۆڕو لەوانەشە شەوێیان لەگەڵ کیژاندا گوزەراندبێ. دوبوف پەشێو بوو، نەیدەزانی کە ئاخۆ بەوەندە پارتیزانەوە بکەوێتە کار یان بە خۆی سوار بێو بڕوا بۆ ئوردوگا تا بزانێ وەعز لە چ دایە.
دوبوف بە دەم کفرکردنەوە، هەندێ سواری نارد کە یەك یەك زەلامەکان کۆبکەنەوە. بۆ دووەم جار هەندێ سوار بە چوار ناڵە گەیینە جێو فەرمانی لڤنسونیان هێنابوو کە دەست بە جێ هەموو زەلامەکان ئامادەبن، بەڵام هێشتا چ هەواڵێك لە زەلامە غایبەکانەوە نەبوو، دوبوف وەکو گیانلەبەرێك کەوتبێتە داوەوە، هەر پەلە قاژەی بوو، لێرە بۆ ئەوێ، لەوێ بۆ ئێرە غاری دەدا، هێند نائومێد بوو بەو بوایە بە گوللەیەك تەپڵی سەری خۆی هەڵگرێ، ئەگەر بە تەواوی هەستی بەو ئەرکە سەختەی سەر شانی نەکردبا بە گوللەیەك خۆی تەواو دەکرد، ئەو شەوە کۆمەڵێك پارتیزانی بێ بەخت مستە کۆڵەی باوە پیارانەی دوبوف یان بەرکەوت.
دەستەکەی دوبوف، ئەنجام لە کاتێکا سامی جادەکان لەگەڵ دەنگی سمی تێکەڵ و پێکەڵی ئەسپ و جرینگە جرینگی سازو بەرگ و چەکی پۆڵاییندا تێکەڵ دەبوو، بە دەم حەپەی شێتانەی سەگەلەوە گوندەکەیان بەرەو شوێنی خڕبوونەوە بە جێ هێشت.



دوبوف کە دیتی زەلامی دەستەکانی دی لەمەیدانەکەدا ئامادە بوون، سەرسام بوو، زەلامەکان بەسەر شا ڕێی عەماری قیتارەکەدا بڵاوەیان کردبوو، کۆمەڵێکیان لە ئەسپەکانیان دابەزی بوون و لە کەنار شارێیەکەداو، لە سەر عاردی دانیشتبوون و سەبیلیان دەکێشا. دوبوف چاوی بە هەیکەلی وردیلەی لڤنسون کەوت کە لە نزیکی کۆمەڵە لەوحێکەوە لەبەر ڕوناکی مەشخەڵێك، لەگەڵ میلیتسادا قسانی دەکرد.

باکلانۆف بە ڕەقی گوتی: بۆ ئەوەندە دوا کەوتی؟

ئێستاش هەر لاف لێ بدە کە —مەعدەنچییەکان! لە ڕقا بێ تاقەت بوو، خۆ ئەگەر لەم هەلومەرجەدا نەبووایە هەرگیز زاتی نەدەکرد بەو ڕەقییە لەگەڵ دوبوفدا بدوێ.

دوبوف سەری شۆڕ کرد. ئەوەی لە هەموو شتێ پتر دەیڕەنجاند ئەوەبوو: هەستی دەکرد حەق بە باکلانۆفەو هەقی خۆیەتی تا دەتوانێ تەوسی پێ بکات و تانەی لێ بدات. بەلای خۆیەوە هیچ سەرزەنشت و گازاندەیەك بارتەقای درێغی کردنەکەی نەدەکردەوە. جگە لەمانەش، باکلانۆف ئەوی لە قافا گرتبوو: دوبوف بە هەموو بوونییەوەو بە ڕاستیش باوەڕی وابوو کە نێوی مەعدەنچی لەم سەر زەمینەدا گەورەترین و پڕ شانازیترین نازناوێکە کە یەکێك بتوانێ لە خۆی بنێ. ئێستاش باوەڕی وا بوو کە دەستەکەی ئەو نەك هەر حورمەتی خۆی نەپاراستووە، بەڵکو پەڵەیەکی ئەو تۆیان ناوە بە نێو چاوانی حەیاو ئابڕوی مەعدەنچییانی ساچان و گشت مەعدەنچییەکی ترەوە کە بەلای کەمەوە تاوەکو حەوت پشتان دەمێنێتەوە.

باکلانۆف پاش سەرزەنشت کردنی دوبوف —دوبوف کە بە خۆی لە ناخی دڵەوە بەو سەرزەنشتە ڕازی بوو— سواری ئەسپەکەی بوو، و چوو زەلامەکانی خڕ بکاتەوە. دوبوف لەلایەن (5) زەلام لە سوارەکانی خۆییەوە، کە تازە لەو بەر چۆمەکە گەڕابوونەوە، ئاگادار کرایەوە کە چ دژمنێك لە گۆڕێدا نییەو تەقەکانیش بە فرمانی لڤنسون کراون، دوبوف تێگەیی کە لڤنسون ویستوویەتی ڕادەی ئامادەیی هێزەکە تاقی بکاتەوە: کە بیری لەوە دەکردەوە کە فەرماندەکەی لە خۆی ڕەنجاندووەو نەیتوانیوە ببێ بە سەر مەشق بۆ ئەوانی دی، گڕی ڕقی پتر بڵێسەی دەستاند.

وەختێ هەموو بەشەکان ڕیز بوون و سەرژمێری حازرو غایب دوایی هات، دەرکەوت کە ژمارەیەکی زۆر لە پارتیزانەکان لەوێ نین، زۆربەی غایبەکان لەدەستەکەی کوبراك بوون، کوبراك بەخۆیشی کە چوو بووە بەڕێ کردنی خزمێکی خۆی، هێشتا بە تەواوی نەهاتبووە سەرخۆ، بەردەوام قسەی بۆ زەلامەکان دەکردو دەیپرسی. چۆن دەتوانن حورمەتی بەرازێکی بێ فەڕی وەکو من بگرن.

بەردەوام دەگریا. زەلامی گشت دەستەکان هەستیان دەکرد کە مەستە، تەنیا لڤنسون نەبێ وا خۆی دەنواند کەچ شتێك نابینێ، لە لایەکی تریشەوە ناچار بوو لای بدات. بەڵام زەلامێکی دی نەبوو لە شوێنی ئەو دایبنێ.



لڤنسون سوارانی هێزەکەی تەفتیش کردو ڕۆیی بۆ مەرکەزی مەیدانەکە, بەرانبەر زەلامەکان وێستا, بەووشکی و جدی دەستێکی ڕووەو زەلامەکان هەڵبڕی و کەوتە قسان. هەندێ دەنگی نامەفهوم لە ژێر پەردەی تاریکی شەوەوە دەگەییەگوێ.

لڤنسون بە دەنگێکی ڕەوان و هێدی, بە دەنگێ کە بەلای هەر یەکێك لە زەلامەکانەوە لە لێدانی دڵی خۆی ئاشناتر بوو, دەستی بە قسان کرد: هاوڕێیان! ئێمە دەبێ لێرە بڕۆین. بۆ کوێ؟ جارێ شوێنێکی تایبەتیمان دیاری نەکردووە.

هێزی ژاپۆنییەکان گەرچی پێویستی بە موبالەغە نییە، بە ئەندازەی کاڤ زۆرو بە هێزن، قازانجی ئێمە لەوەدایە بۆ ماوەیەك خۆ ون بکەین، هەڵبەتە ئەنجامدانی ئەم کارەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئیدی بە تەواوی لە خەتەر خەلەساوین، نا، ئێمە هەمیشە خەتەرمان لە پێشەوئەم خەتەرەش بۆیەکە بە یەکەمان ڕوون و ئاشکرایە. ئایا ئێمە بەڕاستی شایستەی نێوی پارتیزانین؟ ئەوڕۆ پێچەوانەی ئەوەمان سەلماند، ئێمە بە قەت کیژە مەکتەبلییەکان زەبت و ڕەبتمان نییە، ئەگەر ئەم تەقانە بەڕاستی لەلایەن ژاپۆنییەکانەوە بوایە ئەو حەلە تەگبیرمان چ دەبوو؟ بێگومان بێ سێ و دوو گەروویان هەڵدەدرین و ئەمەش شوورەیی و نەنگە!

لڤنسون بە پەلە بە پێشا دانەوییەوە، دوا وشەی چون سپرنگێك کە لە حاڵەتی کردنەوەدا بێ لە دەمی دەرپەڕی، دەتگوت دەستێکی بێ ڕەحم گەرووی گوشی.

کوبراك کە تاقە وشەیەك لە وشەکانی حاڵی نەبوو بوو بە دەنگێك کە تەواو قەناعەت بەخش دەهاتە بەرچاو هاواری کرد: بە تەواوی دروستە... هەر وشەیەکی!.... ئەوجا بەدەم سەر لەقاندنەوەو بە دنگی بەرز نزگرەیەکی کرد.

دوبوف هەموو ساتێ بە تەمای ئەوە بوو. لڤنسون ڕووی تێ بکات و بڵێ بۆ نموونە دوبۆف دەڵێم —ئەم پیاوە لە ڕابواردن گەڕابۆوە، یەکێك بوو لەوانەی کە پتر لە هەمووان حسێبم بۆ دەکر. ئەمەش مایەی شەرمەزارییە. بەلآم لڤنسون نێوی چ کەسێکی نەبرد. لە ڕاستیا زۆر کەم قسەی کرد. تاکیدی بنەڕەتیشی لەسەر یەك خاڵ بوو, دەتگوت مێخێکی مەزن بە چەکوش دادەکوتێ تا وەکو هەتایە لە جێی خۆی بمێنێ. وەختێ کە قەناعەتی کرد مەبەستی خۆی پێکاوە ئەوجا ئاوڕی لە دوبوف دایەوەو گوتی: دەستەکەی دوبوف دەبێ بە ماموری بنکە... تۆزێ زەلامەکانت هێدی بکەوە– ئەوان زوو مەبەستەکان حاڵی دەبن.

لڤنسون لەسەر ئاوزەنگییەکەوە هەستا، قامچییەکەی بادا، بە دەنگی بەرز هاواری کرد: سێ سێ لە جێی خۆتان ڕیز بن، بە دەستە ڕاستیی درەختەکانا، بڕۆن! جرینگە جرینگی زنجیری هەوسارو جیرە جیڕی زین ئاسمانی پڕ کرد. ڕیزی سفتی پیاوان لە نێو جەرگەی شەوا، چەشنی ماسییەکی گەورەی نێو ئەستێلێکی ڕاوەستاو، لە جولآنا بوو. دەتگوت بەرەو قوتەو لوتکەکانی سیخوتە ئالین دەکشێن، ئەو کێوە بە تەمەن و جوان و زیندووەی کە سپێدەی گرتبووە باوەش و دەتگووت هەر ئێستا نا ئێستا ئازادی دەکات.





## متچیك له ناو هێزدا

ستاشینسکی لەلایەن یاریدەدری مەسئول تەداروکاتەوە کە بۆ پشکنینی ئازووقە چووبووە خەستەخانە, لە حەرەکەتی هێزەکە ئاگادار کرایەوە.
یاریدەدەری مەسئولی تەداروکات بلوزێکی کاڵەوە بووی لە بەردا بوو. پشتە چەماوەکەی کردە هەتاو و گوتی: ئەم لڤنسون"ە گەلێك زرینگە. ئەگەر ئەو نەبوایە هەموو تیادەچووین. تۆ بیری لێ بکەوە، کەسمان رێگای خەستەخانەمان نەدەزانی. ئەگەر ژاپۆنییەکان دوامان بکەوتنایە، هەموومان دەڕژاینە ئێرەوەو لە دەستیان هەڵدەهاتین خۆ، ئەوساش ئەم هەموو ئازووقەیەمان لێرەدا هەبوو، لەگەڵ ئەمەشدا لڤنسون پیاوێکی ناموافق نییە؟ ئەمجا سەری ئافەرین و ستایشی لەقاند.
ستاشینسکی چاك دەیزانی کە ستایش و ئافەرینی ئەم کابرایە تەنیا لەبەر زیرەکی لڤنسون نەبوو، بەڵکو حەزی لەوە بوو ئەو سیفەتانەی کە لە خۆیدا نەبوون، بیانداتە پاڵ خەڵکانی دی.
متچیك ئەو رۆژە بۆ یەکەمجار کەوتەوە سەر پێ. لە کاتێکا ژێر باڵیان گرتبوو، و بەسەر سەوزە گیاکەدا هەنگاوی دەنا، سەری لە هەڵگەڕانەوەی سپرینگ ئاسای گیاکانی ژێر پێی سور دەما، لە خۆشیاندا سەری لێ شێوابوو، بەردەوام و بێ ئیختیار پێدەکەنی، پاشان لەسەر تەختەکە راکشاو کەوتە گوێ گرتن لە لێدانی توندی دڵی خۆی، نەیدەزانی ئەم لێدانە توندەی دڵی، ئەنجامی شەکەتی بوو، یا ئەنجامی ئەو هەستی شادییە بوو کە دیتنی گیایەکانی ژێر پێی پێی بەخشیبوو، هەر چەندە هێشتا لاقەکانی سست و بێ هێز بوون، بەڵام ئازای گیانی لە خۆشی و شادیدا هاتبووە سەما. کە متچیك بە پێی خۆی دەڕۆیی، فرولوف بەغیلی پێ دەبرد. متچیك کە دەچووە کن فرولوف هەستی بە شەرمێکی سەیر دەکرد, بۆیە هەنوکەش نەیدەتوانی ئەو هەستە لە خۆی بتارێنێ.. نەخۆشییەکەی فرولوف هێندە درێژەی کێشابوو کە گشت کارگوزەرانی خەستەخانەکەی بێزار کردبوو, هەر چەند بە تەنگییەوە دەهاتن وغافلیان نەدەکرد, بەڵام چەندین جار بە خۆی گوێی لێ بوو بوو کە پێیان دەگوت: ئەرێ تۆ کەنگێ دەمری؟.بەڵام ئەو دەیویست بژی.
چونکە بەخۆرایی چاوەرێی ژیانی دەکرد, بۆیە بوو بوو بە بار بە سەرشانی ئەوانەوە.
ئەو پیوەندییە سەیرەی نیوان متچیك ڤاریا تا دوا رۆژی مانەوەی متچیك لە خەستەخانەکە هەر بەردەوام بوو، وەزع و حاڵیان لە گەمەیەك دەچوو کە هەر یەکێکیان دەستی ئەوی تری خوێندبێتەوە. متچیك دەیزانی ڤاریا چی دەوێ. ڤاریاش دەیزانی متچیك دەترسێت. کەسیان نەیاندەتوانی دوا هەنگاوی یاخیانەوە بنج بڕ بنێ.



ڤاریا لە ڕۆژانی سەخت و دژواری خەستەخانەدا، لەو ڕۆژانەدا کە نەخۆشێکی یەکجار زۆر لە خەستەخانەکە کەوتبوون و ناسینەوەیان بەسیماو ڕەنگی چاوو قژا، تەنانەت بەناویشیاندا زەحمەت بوو، هەرگیز نەیدەپەرژا موغازەلەی کەس بکات و بە چ کەسێك بڵێ: دڵدارەکەم، خۆشەویستەکەم. متچیکی هەر لە بیر بوو و لە خۆشاوی ئەو وشانەی بێبەش نەدەکردو بە کردەوەش بۆی دەسەلماند. ڤاریا وای هەست دەکرد تەنیا ئەوە پیاوە قۆزو خۆشەویست و میهرەبانە دەتوانێ تامەزرۆی ئەو بشکێنێ و غەریزەی دایکایەتی لا بسەلمێنێ، هەر ئەو تاسەیەش ڤاریای خستە داوی عەشقی متچیك-ەوە، شەوانە خەیاڵی بە متچیکەوە لێ دەداو بەبێ دەنگی و کپی بۆی دەسوتا، بە ڕۆژیش ئەڵهاو ئارەزوو تینی بۆ دەهێناو حەزی دەکرد متچیك بەرێتە پەناییێکەوەو عەشقی درەنگ وەختی خۆی پێ رابگەیێنێ، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك هەرگیز بە ئاشکرا ئەم عەشقەی خۆی پێ ڕانەگەیاند، متچیکش هەر چەند بە هەموو شەوق و خەیالاتی لاویەوە هەمان خۆزگەو ئارەزووی ڤاریای لە دڵدا بوو، کەچی تا پێی دەکرا خۆی لە ڤاریا دەپاراست و هەوڵی دەدا بە تەنیا لەگەڵیا کۆنەبێتەوە: لە کاتی تەنیاییدا یا پیکای گاز دەکردە نك خۆی یا نەخۆشی دەکردە بیانوو، متچیك شەرمی لە ڤاریا دەکرد، چونکە لە ژیانیا ئاشنایەتی لەگەڵ چ ژنێکا پەیدا نەکرد بوو، وای هەست دەکرد ئەو کارەی خەڵکانی دی لەگەڵ ڤاریادا دەیانکرد ئەم ناتوانێ بیکات. جگە لەمەش مەسەلەی ئابڕوو چوون لەئارادا بوو. هەر کاتێکیش بەسەر شەرمەکەیدا زاڵ دەبوو. سیمای گڕگرتووی ماروسکا لە دارستانەکەوەو بە دەم قامچی بادانەوە دەر دەکەوت. متچیك- دادەمرکایەوەو جۆرە ترسێکی لێدەنیشت, هەستی دەکرد قەرز و پیاوەتی ماروسکای پێ نادرێتەوە. متچیك بە درێژایی ئەو ماوەیە لاوازترو باریکتر بوو, تا دواساتی مانەوەی لە خەستەخانەکەدا نەیتوانی بەسەر ترسەکەیدا زاڵ بێ. متچیك و پیکا پێکەوە لە خەستەخانە دەرچوون, کە خەستەخانەکەیان بەجێهێشت دەتگوت لە خەڵکانێ جیادەبنەوە. کە هەرگیز نەیانناسیون. ڤایار بەهانکە هانك لە ڕێگاکەوە خۆی پێ گەیاندن, گۆناکانی لە شەرم و شپرزەیی دا سۆر هە ڵگەڕا بوون, گوتی: سەیرکە با بە لای کەمەوە خوا حافیزییەکی تێرو تەسەل لە یەکدی بکەین, نازانم بۆ لەوێ شەرمم کرد، قەت وا نەبووم کەچی ئەمجارە شەرمم کرد. بە چەشنی کچۆڵانی مەعدەن، بە ئەسپایی و دزییەوە کیسەیەك توتنی خستە دەستی متچیکەوە.

شپرزەیی و دیارییەکەی ڤاریا ئەوەندە چاوەڕوان نەکراو بوو کە متچیك لە ناخی خۆیدا هەستی بە ئازارێکی سەخت کرد. لەبەر پیکا بە شپرزەیی و هەڵچوونەوە لێوەکانی بە گۆنایەوە چەسپاند. ڤاریا چاوی بڕییە متچیك، لێوەکانی کەوتنە تەتەڵەو بە چاوە خومارەکانی دوا نیگای خوا حافیزی بڕییە متچیك.

لە کاتێکا متچیك و پیکا لە نێو درەختە چڕەکانا ون دەبوون، ڤاریا هاواری کرد: سەرم لێ بدەوە! بەڵام ئیدی چ وەڵامێك نەبوو. ڤاریا خۆی بە عاردیداداو هۆن هۆن کەوتە گریان.

متچیك بەدەم ڕێگاوە بیرەوەرییە خەمناکەکانی لە خۆی دوور خستەوە. ئیدی بەلای خۆیەوە پارتیزانێکی ڕاستەقینەبوو. تەنانەت قۆڵەکانی هەلکرد تا هەتاو بیانسوتێنێ. وەك بڵێی ئەم



کاره لە ژیانی تازەیداو پاش ئەو گفتو گۆ لە بیرچوونەوە نەهاتووەی لە گەڵ ڤاریادا کرد بووی, کارێکی گرینگ و گەلەك بە بایەخ بوو.

هێزی ژاپۆنی و کلچاکەکان گەلی "ئیرو خدزا"یان داگیر کردبوو. پیکا بە درێژایی ڕێگا, پەشێوو نیگەران سکالای لە دەست دەردێکی خەیاڵی دەکرد. متچیك نەیتوانی قەناعەتی پێ بکات کە لە دۆڵەکەوە گوند بەجێ بهێڵن, بۆیە بە هەورازی شاخەکاندا و لە ڕێگای نادیاری بزنە ڕێوە درێژەیان بەڕێی خۆدا, بۆ دووەمین شەو, لە کاتێکا ترسی مەرگیان هەبوو, بە چوار چنگۆڵە بەسەر تاوێرە سەختەکاندا بەرەو چۆمەکە داگەڕان: متچیك هێشتا متمانەی بەلاقەکانی خۆی نەبوو، نزیکی بەیانی گەیشتنە یەکێك لە مەزرا کورییاییەکان و، بە تاسوقەوە کەوتنە خواردنی "چامیزای" بێ تام و خوێ.

متچیك کە تەماشای سیمای ژاکاوو بەزەیی وروژێنی پیکای کرد، ئیدی نەیتوانی سیمای شیفتەی ئەو پیرەمێردە بێ دەنگ و نورانییە بیر خۆی بەرێتەوە کە لە قەراخ دەریاچەیەکی مەنگ و بە زەل داپۆشراو دادەنیشت. ڕواڵەتی بەزیوی پیکا نیشانەیەکی ئەکیدی شڵەقانی گومێ ئارامییەکەی بوو، پاشان ڕێگەیان کەوتە هەندێ کێڵگەی لێك دابڕاو کە چ کەسێك لەو ناوەدا نێوی ژاپۆنییەکانی نەژنەوتبوو، وەختێ پرسیاری پەڕینەوەی هێزەکانی لە وەرزێرەکان کرد، وەرزێرەکان ئاماژەیان بۆ سەرووی چۆمەکە کردو دەنگوباسیان لێپرسین و خوڵکیان کردن کە "کواس"ی شیرین بخۆنەوە. کیژانی دێهاتی بە عەزرەتەوە سەیری متچیك-یان دەکرد. ڕۆژی کارو سەرگەرمی ژنان هاتبوو. جادەکە پڕ بوو لە گوڵە گەنمی درشت، داوی هێلانەی چۆلی جاڵجاڵۆکە لەو گزنگی بەیاندا لە ئاونگا دەبریسکایەوە. دنیای پاییز پڕ بوو لەوزە وزی خەم وروژێنی زەردەواڵان، دەوروبەری ڕۆژئاوا گەیشتنە گوندی "ش بی شی" دێیەکی بچکۆلە بوو. لەبەر تیشکی زەردەپەڕی ئێوارەو لە داوێنی شاخێکی پڕ درەخت دا ئارامی گرتبوو، دەستەیەك زەلامی شاد کە هەر یەکەیان تلیماسکێکی سووری بەکڵاوەکەیەوە کردبوو، بە دەنگە دەنگی شادی وروژێنەوە لە نزیکی مزگەوتێکی پەرپوت و وێراندا کە پەڵەی تەرەشوع دیوارەکانی داڕزاند بوو، مژۆڵی وازی اسکیتل بوون. کابرایەکی کورتە باڵا بە جوتێ پوتی درێژەوە، بە ردێنێکی سووری پایین باریکەوە کە پتر سیمای کورتە باڵاکانی ئەفسانەی پەریانی نێو کتێبی مندالانی پێدا بوو، گوێیەکانی دەهاویشت و زۆر لە دووری دارەکان دەکەوتەوەو ئەوانی دی پێدەکەنین، کابرای کورتە باڵا بە شەرمەوە پێدەکەنی. بەڵام هەموو دەیانزانی کە بە هیچ کلۆجێ مەیدان خاڵی ناکات، لەوانی دیش کەمتر کەیف ناکات. پیکا گوتی: ئەوانن، ئەوە لڤنسونە.

- کامە؟

- ئەوە, ئەو ردێن سوورە.

پیکا متچیکی بە سەرسامی بەجێ هێشت. بە پەلە و بە شێوەیەکی سەیر بەرەو کابرا کورتە باڵاکە کشا.

- ئەهای کوڕینە وەرن، پیکا هات!




- بەڵێ خۆیەتی، بەخێر هاتی!
- شەیتانی سەر حەوێس "اصلع" کارەکەی بە جۆرێ ساز داوە کە بە دوای ئێمەدا بێت. وازیان لە گەمەکە هێناو هەموو لە دەوری پیرەمێردەکە خڕبوونەوە. متچیك لە دووریان وێستاو دوو دڵ بوو کە ئاخۆ بچێتە نێویانەوە یا سەبرکات تا گازی بکەن.

ئەنجام لڤنسون پرسی: ئەدی ئەوە کێیە لەگەڵ خۆتت هێناوە؟

- ئەها، هاوڕێیەکە لەخەستەخانەوە هاتووە، کوڕێکی باشە! یەکێکیان کە متچیکی ناسییەوە هەڵیدایێ: ئەو گەنجە برینددارەیە، کە ماروسکا هێنای.

متچیك کە گوێی لێ بوو دەربارەی ئەو قسان دەکەن، چووە نزیکترەوە، پیاوە کورتە باڵاکە، ئەوەی یاری "اسکتیل"ی خراپ دەکرد دوو چاوی درشت و کاریگەری پێوەبوو، ماوەیەك لە متچیك راما، چووە ناخییەوە دەروونی پشکنی، دەتگوت دیوی ناوەوەی متچیکی هەڵدەسەنگاند.

متچیك کە بیری چوو بوو قۆڵەکانی داداتەوە، لە شەرماندا سوور بۆوەو گوتی: هاتووم پێوەندی بەهێزەکەی ئێوەوە بکەم، ئەمجا بۆ ئەوەی سەنگێك بە قسەکەی بدات هەڵیدایێ: بەر لە بریندار بوونم، لە لقەکەی شالدیبا بووم.

- چەندێك لە لقەکەی شالدیبا مایتەوە؟
- لە مانگێ شەشەوە... لە نیوەیەوە... لڤنسون نیگایەکی توندو پرس ئامێزی کرد: تەقە دەزانی؟ متچیك دەمودەست وەڵامی دایەوە بەڵێ...
- یفیمکا برۆ تفەنگەکە بێنە.

وەختێ یفیمکا چوو بۆ تفەنگ، متچیك هەستی کرد گەلێك چاوی پرس ئامێز سەیری دەکەن. وای دەهاتە بەرچاو کە ورد بوونەوەو نیگا ساردەکانیان هەڵقوڵاوی دژمنایەتییە.

لڤنسون تەماشایەکی دەوروپشتی کردو گوتی: زۆر چاکە فەرموو. حەز دەکەیت بە چی تەقان بکەی؟

یەکێکیان بە خۆشحاڵییەوە پێشنیازی کرد: بەو سەڵبییە!

- نا.. ئەوە باش نییە. یفیمکا ئەم داراسکیتلە بخە سەر ئەو عامودە.

متچیك تفەنگەکەی بە دەستەوە گرت و بۆ سێرە گرتن تەقریبەن چاوی نوقاند. ترسێکی کوت و پڕ سەراپای داگرت، هەڵبەتە ترسی لە تەقەکردنەکە نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو وای بیردەکردەوە کە هەر هەموویان حەز دەکەن نیشانەکە نەپێکێ.

یەکێکیان ئامۆژگاری کرد: دەستی چەپت توندترکە، وا خۆشترە لەوەی کە تۆ گرتوتە. کابرا ئەو قسانەی وەکو جۆرە هاوخەمی و بە تەنگەوە هاتنێك کردو کارێکی زۆری لە متچیك کرد. متچیك غیرەتی دایە خۆ، میلی تفەنگەکەی هێنایەوە. لەگەڵ تەقەی فیشەکەکەدا —چەند جارێك چاوی تروکاند— و پاشان "اسکتیل"ەکەی بینی کە لەسەر عامودەکەوە دەکەوتە خوارێ.

لڤنسون پێکەنی: تەقان دەزانی. ئەدی سواری بەڵەدی؟



متچیك هێنده سەرمەستی سەركەتنی تەقەكردنەكەی بوو، ئامادە بوو گوناحی هەموو مرۆڤایەتی لە ئەستۆ بگرێ، بۆیە ئیعترافی كرد كە: نا، لڤنسون گوتی: ئەمەیان گەلەك خراپ بوو. شتێكی بەڵگە نەویستە كە وای بیر دەكردەوە بە راستی خراپ بوو: باكلانوف، زیوچیخا بدەنە ئەو ئەمجا بە زۆڵێتییەوە چاوەكانی بچووك كردنەوەو: وریابە ئەسپێكی بێ وەیە، فەرماندەكەت پێت دەڵێ كە چی لێ بكەیت، لە كام لق دای بنەین؟

باكلانوف وەڵامی دایەوە: من دەڵێم لە لقەكەی كوبراك... ئەو زەلامی كەمە, یانی هەم ئەمو هەم پیكاش. لڤنسون گوتی: بۆ نا؟ منیش رازیم!

تاقە تەماشا كردنێكی زیوچیخا كافی بوو بۆ ئەوەی متچیك هەموو نەشئەی دوای سەركەوتنەكەی كە بە ئومێدێكی منداڵانەو غرور ئامێزەوە لەناخیا دەجۆشا، فەرامۆش بكات. زیوچیخا ماینێكی چروساوەی چاو رێپۆقاوی سپی چڵكن و كەفەڵ زل و ورگن بوو، ماینێكی رام، كە چەندین هێكتار زەوی كێڵاو بوو، وێڕای هەموو ئەم چاكیانەشی ئاوس بوو، ناوە سەیرەكەی پڕ بە پێستی بوو.

متچیك بە ئەسپایی پرسی: بە تەمان ئەمەم بدەنێ؟

كوبراك بە دەست كێشای بە كەفەڵی ماینەكەداو گوتی: هەڵبەت بە رواڵەت باش نییە، سمەكانی لاوازە، من وا تێ دەگەم یان لەبەر كار نەكردنە یان لەبەر لاوازی خۆیەتی. سەرەڕای ئەمانەش بە كەڵكی سواری دێت. سەرە لوولە بۆزەكەی وەرگێڕاو بە دڵنیاییەوە دووپاتی كردەوە: بەڵێ بە كەڵكی سواری دێت. متچیك هەندێ لە زیوچیخا راماو بە رەنجاوییەوە پرسی: باشە ئەسپێكی ترتان نییە بمدەنێ؟ كوبراك هەر وەڵامیشی نەدایەوە. ئەمجا وەكو بەڕووی بڕژاو لە دەمیا بتەقێتەوە كەوتە باسكردنی ئەو كارانەی كە پێویستە متچیك بەیانیان و ئێواران و شەوان ئەنجامیان بدات تا ئەو ماینە پیرو لاوازە نەتۆپێ، كە لە سەفەری دوور گەڕایتەوە، یەكسەری زینەكەی لێ مەكەوە، تاوێك بیگێڕە تا بەدەنی فێنك دەبێتەوە. هەموو جارێ قەشاویشی بكەو جوان پاكی بكەوەو ئەوجا زینی بكەو سواری بە. متچیك لێوی هەڵقورتاند، لەسەرو كەللەی ماینەكە راما، بە هیچ جۆرێ هۆشی لەلای قسەكانی كوبراك نەبوو، هەستی دەكرد بۆیە ئەو ماینە كرێت و ترسناكەیان داوەتێ تا هەر لە سەرەتاوە بیبوغزێنن، كە ژیانی تازەی لە مێشكی خۆیدا تاوتوێ دەكرد، زۆری لا زەحمەت بوو بەو ماینە نەفرەت ورۆژێنەوە بتوانێ دەرەقەتی ئەو ژیانە بێ. چ كەسێك ئاگای لەوەزعی متچیك نەبوو كە هەنووكە پیاوێكی دییە، پیاوێكی سەربەخۆو پشت بە خۆ بەستووەو زۆری فەرقە لەگەڵ پیاوەكەی پێشوودا، هەموو وا خەیاڵ دەكەن ئەوەندە پیرو بێ توانایە كە ئەسپێكی چاپۆك و گەنجی پێ رەوا نەبینرێ.

كوبراك، بێ ئەوەی گوێ بەوە بدا كە متچیك نارەحەتە یان نا! یا بێ ئەوەی بزانێ گوێ لە قسەكانی دەگرێ یانا! ئەمەشی گوت: ئەم ماینە سەرەڕای ئەو عەیبانە گڕوشە. دەرمانەكەشی سولفاتە، بەڵام ئێمە سولفات-مان نییەو ناچار بە ریقنە مریشكان دەرمانی دەكەین. شتێكی



زۆر چاکە. تۆ دەبێ کەمێ ڕیقنە بخەیتە سەر پارچە پەڕۆیەك و بەر لەوەی ڕەشمەی بکەی، لەسەر لمۆزەکەی بئالێنی و توند گرێی بدەیت. ئیدی بزانە چتۆ ماینێکە!

متچیك بێ ئەوەی تاقە وشەیەك لە قسەکانی سەر دەستەکەی تێ بگات، لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە چما من منداڵم، نەخێر... دەچمە لای لڤنسون و پێی دەڵێم سواری ئەمە نابم، مەجبور نیم باجی خەڵکانی دی بدەم، هەموو حەزێکی ئەوە بوو کە هەست بکات باجی خەڵکانی دی دەدات: نا، خەتاکە لەوەوەیە ئەو ناتوانێ بەم جۆرە ڕەفتارم لەگەڵدا بکات.

وەختێ دەستوورەکانی فەرماندە تەواو بوون و ماینەکەیان بە متچیك سپارد، ترسی لێ نیشت و خۆزیای دەخواست کە بەلای کەمەوە گوێی لە قسەکانی دەگرت، زیوچیخا سەری داخست بوو، لچەکانی کۆکردبۆوە، متچیك دەیزانی کە ژیانی ئەم ئاژەڵە لە دەستی ئەودایە, بەڵام متچیك تەنانەت جۆری بەستنەوەی ئەم حەیوانە ڕامەشی نەدەزانی هەر بۆیەش لە نێو تەویلەکەدا بەرەڵای کرد. ماینەکە سەرگەردان لە نێو تەویلەکەو لە ناو جەرگەی تاریکییەکەدا هاتوچۆی دەکرد، سەری بە ئاخوڕی ئەسپەکانی دیدا دەکرد، ئەسپەکان و پاسەوانەکانی تووڕە دەکرد.

شریخەیەکی سامناکی قامچی بەرز بووەوە. دەنگێك لە نێو تەویلەکەوە هاتە گوێ: ئەرێ ئەو کوڕە تازەیە بە ئەستۆی وردی کێو چووە؟ بۆ ماینەکەی نەبەستۆتەوە؟ دەبڕۆ قەحپەی بەرەڵلا، ئەهای کێ نۆبەچی تەویلەیە، ئەم دەعبایە ڕەوانەکە بابڕواتەوە....

متچیك لە پەشێوی و پەلەپەل دا عەرەقی کردبۆوە. درکەزییەکان دەچزان بە لەشیاو بە پەستییەوە جنێوی بە خۆی دەدا، کەوتبووە نێو کۆڵانە تاریك و چۆڵەکان کە بچێ بۆ ئۆردوگاکە، لە پڕ تووشی کۆمەڵە گەنجێك بوو، ئوکوردوێنێك بە دەنگێکی گڕو توند شیعرەکانی ساراتفی لێ دەدا، ئاگری جگەرەکانیان لە تاریکییەکەدا دەبریسکایەوە. سەدای ئاوزەنگی و شمشێر لە ئاسمانا دەنگی دەدایەوەو کیژان بە شادییەوە دەیانقریواند، هەموو شتێك لە سەماو جوڵانا بوو. متچیك بە تەنیشتیانا تێپەڕی و زاتی نەکرد پرسیاری ڕێگەکەیان لێ بکات. خۆ ئەگەر لە پێچی کۆڵانەکەدا تووشی تارماییەکی تەنیا نەبوایە ئەوا دەبوو تاکو بەیانی لە نێو کۆڵانەکاندا وێڵ بێ.

متچیك کە گەییە ئاستی تارماییەکە پرسی: هاوڕێ ئۆردوگا لە کوێیە؟ ئەمجا ماروسکای ناسییەوە، بە شپرزەییەکی تەواوەوە گوتی: مەرحەبا!

ماروسکا بە سەرسامی وێستا، پاشان بە دەنگێکی لەرزۆك وەڵامی دایەوەو گوتی: دەستی ڕاست، دەرگای دووەم. چاوەکانی متچیك بە جۆرێکی سەیر بریقانەوەو بێ ئەوەی چ شتێکی دی بڵێ یا سەیری دواوە بکات ملی ڕێگاکەی گرت.

متچیك لەبەر خۆیەوە تێفکری! چۆن، ماروسکا! بێگومان ئەویش لێرەیە. ڕێك و ڕاست وەکو ڕۆژانی هەوەڵ هەستی بە تەنیایی کرد. چەندین یادگار لە شێوەی ماروسکا، تاریکی کۆڵانە نەناسراوەکان، ئەو پیرە ماینەی کەوتبووە ئەستۆی و نەیدەزانی چی لێ بکات، ئابڵۆقەیان دابوو.



وەختێ گەییە ئۆردوگا بیری ئەوەندە ئاڵۆز بوو، نەیدەزانی بۆچی هاتووە بۆ ئێرەو دەبێ چ شتێ بڵێ و هەنووکە چ بکات.

کومەڵە پارتیزانێك لە ناوەندی حەسارێکی خاڵی و گەورەدا, لە دەوری ئاگرێکی گەورە راکشابوون. لڤنسون لە پاڵ ئەوان و لەسەر هەردوو چۆکان، کۆریایی ئاساکان بە جۆرێ دانیشتبوو دەتگووت ئەفسونی بڵێسەی پڕ دووکەڵ و قرچە قرچی دارگرتویەتی، بەلای متچیکەوە لە جاران پتر لە کورتە بالاّیانی چیرۆکی پەریان دەچوو، متچیك چووە پێشەوەو لە پشتییەوە وێستا. چ کەسێك گوێی نەدایێ. پارتیزانەکان هەموویان بە نۆرە حەکایەتی بێ سەرو بەریان دەکرد. لە هەموو حەکایەتەکاندا قەشەیەکی گەوج هەبوو، و ژنێکی هەوەس بازی هەبوو. ئەنجام گەنجێکی بە تەجرەبە قەشەکەی فریو دەداو سەرنجی ژنەکەی بۆ لای خۆی رادەکێشا. بەلای متچیك-ەوە گێڕانەوەی ئەم حەکایەتانە بۆ سەرگەرمی نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە جگە لەم بابەتە حەکایەتانە چ شتێکی تریان نەدەزانی, بۆ خۆیان بێ خەم و خەیاڵ پێدەکەنین، بەڵگەش ئەمە بوو کە لڤنسون تەواوی ئەو ماوەیە بەوردی گوێی دەگرت و بە قاقا و نیاز پاکییەوە پێدەکەنی, وەختێ پێشنیازیان کرد کە هەنووکە نۆرەی لڤنسون-ە، ئەویش حەکایەتێکی خۆشی گێڕایەوە. چونکە خوێندەوارترین ئەندامی گروپەکە بوو حەکایەتەکەشی لەگشت حەکایەتەکان ماموستایانەتر بوو، بەلاّم لڤنسون بێ خۆ شێلوکردن، بە هێورییەکی تەوس ئامێزەوە حەکایەتە دەستکردەکانی دەگێڕایەوە. بێ هیچ جۆرە نیگەرانییەك وشەی ناشیرین و کرێت لە زاری دەرژاو دەتگوت ئەم وشانە هەرگیز لە زاری ئەوەوە دەرنەچوون.

متچیك کە لڤنسونی بینی، حەزی دەکرد ئەمیش حەکایەتێك بڵێ، بەلاّم دەترسا هەموویان چاوی تێ ببڕن و ئەمەش خۆی لە خۆیدا شتێکی ترسناك بوو، متچیك لە کاتێکدا بە دڵ و بە گیان گوێی بۆ ئەو حەکایەتانە رادەدێرا، لای وابوو دەبێ پارتیزانەکان لە گێڕانەوەی ئەم جۆرە حەکایەتانە شەرمەزار بن، وا خۆی دەنواند کە ئەم لە ئاستی ئەوان بالاّترە.

متچیك خۆی لە خۆیدا بێزارو پەست بوو، کە ئەوانی بەو جۆرە بینی، بە تایبەتی لڤنسون، توڕە بوو و کەوتە رێ. بە جۆرێکی خەمبار لێوەکانی هەڵقورتاندو لەبەر خۆیەوە گوتی: هەر بیرشی لێ ناکەمەوە. بە هەر حاڵ من حەقم بەسەر ئەو ماینەوە نییە، با بتۆپێ بزانم ئەوسا چم لێدەکەن، هەر غەمیشم نییە.

رۆژانی دواییش خۆی لە ماینەکەی تێنەگەیاند. تەنیا بۆ مەشق سواری دەیبردە دەرێ. هەندێ جاریش ئاوی دەدا ئەگەر فەرماندەکەی جار جارێ بە رێکەوت پێی داگرتبا کە ئاگاداری ئەسپەکە بکات، ئەوا کوبراك هەرگیز خۆی لە کاروباری نێو لقەکە تێنەدەگەیاند. کارەکان بە رۆتینی ئەنجام دەدران. زیوچیخا هەمیشە برسی و تینوو بوو، ئازای گیانی گڕوو بوو بوو. مەگەر بە رێکەوت خێرەو مەندێك ئاوڕی لەو حەیوانە بدایەتەوەو شتێکی بکردایەتە بەری.

متچیك هەنووکە وەکو بەرەڵلاّیەکی لە خۆ رازی دەسوڕایەوەو نەفرەتی هەموویانی دژ بە خۆی دەوروژاند.




لە هەموو لقەکەدا تەنیْ دوو کەس کەم تا زۆر دۆستی متچیك بوون پیکاو سیسکین. تێکەڵ بوونی لەگەڵ ئەوانیشدا لەبەر ئەوە نەبوو کە نرخێکی بۆ تێکەڵ بوونیان دادەنا، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە نەیدەتوانی لەگەڵ خەڵکانی دیدا هەڵکا. سیسکین هەوڵی دەدا خۆشەویستی متچیك بەلای خۆیا راکێشێت.

متچیك کە لەگەڵ سەر دەستەکەیدا، لەسەر ئەوەی گوایە تفەنگەکەی جوان پاك نەکردۆتەوە، کرد بەشەڕ، تۆراو بە تاقی تەنیا چوو لە عەمارەکەدا راکشاو چاوی بڕییە بنمیچەکە، سیسکین بە ئەسپایی خۆی گەیاندە لای و گوتی: زۆر پەستی؟ بیبوورە، کابرایەکی جوتێری نەزانە بۆ ئەوەندە بیر دەکەیتەوە؟ متچیك ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: مەسەلەکە ئەو نییە......

– ئۆە دەزانم، بیْ تاقەت بوویت، ئەمە شتێکە تەنیا من تێی دەگەم.

سیسکین خۆی دا بەسەر پێشی گالیسکەیەکی شکاودا, بە هەمان حەرەکەی ئاسایی خۆی پوتە بۆیاخ کراوەکانی هەڵکێشا: دەزانیت گەر راستیت دەویْ منیش بیْ تاقەت بووم. ئاخر پیاوێکی خوێندەوار لێرەدا پەیدا نابیْ: تەنیْ یەك لڤنسونە کە لەوانەیە... ئەگەرچی ئەویش... شانەکانی هەڵتەکاندو بە نیگایەکی پڕ ماناوە لە پێڵاوەکانی ورد بووەوە.

متچیك بە تاسەوە پرسیاری کرد: ئەگەر چی ئەویش چی؟

سیسکین بە پێکەنینێکی تاڵەوە درێژەی دایێ: بەڵیْ، دەزانی چییە، ئەویش خوێنەوارییەکی زۆری نییە، هەر ئەوەیە کە پیاوێکی بە تواناو لێهاتووە. هەرچییەکی هەیە لە ئێمەوەیە، باوەڕ ناکەی! بەڵیْ بۆ وێنە تۆ لات وایە پیاوێکی زۆر ئازایە، بێگومان ئێژی ژەنەڕاڵێکی راستەقینەیە. وشەی ژەنەڕاڵی بە جۆرێکی تایبەتی درکاند: قسەی قۆڕە! من دڵنیات دەکەم هەموو ئەمانە ئێمە دروستمان کردووە. هەر نەختێك لە جۆریْ ئەم پاشەکشەیە ورد بەرەوە: لە بری ئەوەی جەزرەبەیەکی کوشندە لە دژمن بدەین، هەڵاتین هاتینە نێو ئەم کونە پیسەوە، تیْ دەگەی! ئەویش بە بیانوی گەلێك مەسەلەی ستراتیژییەوە، رەنگە لە شوێنانی تریش هاورێکانمان بکوژرێن، بەڵام ئێمە بیانووی پاراستنی ستراتیژیەتمان بە دەستەوەیە! ئەمجا بیْ ئیختیار بزماری ناوەندی پێچکەی گالیسکەکەی دەرهێناو بە هەڵچوونەوە خستییەوە جێی خۆی.

متچیك زۆری لا زەحمەت بوو باوەڕ بکات حەقیقەتی لڤنسون ئەوە بیْ کە سیسکین دەیڵیْ، بەڵام قسەکانی سیسکین–ی لە گیان خۆش بوو. چونکە ماوەیەکی زۆر بوو قسەیەکی دڵگیری لەگەڵ چ کەسێك دا نەکردبوو و لەبەر هەندیْ هۆ حەزی لیْ بوو ئەوە قبوڵ بکات کە بەلای کەمەوە بڕێك حەقیقەت لە قسەکانی سیسکیندا هەیە. متچیك پشتی راست کردەوەو پرسی: ئەریْ ئەم قسانەت بەڕاستە؟ خۆ من ئەوم بەپیاوێکی مەزن دەزانی.

سیسکین راچڵەکی و گوتی: مەزن! شێوازی قسەکەی سیسکین دەگۆڕاو بۆنی خۆ بە زل زانی تیْ دەگەڕا: چ هەڵەیەکی گەورەیە! تۆ چاك تەماشا بکە. بزانە چ خەڵکانێکی لە دەوری خۆی خڕ



کردۆتەوە! ئاخر ئەم باکلانۆفە کێیە؟ منداڵێکە. هەڵبەتە لڤنسون بە خۆشی زۆری حسێب بۆ دەکات. بەڵام ئەمە چ مەسئولێکە؟

دەڵێی ئاخر زەلامە! بێگومان دەیتوانی خەڵکی باشتر پەیدا بکات. من هەر چەندە نەخۆش و زامدارم، حەوت گوللەم بەرکەوتووە. جارێکیش گوللە تۆپم بەسەردا تەقەییەوەو تازەش حەز ناکەم کارێکی وا پڕ لە سەر یەشەم لە عۆدەدا بیّ– بەڵام نەبیّ بە خۆ هەڵکێشان دەتوانم بە پڕکێشییەوە بڵێم کە لەو کەمتر نیم.

– لەوانەیە فەرماندە نەزانیّ کە تۆ ئەوەندە شارەزای هونەرەکانی جەنگیت؟

– پەکو، ئەو نازانیّ! چما بەری رۆژ بە بێژینگ دەگیریّ؟! بڕۆ لە کیّ دەپرسیت، بپرسە! بێگومان زۆربەیان لە بەغیلی و حەسوودیدا درۆت لەگەڵ دا دەکەن، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەمە حەقیقەتێکی روناکە!.

متچیك وردە وردە متمانەی بە سیسکین پەیدا دەکردو رازە نهێنییەکانی خۆی بۆ باس دەکرد. هەموو رۆژیّ پێکەوە بوون، هەر چەندە متچیك پاش چەند جارێك لەو بابەتە گفتوگۆیانە، سیسکینی بە ناحەق دەزانی و لە دڵی خۆیدا لێی رازی نەبوو، کەچی تەواو هۆگری بوو بوو، بیّ ئەو هەڵی نەدەکرد، تەنانەت هەندیّ جار کە نەیدیبا، خۆی پیّ نەدەگیراو دەچووە لق بۆ دیدەنی. سیسکین متچیکی فێر کرد کە چۆن لە ئێشك گرتن و کاروباری ئاشخانە خۆی بدزێتەوە– ئەو کارانەی کەبە ماوەیەکی کەم لەبەر چاوی کەوتن و بەلایەوە بوون بە بێگار.

ئیدی ژیانی پڕ جۆش و خرۆشی هێزەکە دەستی پێکردەوە، ئیدی متچیك بزوێنەری سەرەکی و میکانیزمی ئەم ئامێرە جەنگییەی دەرك نەدەکرد. گەلیّ کار ئەنجام دەدران و ئەو لێی حاڵی نەدەبوو، ئیدی فێر بوو بوو بەرپەرچی ئەوانی دی بداتەوەو لە کەسیان نەترسێت, چونکە بە رواڵەت ئەویش وەکو ئەوانی دی رەش هەڵگەڕابووغارابوو، خۆر بردبووی، جل و بەرگەکەی ناڕەحەتی نەدەکرد، بەم چەشنە هەر چەندە بە رواڵەت لە وان جیا نەدەکرایەوە، بەڵام گشت خەون و ژیانە تازەو پڕ ئازایەتییەکەی لە جۆرە نامۆییەکدا توایەوە.





**سەرەتای پاشەکشێ**

ماروسکا کە متچیکی بینی، بەسەرسامییەوە هەستی کرد ئەو رق و کینەی جارانی بەرانبەری نییە، بەڵکو هەستی بە گێژییەکی تەواو دەکرد —بۆ ئەو نارەسەنە هەمدیس لەبەر دەممدا قوت بووەوە؟ ئەم هەستە خۆ بەخۆیە وای لە ماروسکا کرد کە تووڕە بێ، لەگەڵ ئەوەشا ئەم رووبەڕووبوونەوەیە بەجۆرێ پەرێشانی کرد کە پڕ بە دڵ حەزی دەکرد لەگەڵ یەکێکدا قسان بکات.

ئەمەی بە دوبوف گوت: ئێستاکێ کە لە کۆڵانەکەوە دەهاتم، ئەو کوڕەی لقەکەی شالدیبا، لە پێچەکەدا لەبەردەممدا قووت بووەوە، لە بیرتە —ئەو یارۆیەی کە بە خۆم هێنام.

– ئێ؟

– ئێ، ئێ. پرسیاری ئۆ ردوگای لێکردم، منیش گوتم بە دەستە راستا، دەرگای دووەم.

دوبوف بە تەواوی لە قسەکەی ماروسکا حاڵی نەبوو بوو، پێی وابوو هێشتا مەبەستە سەرەکییەی نەوتووە، بە پەلە پرسی: ئێ ئیتر؟

ماروسکا خۆی لە خۆیدا تووڕە بوو، هێندەی دی هەڵچوو: ئێ ئیتر دیتم و تەواو... دەتەوێ چ ببێ؟

ماروسکا کە کاسەی سەبری لێو ڕێژ بوو بوو، کوت و پڕ تاسەی قسەکردنی نەماو لەبری ئەوەی بچێتە سەیران و سەمای شەوانە کە پێشتر بڕیاری دابوو، یەکسەر رۆیی بۆ کادێنەکەو لەسەر کایەکە راکشا. بەڵام نەیتوانی بنوێ.

بیری ئاڵۆزو تێکەڵ و پێکەڵ، چەشنی بارێکی گران قورسایی دەخستە سەرشانی. وای هەست دەکرد متچیك بە ئانقەست خۆی نیشانی داوە، تا ناچاری بکات کارێکی خەڵەت بکات. بەم جۆرە ماروسکا سەراپای رۆژی دواییشی بە نارەحەتی بوراند. تەواوی رۆژەکە سەرگەردان و بێ ئۆقرە بوو. لەگەڵ ئەو ئارەزووەدا دەجەنگی کە هانی دەدا دووبارە بڕوات، متچیك ببینێ، بە توندی ئیعترازی لە فەرماندەکەی دەگرت کە: بۆچی بێ ئیش و بێ کار لێرە دانیشتووین و چ کارێك ناکەین؟ لەبێ تاقەتی و بێ کاریدا لێرە بۆگەن بووین، ئاخر ئەم لقنسونە چ بیرێ دەکاتەوە؟ ئەرێ، دیارە خەریکە بیر دەکاتەوە کە چۆن بتوانێ چاکتر ماروسکا مژول بکات. هێندە دانشت و بیری لەم مەسەلەیە کردەوە نافەکی پانتۆڵەکەی سوا.

دوبوف پەی بەو هەڵچوونە دژوارانەی ناخی ماروسکا نەبرد. ماروسکا تووشی هیچ هاو خەمێ نەبوو، بۆیە بە دڵی رەنجاوەوە هەستی کرد کە ئەگەر بە زووی کارێکی سەرەکی نەیەتە پێشێ، ئەوا دەبێ پەنا بەرێتە بەر بادەنۆشی. بۆ یەکەمجار لە هەموو ژیانیا، بە هوشیارییەوە لەگەڵ هەڵچوونە



دەروونییەکانیا دەجەنگی. ویستی ئەوەندە پتەو نەبوو، تەنیا ڕێکەوتە لە پرەکان جڵەوی ورە بەردان و بەزینیان دەگرت.

ڤنسون بە هۆی پاشەکشێ بۆ شوێنێکی دوور، تا ڕادەیەك پێوەندیەکانی لەگەڵ لقەکانی دیدا پچڕا بەشێ لەو هەواڵانەی کە هەندێ جار بە خۆی سەرپەرشتی کۆکردنەوەی دەکردن، بۆنی لێکدابڕانی ترسناکی لێدەهات. ناوچەی یۆلاخە بۆنی خوێنی لێدەهات.

ڤنسون بڕیاریدا لە ڕێگای نهێنی دارستانەکەوە، کە دەمێ ساڵ بوو پێی هیچ مرۆڤێکی نەکەتبووە سەر، خۆیان بگەیەننە ڕێگای ئاسن. ڤنسون مەعلوماتی ئەوەی دەستکەوتبوو کە بەو زووانە قیتاری سوپایی بە جل و بەرگ و چەکەوە بە وێدا تێدەپەڕێ، کارگوزارانی قیتارەکە قەولیان دابوویە کە بە وردی ڕۆژو سەعاتی تێپەڕبوونی قیتارەکەی پێ ڕابگەیەنن. چونکە دڵنیا بوو کە سنووری تەقریبی هێزەکە درەنگ یا زوو کەشف دەبێ و دەیزانی گوزەراندنی زستان لە دارستاندا بەبێ پێویستی و چەك و جل و بەرگی گەرم مەحاڵە، بۆیە بڕیاری پەلامارێکی بروسکە ئاسایدا. گونجارنکو بە پەلە مینەکانی نایەوە. دەستەکەی دوبوف لە شەوێکی تەمومژدا کە بە دزییەوە خۆی گەیاند بووە ناوچەی دژمن، لە پڕ لەسەر ڕێگای ئاسن قوت بووەوە.

مینەکەی گونجارنکو بێ ئەوەی زیان بە تاقە نەفەرێ بگەیەنێ، ڤارگونە بارییەکانی لە ڤارگونە نەفەر بەرەکان ترازاند، لەگەڵ دەنگی گرمەدا، ڕێڵە شکاوەکان لەنێو دووکەڵی تەقینەوەی دنیامیتدا چوون بە حەواداو پاشان کەوتنەوە سەر زەوی، پارتیزانەکان سیمی دوای مینەکەیان بەست بە تەلی تەلەگرافەوە تا ئەو خەڵکانەی دواتر ئەمە دەبینن ماوەیەك بیر بکەنەوە کە چۆن و بۆچی ئەم سیمەیان بە تەلی تەلەگرافەوە هەڵواسیوە.

وەختێ دەورێی ناوچەکەی دراوسێیان بە سواری هەڵمەتیان بردە سەر شوێنی ڕووداوەکان، ئەسپە بار قورسەکانی دوبوف لە قەڵای سویباگینودا هەڵوەستەیەکیان کردو پاشان بەنێو تاریکی شەوا لە ڕێگای دۆڵە تەنگەکانەوە درێژەیان بەرێی خۆدا، لە ماوەی چەند ڕۆژێکا بێ ئەوەی تاقە نەفەرێکیان لێ بفەوتێ خۆیان گەیاندە گوندی شی بی شی.

ڤنسون گوتی: باشە، باکلانوف ئێستاکێ چاك بیپارێزە! مەعلوم نەبوو بەو چاوە لێڵانەوە بە جدی قسان دەکات یان بە شۆخی. هەر ئەو ڕۆژە هەموو ئەو ئازووقەیە لە عەمارەکەدا بوو دابەشی کردو قەمسەڵەی سوپایی گەرم، شمشێرو نانی سوخاری دانێ، تەنیا هەندێ شتی هێشتەوە کە پڕ بە خورجێك بوو.

هەنووکە سەرانسەری یولاخە بە دەستی کەنارەکانی ئاسووریدا، بە دەستی دژمنەوە بوو، ئێستا هێزی تازە لە گەرووی ئیروخدزادا مۆڵەتی دابوو، دەورێی ژاپۆنیان لە هەموو شوێنێکا دەگەڕان. پتر لە چەند جارێك لەگەڵ دەورێکانی ڤنسون دا لە یەکیان دابوو. لە ئاخرو ئۆخری مانگی هەشتا هێزی ژاپونیان لە بەری چۆمەکەوە دەستیان بە سەرکەوتن کرد. زۆر بەووردی و وریایی و خاوییەوە دەهاتنە پێشەوە. هێزی پالێشت لە دوو قۆڵەوە ئاسایشی سەرەکی هێزەکەیان دابین دەکرد. مرۆڤ دەیتوانی لە جۆری هاتنە پێشەوەو توانای متمانە بەخش و وریایاندا لە هەمان کاتدا کوێرانەیاندا- هەست بە ورەی پۆڵایینیان بکات.



دەوریێکانی لڤنسون بە چاوی ترس لێنیشتووەوە دەگەڕانەوەو هەواڵی ناکۆك و بێ سەرو بەریان رادەگەیاند.

لڤنسون بە ساردیەوە پرسی: دەتەوێ چ بڵێی؟ دوێنێ گوتت لە سولومنایا بوون. ئێستاکێ دەڵێی ئەمڕۆ بەیانییەکەی لە موناکینو بوون. ئەم هەواڵە وا ناگەیێنی کە بیانەوێ پاشەکشێ بکەن؟

دەوریێکە بە دەمەلاڵکێوە گوتی: نازانم, رەنگە ئەوانەی لە سولومنایادا دیتمن پێشقەرەوڵەکانیان بووبن...

- باشە، ئەدی چۆنت زانی ئەوانەی کە لە موناکینو مۆڵیان داوە بەشی سەرەکی هێزەکەن و پێشقەرەوڵ نین؟
- جووتیارەکان وایان دەگوت.
- قوڕ بەسەر خۆت و جووتیارەکانت، ئەدی ئیشی تۆچ بوو؟ ئەوجا دەوریێکە لە خۆیەوە حەکایەتێکی دروست کردو ئەوەی روونکردەوە کە چۆن زیاتر چوونە پێشەوە لە دژمن مەحاڵ بوو. بەلام لڤنسون ئەوەی بۆ دەرکەتبوو کە دەوریێکە ئەوەندە لە چپە چپی ژنان ترساوە، زاتی نەکردووە لە دەفەرسەخان پتر لە دژمن نزیك بێتەوە. لە نێو دەوەنەکانا دانیشتوەو جگەرەیەکی داگیرساندەوەو ئیدی بۆ خۆی وەختی گوزەراندووە تا لە کاتی خۆیدا بگەڕێتەوە بۆ لق.

دەوریێکە لە کاتێکا چاوە فێڵبازە دێهاتییەکانی دەتروکاندو سەیری لڤنسونی دەکرد، لەبەر خۆیەوە تێفکری: خۆزیا خۆتم لەوێ دەبینی، بزانم چی....!

لڤنسون فەرمانی دایە باکلانۆف، دەبێ خۆت بچی بۆ ئەوێ و سەرێ بدەی. وەلا وەکو مریشکان سەرتان دەبڕن. تۆ هەقت بەسەر ئەمانەوە نەبێ، یەکێکی تریش لە گەڵ خۆتا بەرەو بەر لە سپێدە هەرەکەت بکە.

باکلانۆف پرسی: کێ لەگەڵ خۆما بەرم؟ ئەگەرچی هەموو ناخی لە ترسی جەنگ هاتبووە لەرزین، بەلام هەوڵی دەدا خۆی جدی وبە تەنگەوە هاتوو بنوێنێ، چونکە بە پێویستی دەزانی وەکو لڤنسون هەستی دەروونی خۆی وەشێرێ.

- کێت پێ خۆشە بیبە، بزانە ئەو کوڕە تازەیە لەگەڵ خۆتا بەرە، ئەوەی لە دەستەکەی کوبراکە.... نێوی چییە —متچیك؟ دەرفەتێکی چاکیشە تا بزانی چتۆ پیاوێکە، تێدەگەی؟ باشی دەرهەق نالێن، رەنگیشە بە هەڵەدا چووبن.

ئەم ماموریەتی تاقی کردنەوەیە بۆ متچیك خۆش بوو. لەم ماوە کەمەدا کە لە هێزەکەدا خزمەتی دەکرد، کۆمەڵێ کاری ئەنجام نەدراو، بەڵێنی بەجێ نەگەیەنراو و، چاوەڕوانی زۆر، لەسەر یەکدی کەڵەکەبوو بوون...

ئەنجامدانی هەر یەکێکیان ئەگەر تاك تاك بخرانایە بەر چاو نرخ و بایەخێکی ئەوتۆیان نەبوو... بەلام ئێستا بە تێکڕایی، بە جۆرێکی سەخت و ناخۆش باری شانیان قورس دەکرد، هەلاتن و خۆ دزینەوەش لەم ئەرکانە، مەیسەر نەبوو. بۆیە وای دەهاتە بەرچاو کە دەتوانێ بە تەکانێکی بوغرایانەوە خۆی لە هەموویان رزگار بکا.



بەر لە سپێدە کەوتنە ڕێ. دارستانەکە بەسەر کێوەکانەوە بە ئاستەم سووری دەنواند. دووەم بانگی کەڵەباب، لە گوندەکەی بنار شاخەکەوە دەگەییە گوێ.

دنیا ساردو تاریك و هەندێك سامناك بوو. هەستی تووش بوونی خەتەر لەلایەك و ئومێدی سەرکەوتن لەلایەکی ترەوە گیانێکی جەنگاوارانەی ئەوتۆی لە بوونی هەردووکیاندا دروست کردبوو کە بە سەر هەموو هەستەکانی تریاندا زاڵ بوو. خوێن لە دەمارەکانیانا دەکوڵا ماسولکەکانیان تورت و سفت بوو بوو. دنیا ساردو بەکزەو ئاوسی هەورە گوڵە بوو. باکلانوف گوتی: پەنا بە خوا ئەسپەکەت عەنتکەیە! ئەوە قەت وریایی ناکەیت؟ واتێ دەگەم کوبراك ی گەوج فێری نەکردوویت کە چۆن وریایی و خزمەتی بکەی، ها؟

باکلانوف باوەڕی نەدەکرد کە یەکێك هەر بە ئاستەم سەرو سەختی لە گەڵ ئەسپدا هەبێ، ئەم ئەسپەی بەم ڕۆژە بگەیەنایە: فێری نەکردویت! ها؟

متچیك بە نیگەرانی وەڵامی دایەوە: بەڵێ، بە خۆت دەزانی و دەبینی کە ئەو زۆر کارامە نییەو پیاوی کۆمەك کردن نییە. پیاو نازانێ ئەم شتانە لە کێ بپرسێت؟ چونکە بەخۆی لە درۆکەی شەرمەزار بوو، لەسەر زینەکە ئۆقرەی نەدەگرت و سەیری باکلانۆڤ نەدەکرد.

– چۆن کەس نییە! ئێمە ئەو هەموو خەڵکەمان هەیە، هەموویان شارەزای ئەسپ و سوارین، سەربازی زۆر چاکن.

وێڕای ئەو بیرانەی سیسکین خستبوویە مێشکی متچیك–ەوە، متچیك بەخۆیشی, خۆشی بە باکلانوف دا چوو، بەلایەوە پیاوێکی ڕێکو پێك بوو. باکلانۆف بە جۆرێ لەسەر زینەکە دانیشتبوو، دەتگوت پێوەی دووراوە، چاوە قاوەییەکانی زیت و زرنگ دیار بوون، مێشکی بە یەك کەڕەت هەموو شتێکی وەردەگرت و دەست بەجێ شتە گرنگ و بێ کەڵکەکانی لێکدی جودا دەکردەوەو دەگەییە دوا ئەنجام.

– شەیتان بە نەحلەت بی، نازانم زینەکەت بۆ ئەوەندە دەلەقێ، هێی کوڕە ئەتو تا بۆت کراوە پاڵدۆکەت توند بەستووەو بەرۆکەکەت شل بەستووە، دەبێ بە پێچەوانەوە بیبەستی. بێنە با چاکی بکەم، بەر لەوەی متچیك تێ بگات و بزانێ چی دروست و چی هەڵە بووە، باکلانۆف دابەزی و مژۆلی تەنگ و پاڵدۆکە بوو.

– خۆ دیقم کرد، وەرە خوارەوە –تۆ ئەم ئەسپە دەفەوتێنی، پێویستە سەر لە نوێ زینی بکەینەوە.

پاش ئەوەی چەند فرسەخێکیان بڕی، متچیك قەناعەتی هێناکە باکلانوف زۆر لەو چاکترو زیرەکترە، پیاوێکی بە هێزو ئازاو عەگیدەو دەبێ هەمیشە بێ چەندو چون گوێ ڕایەڵی بێ، لەلایەکی تریشەوە دۆستایەتی و خۆشەویستی باکلانۆف لەگەڵیا بێ فڕوفێڵ بوو. هەر چەندە باکلانوف دەیزانی کە لە متچیك لێهاتوو ترە، بەڵام بە چەشنێکی هاو بەرانبەری قسەی دەکرد. بە جۆرێکی بێ وێنە هەوڵی دەدا نرخی ڕاستەقینەی متچیك بدۆزێتەوە.

– کێ تۆی بۆ لای ئێمە نارد؟

– بە خۆم هاتم, بەڵام ماکسیمالستەکان ڕێنوێنیان کردووم کە ئێرە لە کوێ بدۆزمەوە.



وەختێ متچیك کاردانەوە ئاڵۆزەکەی ستاشینسکی بیر کەوتەوە، هەوڵی دا ئەوە روون بکاتەوە کە بە چ جۆرێ ناردوویانە.

- ماکزیمالیستەکان؟ خراپت کردووە تێکەڵاوی ئەوانە بوویت– ئەوان جگە لە چەنەبازی چ ئامانجێکی تریان نییە.
- من چ پێوەندییەکم پێیانەوە نەبوو، ئاشنایەتیم لەگەڵیاندا تەنیا لە بەر خاتری چەند دۆستێکی دەورانی خوێندکاریم بوو، کە لەگەڵیاندا بوون، بۆیە منیش.....
- تۆ ئامادەییت تەواو کردووە، ها؟
- چی؟ بەڵێ تەواوم کردووە.
- زۆر چاکە منیش چوومە قوتابخانەی پیشەسازی, دەمویست بەشی بەڕادی تەواو بکەم، بەڵام شانس نەیکردو تەواوم نەکرد، تێ دەگەی؟ من زۆر درەنگ دەستم پێکرد، ئەوجا بە دەنگێکی سکاڵا ئامێزەوە لەسەری رۆیی: بەر لەوە ناچار بووم لە کۆمپانیایەکی کەشتی رانیدا کار بکەم، تا برا چکۆلەکەم گەورە بێ و بتوانێ کار بکات، ئیدی پاش ئەوەش ئەو بەزم و رەزمە دەستی پێکرد....

پاش هەندێك بێدەنگی بە ئەسپایی درێژەی دایێ: بەڵێ ئامادەیی.... منیش سەردەمانێ گەنج بووم و حەزم دەکرد بچمە ئامادەیی، بەڵام باشە تۆ لەهەموو شتێکی شارەزای.

ئەمەی متچیك بە رێکەوت دەربارەی ئامادەیی باسی کرد، بەڕواڵەت زنجیرە بیرەوەرییەکی مردووی لە مێشکی باکلانوفدا زیندوو کردەوە. متچیك بە هەڵچوونێکی کوت و پڕەوە دەستی بەم باسە کرد کە تەواو نەکردنی ئامادەیی بۆ باکلانوف نەك تەنیا خراپ نەبووە بەڵکو زۆریش باش بووە، ئەوجا بێ ئەوەی مەبەستەکەی خۆی بزانێ نیازی وابوو قەناعەت بە باکلانوف بکات کە سەرەڕای بێ بەش بوونی لە خوێندن، هێشتا هەر پیاوێکی بە هۆش و زرنگ و گورجە، بەڵام باکلانوف هەستی نەدەکرد کە بێ بەش بوونی لە خوێندن چ چاکەیەکی تێدابێ و بە شێوەیەکی گشتی چ شتێکی لە باسە ئاڵۆزەکەی متچیك هەڵنەدەکڕاند، بۆیە زنجیرەی قسە دۆستانەکانی پچڕا.

هەردووکیان لە کاتێکا بە پاژنەی ئاوزەنگیەکان دەیانژەندە ئەسپەکانیانەوە، ماوەیەك بەبێ دەنگی رۆیشتن.

لە رێگادا زۆر جار تووشی دەورێکانی خۆیان دەبوون، دەورێکانی وەکو جاران بێ شەرمانە درۆیان دەکردو باکلانۆف تەنیا سەری دەلەقاند، باکلانوف و متچیك لە مەزرایەکدا دابەزین کە سێ فەرسەخان لە گوندی سولومبانا دوور بوو، ئەسپەکانیان لەوێ جێ هێشت و خۆیان بە پێیان بەرەو گوندەکە چوون، هەتاو بەرەو کەلی ئاوا بوون دا دەکشا.

رەفتەی رەنگاو رەنگی سەری ژنانی دێهاتی گیانی دەخستە بەر کێڵگەو مەزرا کپەکان. سێبەری کاڵ و خەستی گیشە زللەکان بە جۆرێکی تەسەلا بەخش بە هەموو لایەکا پەرت بوو بوو، لە رێگادا تووشی گالیسکەیەك بوون، باکلانوف لێی پرسین کە ئاخۆ ژاپۆنییەکان لە سولوفایا جێگیر بوون.



- ئێژن ئەم بەیانییە (5) دەورییەی ئەوانیان لەم نزیکانە دیتووە، بەڵام ئێمە بە درێژایی ڕۆژەکە چ ئاسەوارێکی ئەوانمان نەدیتووە نەحلەتیانە... بریا وازیان دەهێنا تابەلای کەمەوە حاسڵاتەکەمان خڕ دەکردەوە!.

دڵی متچیک کەوتە لێدان، بەڵام نەترسا، باکلانوف گوتی: ئەم قسەیە وا دەگەیەنێ کە بەڕاستی لە موناکینو دان و ئەوە (5) کەسەش دەورێکانیان بوون. ئێستا دەتوانین بچینە ناو گوندی.

کە گەیشتنە ناو گوند، سەگەل بە حەپە حەپ لێیان خڕبوونەوە. گالیسکەکە لە پەنای میوانخانەیەك دا وێستا بوو، ئەمان بە تەکیا ڕەت بوون، چەپکێك گیای وشك بە دەستەکێکی سەر دەرگای میوانخانەکەوە بوو. میوانخانەکە هەر بەو نیشانەیەش دەناسرایەوە. بە دوو قوڵی هەندێ نانیان گوشییە نێو شیرەوەو خواردیان. پاشان وەختێ متچیك ڕووداوە ترس وروژێنەکانی ئەو ڕۆژەی وەبیر خۆی دەهێنایەوە، سیمای باکلانوفی لەبەر چاو بەرجەستە دەبوو کە چۆن بە ڕووخۆشی و گەشییەوە لە کاتێکا چۆڕاوگەی شیر بەسەر لێوەییەوە سپی دەچۆوە، لە میوانخانەکە دەرچوون. هێشتا چەند هەنگاوێ دوور نەکەوتبوونەوە، تووشی ژنێکی قەڵەو بوون کە داوێنی کراسەکەی گرتبووە دەستییەوەو بەغار لەکۆڵانێکەوە دەهاتە دەرێ. کوت وپڕ لەبەر دەمیاندا وێستاو بەرد ئاسا لە جێی خۆی چەقی. چاوەکانی دەتگوت لە ترسا دەرپۆقیون. وەکو ماسیەك لە ئاو دەرهێنرابێ دەمی کردەوەو هەندێ هەوای هەڵمژی، دەست بە جێ بە دەنگێکی تیژ هاواری کرد: ئەهای کورەکانم بۆ کوێ دەڕۆن؟ یەك دنیا ژاپۆنیان ڕژاونەتە دەوروبەری قوتابخانەکە! خەریکە بۆ ئێرە دێن! خێرا غاردەن، خەریکە دێن.

بەر لەوەی متچیك لە قسەی ژنەکە حاڵی بێ، چوار سەربازی ژاپۆنی لەهەمان کۆڵانەوە تفەنگ بەشان، بە هەنگاوی سوپاییانەوە هاتنە دەرێ. باکلانوف هاواری کرد. دەمانچەکەی دەرهێنا. تەقەی لە دوانیان کرد. متچیك بە چاوی خۆی بینی پارچەی جلە خوێناوییەکانیان لە پشتەوە کەوتە سەر زەوی . باکلانوف گوللەی سێیەمی تەقاندو دەمانچەکەی لە کارکەوت. یەکێك لە دوو سەربازە ژاپۆنییەکە هەڵات و ئەوی تریان تفەنگەکەی لە شانی هێنایە خوارەوە. لەم ساتەدا متچیك بە هێزێکەوە کە لە ترسا پەیدای کردبوو. چەند تەقەی لەسەر یەك کرد، دوا گوللەی بەر سەربازە ژاپۆنییەکە کەوت و بە دەم ئێش و ئازارو سوێوە کەوتە سەر عاردەکەو بە تلدان ڕۆیی. باکلانوف هاواری کرد: ڕاکە! بەرەو گالیسکەکە!

لە چاو تروکانێکا ئەسپێکیان کردەوە کە خەریکی جووتە وەشان بوو، بەسەر جادەکەو بە نێو تەپ و تۆزدا تێیان تەقاند. باکلانوف لەسەر گالیسکەکە وێستابوو. پەیتا پەیتا بە کۆتایی هەوسارەکەو بە هەموو توانایەوە لە ئەسپەکەی دەدا، بەردەوام ئاوڕی دەدایەوە تا بزانێ کەس دوایان دەکەوێ یان نا. لە نێو گوندەکەوە پێنج شەپیورچی کەوتنە لێدانی شەپیووری خەتەر. باکلانوف بەڕقەوە هاواری کرد: لێرەن، هەموویان لێرەن! هەر هەموویان، زۆربەی هێزەکەیان... دەنگی شەپیورچییەکان دەژنەوی؟.

متچیك چ شتێکی نەدەبیست. لە حاڵێکا لەنێو گالیسکەکە ڕاکشا بوو، هەستی بە گورج و گۆڵییەکی لە ڕادەبەدەر دەکرد. بەخۆی ساغ بوو، سەربازێکی ژاپۆنیشی کوشت بوو، متچیك



بیری لە سەربازە ژاپۆنییەکە دەکردەوە کە لە نێو ئەو خاکە گەرمەدا بەئازارەوە دەتلایەوەو سوێی مەرگ تای لێ هێنا بوو. وەختێ روانیە باکلانوف، سیمای لە رەنگ کەوتووی باکلانوف بەلاوە کرێت و سامناك بوو.

دوای تۆزێك باکلانوف دەستی بە پێکەنین کرد: تا رادەیەك باش هاتینە دەست، وانییە؟ ئەوان هاتن نێو گوندەکەو ئێمەش لەوێ بووین، برادەر بە راستی تۆ جێی متمانەیت. چاوەڕوانی ئەمـــــــــــــــــەم لـــــــــــــــــــــــــێ نــــــــــــــــــــــــــەدەکردیت.

ئەگەر ئەو کارەی تۆ نەبا بە گوللە دایان دەبێژاین! متچیك بە رەنگی زەردەوە کە لە گوڵە گەنمێکی نەگەییوی سیسەوە بوو دەچوو، لە نێو گالیسکەکە راکشابوو و هەوڵی دەدا سەیری باکلانوف نەکات.

نزیکەی دوو قۆناغ بێ ئەوەی کەسێك دوایان کەوتبێ، بە توندی غاریان دا ئەنجام باکلانوف لە پاڵ تاقەدار هەنارێکا کە لق و پۆپی بەڕووی جادەکەدا هاویشتبوو وێستا: تۆ لێرە بە، تا من بچمە سەر درەختەکەو تەماشایەك بکەم، بزانم وەزع و حاڵ لە چ دایە، متچیك کە لەهەڵچوونا زمانی گیرابوو پرسی: بۆ بچیت؟ با دەرچین، دەبێ هەواڵەکە بەرین، ئیدی ئاشکرایە کە هەموویان لێرەن. متچیك هەوڵی دەدا باوەر بە قسەکەی خۆی بکات. بەڵام نەیدەتوانی..... دەترسا لە دەوروبەری دژمندا بوەستن.

- نا، سەبر بکەین باشترە، کوشتنی ئەو سێ کەسە بەس نییە، پێویستە بچینە بنج و بناوانی کارەکەیان.

نیو سەعات لەوە دوا دەستەیەك سوارەی سوپایی لە سولومیباناوە دەرچوون، ناخی باکلانۆف هاتە لەرزین و لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: ئەگەر بمانبینن چ دەکەن؟ ئێمە ناتوانین بەم گالیسکەیە دەرچین. خۆی کونترۆڵ کردو بڕیاری دا تا دەکرێ لێرەدا وەمێنن. متچیك ئاگای لەو پۆلە سوارە نەبوو کە لەولای گردەکەوە دەجووڵان و گەییبوونە ناوەندی رێگاکەی بەینی ئەمان و گوندەکە. باکلانوف لەسەر درەختەکەوە دەیڕوانیە ریزی سفتی ئەو پیاوانەی کە لە گوندەکەوە دەردەچوون و تفەنگەکانیان لە نێو تۆزو گەردا دەبریقانەوە. وەختێ بەرەو ئەو مەزرایەی ئەسپەکانی خۆیان لێ بەجێ هێشتبوو، پاشەکشەیان کرد ئەوەندەیان فشار لە ئەسپەکە کردبوو، تەواو شەکەت بوو بوو، لەوێ سواری ئەسپەکانی خۆیان بوون و لە چاوتروکانێکا بە چوار ناڵە کەوتنە سەر جادەی شی بەشی. لڤنسون بەپێی دووربینی ئاسایی خۆی چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەوانی نەکردو (وەختێ ئەوان گەڕانەوە شەو تاریك بوو بوو) حەرەسەکانی دامەزراند –دەستەکەی کوبراك کە تەنیا سێیەکیان بۆ ئاگاداری ئەسپەکان تەرخان کرابوون، بە پیادە لە پەنای بارستە خۆڵێکی قەڵایەکی چکۆڵەی کۆنی مەغۆلیان سەنگەریان گرت، متچیك ئەسپەکەی بە باکلانۆف سپاردو خۆی لە نێو هاوڕێکانیا مایەوە.

متچیك زۆر شەکەت بوو، بەڵام نەیدەویست بخەوێ. بایەکی ساردو شێدار لە چۆمەکەوە دەهات. پیکا بە دەم خەوەوە دەینالاندو گینگلی دەدا. پوش و گیاکان بە جۆرێکی نا مەفهوم لە ژێر پێی نۆبەچییەکاندا خشەخشیان دەکرد. متچیك لەسەر پشت راکشا بوو و چاوی بڕی بووە



ئەستێرەکان. هەستارەکان لەبن میچی ئاسمانی بێ بن و تاریکا، لە پشت پەردەیەکی ئەستووری تەمەوە هەڵواسرابوون، بەحاڵ دەبینران.

متچیك هەستی دەکرد هەمان بۆشایی باوەشی بە ئاسمانی دڵیا کردووە، چونکە چ هەسارەیەکی تێدا نەبوو، بەڵکو تاریکترو خاڵی تریش دەینواند. بە مەیا ئەو بیرەی لە مێشکا زیندوو بووەوە کە دەبێ فرولوف هەمیشە هەست بەم چەشنە بۆشاییە بکات. کوتوپڕ وای بە خەیاڵا هات کە رەنگە چارەنووسی خۆیشی وابێ. هەوڵی دەدا ئەم بیرە سامناکانە لەمێشکی خۆی بتارێنێ، بەڵام تارمایی فرولوف بەرچاوی بەر نەدەدا، زۆر چاك دەیبینی لەسەر تەختێك خەوتووەو دەستە سستەکانی بەملاو بەولایدا شۆڕ بوونەتەوە، سیمای وشك و ژاکاو بوو، درەختی ئەفرا بەسەر سەرییەوە هێدی هێدی خشەخش دەکات. متچیك بە ترسەوە بیری کردەوە کە مردووە، بەڵام فرولوف قامکەکانی بزواندو بەلای متچیکدا وەرچەرخاو بە پێکەنینێکی وشکەوە گوتی:

– وەزعی هاورێکانمان زۆر خراپە. ئەوجا کوتوپڕ موچورکەیەك لەتری پێدا. پەتۆ شڕەکەی سەری لاچوو. متچیك سەیری کرد چ فرولوڤ لە ئارادا نەبووەو ئەوە سەربازێکی ژاپۆنییە. بەخۆی گوت: زۆر سامناکە!.

ئازای گیانی نیشتە لەرز، بەڵام ڤاریا بەسەریا دانەوییەوەو بە ئەسپایی گوتی: نەترسە! بەدەنی سادو فێنك بوو. متچیك کە هێور بۆوە، بە ئەسپایی گوتی: بم بوورە لەوەی کە باش خوا حافیزیم لەگەڵ نەکردیت، من تۆم خۆش دەوێ. ئەوجا باوەشی پێدا کردو بە خۆوەی گوشی.

کوتوپڕ هەموو شتێك سڕایەوەو لە خاڵێکدا ون بوو. دوای تۆزێك هەستاو لە سەر زەوی دانیشت. بەدەم چاوگلۆفتن و تروکانەوە بە لەپە کوتێ بەدووی تفەنگەکەیا گەڕا، دنیا تەواو روناك بوو بۆوە. پیاوانێکی زۆر بە دەم پاڵتۆ لە خۆپێچانەوە هەرا هەرایان بوو. کوبراك تا نێو قەدی چوو بووە نێو دەوەنەکانەوە، بە دووربینەکەی دەیڕوانییە دەوروپشتی. ئەوانەی کە لێی خڕ ببوونەوە دەیان پرسی: لەکوێن؟ لە کوێن؟

متچیك، ئەنجام تفەنگەکەی دۆزییەوەو بەرەو لای بارستە خۆڵەکە خزا. لەوێدا بۆی دەرکەوت کە پرسیارەکان دەربارەی دژمنە، بەڵام چ ئاسەوارێکی دژمنی بەدی نەدەکرد. بۆیە ئەویش پرسی: لە کوێن؟

سەر دەستەکە بە دەنگێکی نێر گوتی: بۆ هەمووتان لێرە خڕبوونەتەوە. ئامادەبن! زەلامێکی دەڵەك دایە دواوە.

وەختێ هەموویان لە پشتی دیوارەکەوە خۆیان بە عاردی داداو سەنگەریان گرت، متچیك هەر سەرەتاتکێی بوو تا دژمن ببینێ.

چەندین جار لە زەلامەکەی تەنیشت خۆی پرسی: لە کوێن؟ بەڵام زەلامەکە کە لەسەر سك راکشا بوو، و لێوی شۆڕ بوو بووەوە، گوێی بە قسەکانی متچیك نەداو لەبەر هۆیەکی نادیار قامکەکانی ئاخنیی بووە گوێچکەیەوە. لە پڕ لە متچیك گەڕایەوە شێت ئاسا کەتە جنێو



پێدانی، متچیك فریا نەکەوت وەڵامی جنێوەکانی بداتەوە, چونکە لەو ساتەدا دەنگی فەرمان بەرز بۆوە: ئا—ما—دە!

گەرچی متچیك هێشتا دژمنی نەدەبینی و زۆر بە داخەوە بوو کە وەکو ئەوانی دی توانای دیتنی دژمنی نییە، لولەی تفەنگەکەی لەسەر بارستە خۆڵەکە گیرکردو لەگەڵ فەرمانی تەقەدا لە خۆڕاو بێ ئامانج کەوتە تەقەکردن، نەیدەزانی کە نیوەی پارتیزانەکان بە هیچ جۆرێ دژمنیان نەدیتووەو تەنیا وایان دەنوان کە دژمنیان بینیوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بۆ خۆپاراستن بوو لە گاڵتە پێکردنی پاش تەواو بوونی شەڕ.

کوبراك هەمدیس فەرمانی دا: تەقە! متچیك بە هەمان شێوە کەوتەوە تەقە کردن.

دەستەیەك هاواریان کرد: ئەها, چاکیان خوارد! ئەو دەستەیە بە غەڵبە غەڵب و بە جۆرێکی ناڕێك و پێك مژولی گفتوگۆ بوون. سیمایان شاد و بەدەماغ بوو.

سەر دەستەکە بە دەنگی بەرز فەرمانی تەقە راگرتنی دا: بەسە, بەسە! ئەوەکێیە تەقان دەکات! فیشەك خەسار مەکە!

متچیك بۆی دەرکەوت دیدەوانێکی ((رصد)) ژاپۆنی هەوڵی دابوو لە وێوە بچێتە پێشێ. بەڵام ئێستا ژمارەیەکی زۆر لەوانەی کە وەکو ئەو چ ئاسەوارێکی دژمنیان نەبینی بوو. گاڵتەیان بەو دەکرد، زۆربەیان لافیان لێ دەدا کە ژاپۆنییەکانیان پێکاوەو لەسەر زینەکانەوە خستوویاننەتە خوارێ. لەم لە حزەیەدا هاژەی تۆپێکی مەیدانی لە ئاسمانا دەنگی دایەوەو دەنگەکەی سەرانسەری دۆڵەکەی گرتەوە، ژمارەیەك لە پارتیزانەکان لە ترساندا کەوتن و متچیکش وەکو یەکێك گوللەی بەر کەوتبێ خۆی گرمۆڵە کرد، متچیك یەکەمجاری بوو کە لە هەموو ژیانیا دەنگی تۆپی دەژنەوت. گوللە تۆپەکە لە پشتی کوندەکەوە تەقییەوە. هاژەی دەستڕێژی رەشاش شێتانەو بەردەوام دەگەییە گوێ دەنگی دەیان فیشەکی تفەنگ قۆناغ بە قۆناغ دەگەییە گوێ. پارتیزانەکان وەڵامی ئەم تەقانەیان نەدەدایەوە.

متچیك پاش سانییەك لەوە دوا یا سەعاتێك لەوەدوا —هەستکردن بە وەخت و شوێن لەبەین چوو بوو— هەستی کرد ژمارەی پارتیزانەکان، زیادی کردووە، باکلانوف متیلستای بینی کە بەبن دیوارەکەدا دێتە پێشەوە.

باکلانوف دووربینێکی بە دەستەوە بوو. دەمو چاوی متیلستا گرژ بوو بوو، پەڕەی کەپوی تەواو کرابووە.

باکلانۆف بە دەم چارە گرژکردنەوە گوتی: ئەها, ئەمە تۆ لێرە خەوتووی باشە وەزع و حاڵ چۆنە؟

متچیك بەدەم خۆ گورج کردنەوەو بە زەردەخەیەکی تاڵەوە پرسی: ئەسپەکانمان لە کوێن:

باکلانۆف گوتی: لە دارستانەکەدان هەنووکە بە خۆیشمان دەچین بۆ ئەوێ، مەجبور بووین کەمێك پێشیان بگرین، غەدرمان کرد لێرە نەڕۆیشتین. دیار بوو دەیویست زاتی بخاتە بەر: دەستەکەی دوبوف لەو خوارەوەن، لە دۆڵەکەدان، ئاه.... نەحلەتی!



لە ئەنجامی تەقینەوەیەکی نزیکا ئەو جنێوەیدا. هێزەکەی لڤنسون–یش هەر لەوێن لە کاتێکدا دووربینەکەی بە دەستەوە بوو، بە پاڵ پارتیزانەکانا کەوتە رێ.

وەختێ متچیك دەیویست بۆ جاری دووەم تەقە بکات، ئیدی سەربازە ژاپۆنییەکانی دەبینی: وەکو شەپۆل دەهاتنە پێشێ لە دەوەنێکەوە بۆ دەوەنێکی دی دەکشان. ئەوەندە نزیك بوون کە ئەگەر هەلاتنیش پێویست بوایە، ئیدی دەرفەت نەمابوو. متچیك هەستی بەشتێ دەکرد کە پتر چاوەڕوانییەکی پڕ ئازار بوو وەك لەوەی ترس بێ: ئاخۆ ئەم کارەساتانە کۆتاییەکیان هەیە؟ لە پڕ کوبراك دەرکەوت و هاواری کرد، تەقە لە چ دۆزەخێك دەکەی؟ متچیك ئاوڕی دایەوەو دەرکەوت کە فەرماندە لەگەڵ ئەوی نەبوو، بەڵکو لەگەڵ پیکای بوو، کە هێشتا لە دنیای خۆیدا دەژیا، پیکا لە دوای دوای هێزەکەوەوە لە پاش هەموویانەوە لەسەر زەوی راکشا بوو، دەموچاوی لە خۆڵەکە چەقاندبوو و، تفەنگەکەی بەسەر سەرییەوە گرتبوو. پیکا لە خۆڕا دەستی بە پەلەپتکەی تفەنگەکەیا دەناو تەقەی دەکردە نێو گەلاو پۆپی درەختێکی بەرانبەرییەوە. ئێستاش پاش هاوارەکەی کوبراك–یش دەستی لە پەلەپیتکەی تفەنگەکەی هەڵنەگرت. ئیدی مەخزەنی تفەنگەکەی خاڵی بوو، تەنیا دەنگی ناسازی چرکە چرکی پلەپیتکەی تفەنگەکەی دەهات، فەرماندە چەند لەقەیەکی پێدا ماڵی، پیکا هێشتاش هەر سەری لەسەری عاردەکە هەڵنەبڕی.

دوای چاوتروکانێك هەر هەموویان هەلاتن، ئەمە یەکەم شکست و پاشەکشەی نارێك و پێکیان بوو، بەڵام پاشان ریزیان بەست و مەسافەیان وەرگرت. متچیکیش بێ ئەوەی بزانێ چ قەوماوە لەگەڵ ئەواندا غاریدا. بەڵام لە دژوارترین ساتدا هەستی بەوە کرد کە خەڵکانێ هەن کاردانەوەیان بەرانبەر بە رووداوەکان جیاوازە لە کاردانەوەی ئەم و رێبەری کارەکانی ئەم و ئەوانی دی دەکەن، متچیك ئەو خەڵکانەی نەدەبینی بەڵام لە مەبەستیان بێ ئاگا نەبوو.

کاتێ گەیشتنە گونەدەکە چاوی ژێر کردەوە. هەموو هزرو بیری کۆکردەوە ئێستا هەموویان بە درێژایی ریزێکی درێژ رێیان دەکرد–بێ ئیختیار چاوی بۆ ئەو کەسانە دەگێڕا کە رێنوێن و رێبەری چارەنووسیان بوون. لڤنسون لە پێش هەر هەموویانەوە دەڕۆیی، هەیکەلی بچکۆلەی ئەوەندە کەم جۆرم بوو، و دەمانچە گەورەکەی بە جۆرێکی ئەوەندە سەیر دەجولا کە بە زەحمەت باوەڕ دەکرا ئەوە سەر فەرماندەی هەمووان بێ. وەختێ متچیك خەریکی تاوتووێ کردنی ئەم بابەتە بوو. دووبارە گوللە بارانێکی خەست و خۆڵ کران. هەستی دەکرد گوللەکان جارێ سەری قژی دەگرت و جارێك وەکو بروسکە بە بناگوێی دا گیزەی دەکردو رەت دەبوو. لەشکرەکە بۆ پێشەوە هێرشی برد، چەند کەسێك لە پارتیزانەکان کەوتن و لە سەر زەوی تلیاندا. متچیك لەبەر خۆیەوە بڕیاریدا کە ئەگەر ئەمجارە مەجبور بە تەقە کردن ببنەوە، وەکو پیکا بکات.

بیرەوەری تاڵی تری ئەو رۆژە، سیمای ماروسکا بوو بەسەر ئەسپەکەیەوە. ئەسپەکەی دەمی داچەقاند بوو، ددانەکانی بە دەرەوە بوون. یاڵە ئاگرینەکەی بەدەم بایەکەوە شەپۆلی دەدا. ئەوەندە بە خێرایی تێپەڕی، دەست نیشان کردنی سوارەکەو ئەسپەکە مەحاڵ بوو، پاشان



متچیك بۆی دەركەوت كە ماروسكا یەكێكە لەو كەسانەی پێوەندی نێوان دەستە جەنگاوەرەكان دابین دەكات.

متچیك لە نێو دارستانەكەداو لەسەر جادە كوێستانییەكەدا كەلە ژێر سمی ئەسپدا ساف بوو بوو، بە تەواوی هاتەوە سەرخۆ، ئێرە سێبەر بوو. هەموو شتێك هێدی و ئارام دەهاتە بەرچاو درەختانی سەرووی ئازادی دارستانەكە، لە ژێر لق و پۆپە چڕو شۆكە گرتوو, و ئارام بەخشەكانی خۆیدا پەنای دەدان.







**کاری سەختی ڕۆژانە**

هێزەکە پاش شەڕێك. لە دۆڵێکی سەوزو خۆشدا جێگیر بوو، و لە چاو ون بوو، وەختێ لڤنسون بەسەر ئەسپەکانا دەگەڕا چاوی بەزیوچیکا کەوت.

– ئەمە چییە؟

متچیك بە دەم منگەوە گوتی: چی، چییە؟

– زینەکەی لێ وەکە با پشتی ببینم.

متچیك بە دەستی لەرزۆکەوە تەنگو پاڵۆکەی کردەوە.

لڤنسون بە دەنگێك کە وای دەگەیاند جگە لەمە چاوەڕێی چ شتێکی دی نەبووە، گوتی: ئەها، ڕاستە پشتی بریندارە، دیارە پێت وایە دەبێ تۆ سواری بیتو یەکێکی دی بێت خزمەتی بکات؟

لڤنسون هەوڵی دەدا دەنگی هێمن بێ. بەڵام نیگەران بوو، بە قینەوە بە قامکان بەر بووە ئەو شولەی کە لە درەختێکی کرد بۆوەو ورد وردی کرد.

– فەرماندەی دەستە وەرە ئێرە! ئەمە چییە. بۆ ئاگات لێ نەبووە؟

فەرماندەی دەستە بە ئەبڵەقی تەماشای زینەکەی دەست متچیك–ی کردو بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی: چەندین جار ئەم شتانەم بەم گەوجە گوتووە!

لڤنسون بەدەم تورِدانی شولە وردکراوەکەوە هەمدیس گوتی: دەزانم! بە سیمای وشكو ساردەوە ڕوانییە متچیك و گوتی: بچۆ کن مەسئولی تەداروکاتو بارگیرێکی لێ وەربگرە تاکو برینەکانی ئەمە مالیجە دەکەی.

متچیك لە پەستی و شەرمەزاری و داماویدا دەلەرزی. لەبەر ئەوە پەست و شەرمەزار نەبوو کە کەمتەرخەمی دەرهەق بە ئەسپەکە کرد بوو، بەڵکو لەبەر ئەوە پەست بوو کە بەو وەزعو حاڵەوە زینەکەی بە دەستەوە گرتبوو، و تا ڕادایەك گەوج دەهاتە بەرچاو، بۆیە لە ژێرە لێوەوەو بە پچڕ پچڕی گوتی: هاوڕێ لڤنسون گوێ بگرە، من کەمتەرخەم نیم، تۆ بزانە، سەبرکە..... باوەڕم پێ بکە زۆر بە چاکی خزمەتی دەکەم. بەڵام لڤنسون بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە چوو بە لای ئەسپێکی دیکەوە.

کەم بوونی پێداویستییەکانی ژیان هەر زوو بە زوو هێزەکەی بەرەو دۆڵێکی تەنیشت بکێش کرد. هێزەکە پاش چەندین پێکادان لەگەڵ دژمناو دوای بڕینی ڕێگایەکی زۆر، شەکەت و ماندوو بوو بوو، بۆیە بە پەلە لە پێچ و پەناکانی دەوروبەری یولاخە بڵاوبۆوە، ژمارەی ئەو گوندانەی کە هێشتا دژمن داگیری نەکردبوون، زۆر بە خێرایی کەم دەبۆوە. مەگەر بەشەرش لەتێ نان یان مشتێ جۆ دەست بکەوتایە، زۆر جار برینی ئەو برینداراەنەی کە تازە چاك بوو بوونەوە، دەکولایەوە. پارتیزانەکان مۆنو کەم دوو و بێ ورەو بێ حەوسەڵە بوو بوون.



لڤنسون دەیزانی کە هاندەری زەلامەکانی تەنیا عیزەتی نەفس نییە، بەڵکو گەلێ هۆی باڵاو بە هێز –گەرچی بە رواڵەت زۆربەیان پەنامەگی و شاراوە بوون– هانی دەدان خۆ لەبەر سەختی و دژواری و تەنانەت مەرگیش رابگرن، هانی دەدان بە خۆیان داوا بکەن تێکڕا لە پێناوی ئامانجی هاوبەشیاندا لە دارستانەکەدا لە نێو بچن، هەروەها دەیزانی ئەم غەیزە زاتییەی زەلامەکانی لە سایەی حەزو ئارەزووی بووندا شاردراوەتەوە. چونکە هەموو ئینسانێك دەبێ بخوات و بخەوێ، چونکە بەدەنی بنیادەم لاوازو بێ توانایە، ئەم پیاوانە لە ژێر باری قورسی نیگەرانی داو لە کاتێکا بێ توانایی خۆیاندەناسی ئەرکە قورسەکەیان بە وانە سپاردبوو کە لە خۆیان بە هێزتر بوون= بەوانەی لەبابەتی لڤنسونن، باکلانوف و دوبوف بوون، کە لە ئاستی ئەم مەسئولیەتەدا پتر بە تەنگی زەلامەکانەوە دەهاتن تا بە تەنگی پێداویستییەکانی خەوو خۆراکی خۆیانەوە بێن.

لڤنسون ئێستاکێ بەردەوام لە نێو زەلامەکانیا بوو، بە خۆی لە شەرەکاندا رێبەری و رێنوێنی دەکردن، لە یەك قاپدا نانی لەگەڵ دەخواردن. شەوان خەو نەدەچووە چاوانی. سەری لە دەوری و حەرەسەکان دەدا: هەمیشە دەم بە پێکەنین بوو، تەنانەت کە دەربارەی بچوکترین و کەم بایەخترین شت لەگەڵیاندا دەدوا، لە هەر وشەیەکەوە کە لە زاری دەهاتە دەرێ. مرۆڤ وای هەست دەکرد، دەیەوێ بڵێ: بزانە چۆن هاوبەشی خەم و ناخۆشییەکانتانم! رەنگە سبەینێ لە پەناێیکدا لە برسا بمرم، رەنگە بگیرێم و لە سێدارە بدرێم، بەڵام هەرگیز نائومێد نابم، بۆچی؟ چونکە لەم چەشنە مردنە باکم نییە....

وێڕای ئەم هەموو هەوڵانەشن ئەو داوە نا دیارانەی لڤنسونیان بە دڵی هێزەکەوە گرێ دەدا، رۆژ بە رۆژو یەك لە دوای یەك دەپچڕان. کە داوەکان خاوتر دەبوونەوە، دەسەڵاتی لڤنسون بەسەر پارتیزانەکاندا کەمتر دەبۆوەو ئیدی وەکو هێزێکی غەریب بەسەر لەشکرەکەوە دەینواند.

پارتیزانەکان بۆ دابین کردنی خواردنی خۆ دەچوونە قەراخ چۆمەکەو دینامیتیان تێدا دەتەقاندەوەو راوە ماسییان دەکرد، ئاوی چۆمەکە سارد بوو، کەس نەبوو بە حەزی خۆی بچێتە نێو ئاوەکەوەو ماسییەکان بگرێتەوە. ئیدی بە تۆبزی زەلامێکی کەم جورمیان دەگرت و دەیانخستە ئاوەکەوە. هەندێ جار قورعەیان دەکرد، زۆربەی کات قورعەکە بەر لافروشکا ناوێك دەکەوت، لافروشکا پیاوێکی لاڵەپەتەی شەرمنۆك بوو، جاران شوانە بەراز بوو. کەس نێوی شۆرەتی نەدەزانی. لافروشکا زۆر لە ئاو دەترسا، وەختێ لە کەنارەکەوە بەرەو نێو چۆمەکە دەخزی، خۆی خڕ دەکردەوەو دەلەرزی، وەختێ متچیك پشتە لاوازو بەزەیی وروژێنەکەی دەبینی، زۆری دڵ پێ دەسووتا.

رۆژێك لڤنسون بەمەی زانی، هاواری لە لافروشکا کرد: سەبرکە! ئەوجا لە کابرایەکی رێوەلەی پرسی کە دەتگوت لەشی لەنێو دەرگایەکدا گیر بووەو بە شاپ لافروشکای دەخستە ئاوەکەوە: بۆ خۆت ناچیت؟



کابرا برژانگە سپییەکانی لەسەر چاوە قین گرتووەکانی هەڵبڕی و بە لاسارییەوە وەڵامی دایەوە، ئەدی بۆ تۆ ناچی؟ لڤنسون بە هێمنی گوتی: ئەمە کاری من نییە. من بە ئەندازەی کافی کارم هەس بەڵام تۆ دەبێ ئەم کارانە بکەی.

خێرا پانتۆڵەکەت داکەنە دەی! نابینی ئاوەکە خەریکە ماسییەکان دەبات؟

- با ببیات، من کۆیلەی کەس نیم! پشتی کردە لڤنسون و لە کەنارەکە دوور کەوتەوە، چەندین چاو بە نیگای تاییدکردنەوە شوێنی کەوتن، پاشان بە بزەی تەوس ئامێزو گاڵتە پێکردنەوە بەرەو لای لڤنسون وەرچەرخان. گونجارنکو بەدەم کردنەوەی دوگمەکانی کراسەکەیەوە گوتی:
- کە خەڵکانێکی بێ کەڵکن!

لڤنسون بە توندی دەستووریدا...... بگەڕێوە!

گونجارنکو دەستی لە کردنەوەی قۆپچەکانی کراسەکەی هەڵگرت و ڕەق ڕاوەستا.

توانایەکی چاوەڕان نەکراو لە دەنگی لڤنسوندا هەست پێدەکرا. پیاوەکە هەڵوەستەیەکی کرد، ژیوان بوو لەو سەریەشەیەی کە بە خۆی دروستی کردبوو، بەڵام بە هیچ کلۆجێ حەزی نەدەکرد لەبەر چاوی هاوڕێکانیا سەر کۆنە بکرێ. بۆیە سەر لە نوێ دووپاتی کردەوە: یەکجار پێم گوتیت من ناچم.

لڤنسون بە هێوری بەرەو لای کابرا چوو، دەستی خستە سەر دەمانچەکەی، نیگای چاوە تیژو توڕەکانی ناخی کابرای هەژاند، کابرا بە دوو دڵی وێستا، دەستی بە داکەندنی پانتۆڵەکەی کرد.

لڤنسون بە هەڕەشەوە فەرمانیدا: زووترا!

کابرا دزە نیگایەکی کرد، کوت و پڕ ترسی لێ نیشت، لە پەلەپەلدا لاقێکی لە پانتۆڵەکەی گیر بوو، دەترسا لڤنسون، ئەم کارەی بە ڕێکەوت نەزانێ و پەنجە بە پەلە پیتکەی دەمانچەکەیەوە بنێ. بۆیە بە دەنگێکی تایبەتی دەستی بە قسان کرد: بەڵێ، بەڵێ. پێم لێی گیراوە .... خوا بی بڕێ! هەر ئێستا، تەنیا یەك دەققە!

وەختێ لڤنسون ڕوانییە سیمای زەلامەکانی دەوربەری، سەیری کرد هەر هەموویان بە نیگای ترس ئامێزو حورمەت گرتنەوە لێی ورد ببوونەوە. ئەوەی لە چاویانا دەخوێندرایەوە بریتی بوو لەمە ــچ جۆرە هەستێکی هاوخەمی یا پێوەندییەکیان تێدا بەدی نەدەکرا. لڤنسون دەمو دەست هەستی کرد خەنیمی لەشکرەکەیە نەك فەرماندەی.... بەڵام بۆ ئەوەش ئامادەبوو، باوەڕی تەواوی بەوە هەبوو کە سەرچاوەی هێزو توانای خۆی، توانایەکی عادیلانەیە.

لەو ڕۆژە بە دواوە هەر کاتێ مەسەلەی خواردن و ئیسراحەت هاتبا گۆڕێ، لڤنسون کۆی لە هیچ کارێك نەدەکردەوە، بێ سێ و دوو دەستی بەسەر ڕانە مەڕدا دەگرت، مەزراو باخی دێهاتیانی تاڵان دەکرد. تەنانەت ماروسکاش هەستی دەکرد ئەم کارانەی لڤنسون گەلەك جیاوازترن لە کاڵەك دزینەکەی ئەو.



پاش ئەوەی هێزەکە چەندین قۆناغ رێی بەسەر قوتەی کێوی یودجدا بڕی و جگە لە ترێ و هەندێ کارگ نەبێ کە لەسەر ئاگر دەیانبرژاند، چ شتێکی دییان نەبوو بۆ خواردن. خۆیان کرد بە دۆڵی ببرداو چوونە نێو تاقە مەزرای کورییاییەکانەوە، مەزراکە بیست قۆناغە رێیەك لەخوار ئیروخدزاوە بوو. لەوێ تووشی کابرایەکی کەتەی تووکن بوون، توکن وەکو پێڵاوە جەنگەڵییەکانی خۆی. پشتێنێکی ژەنگاوی تایبەتی لە پشت بوو. لڤنسون ناسییەوە، ستیرکشانی قاچاخچی مەشروب و خەڵکی ناوچەی داوبیخە بوو.

ستیرکشا بە چاوانی لە موا ون بوو، سەیری لڤنسونی دەکرد. بە هەمان تەڵخی ئاسایی و بەدەنگێك کە لە ئەنجامی سەرمادا گیرا بوو، ئەحواڵ پرسی لەگەڵ کرد: ئەهای لڤنسون، مەرحەبا! ئەوە هێشتا ماوی؟ زۆر خۆشحاڵم خۆ بە دووتا دەگەڕێن.

- کێ بە دووما دەگەڕێ؟
- کێ؟ ژاپۆنییەکان. کلچاکەکان... دەتەوێ کێی دی بە دووتا بگەڕێ؟
- دەزانم ناتوانن دەستگیرم بکەن، ئەرێ خۆراکێ، شیتێ لەم ناوە دەست ناکەوێ.

سترکشا بە شێوەیەکی پڕ ماناوە گوتی: رەنگیشە دەستگیرت بکەن، گەوج نین, خەڵاتیان بۆ سەرت داناوە. لە متینگێکا لە نێو گوند حوکمێکیان خوێندەوە کە هەر کەسێك بە مردوویی یان بە زیندوویەتی دەستگیرت بکات، خەڵاتی دەدەنێ.

- خەڵاتەکە زۆرە؟
- 500 رۆبڵی سیبری.

لڤنسون بە پێکەنینەوە گوتی: چ هەرزانە! باشە خۆراکێ، شتێك دەست دەکەوێ؟

- لێرەدا چ شتێك پەیدا نابێ, کۆرییاییەکان بە خۆیشیان چامیزای رووت دەخون ، بەرازێکی دەپاوەندییان هەیە بۆ تەنگانەیان هەڵگرتووە —ئەو بەرازە گۆشتی سەرانسەری زستانەکەیانە.

لڤنسون چوو بە سۆراخی جووتیارەکەوە جووتیارە. کۆرییاییەکە سەر کڵاوێکی تەلی لەسەر بوو. کوت و پڕ بەردێنی بۆزو بە لەشی لەرزۆکەوە کەوتە پاڕانەوە کە دەست لە بەرازەکەی نەدەن.

لڤنسون دەیزانی لەلایەکەوە سەدو پەنجا کەسی برسی لەگەڵدایە، لەلایەکی ترەوە تەواو دڵی بە جووتیارەکە دەسووتا، دەیویست بە جووتیارەکەی بسەلمێنێ کە ناچارە بەرازەکە بکوژێت و جگە لە مە چ چارەیەکی تری نییە. جووتیارەکە بێ ئەوەی کەم و زۆر لە قسەکەی لڤنسون حاڵی ببێ، هەمدیس کەوتەوە پاڕانەوە. بەپێزەوە دەستی بە سینگییەوە گرتبوو، و گوتی: نا، نا خواردن، خواردنی ئەو.... نا....

لڤنسون فەرمانیدا وێڕای هەموو ئەمانە... بە گوللە بیکوژن! لڤنسون بە جۆرێ سیمای گۆڕا، وەکو ئەوەی فرمانی کوشتنی خۆی دابێ نەك بەرازی جووتیارەکە.

سیمای پیرەمێردەکە گۆڕا، بە کوڵ کەوتە گریان، لە پڕ خۆیدا بە سەر پێی لڤنسوندا، ردێنی دەکرد بە نێو پۆش و گیاکانداو پێی لڤنسونی ماچ دەکرد، لڤنسون چ کارێکی نەکرد کە



نیشانەی هەستاندنەوەی جووتیارەکەی پێوە بێ: دەترسا نەبادا کۆنترۆلی خۆی لە دەست بدات و لە فرمانەکەی ژێوان بێتەوە.

متچیك بەم دیمەنە دڵی گوشرا، غاری دایە پشت زنجەکەوە، دەمو چاوی لە نێو کایەکاندا نوقم کرد بەڵام بەم حاڵەشەوە سیمای بە فرمێسکی پیرەمێردەکەی دەبینی کە بە ڕەنگی پەڕیوەوە لە پێی لڤنسونی هەڵدەسوو. متچیك بەسەرسامی و هەڵچوونەوە لە خۆی دەپرسی:

باشە نەدەکرا ئەم کارە نەکرێ؟ ڕێزێکی درێژ لە دێهاتیانی مەزلوومو بێ پەنا، کە دوا مایەی خۆراکی خۆیان لە دەست دەدا, بە بەر چاویا ڕەت دەبوو, چەند جارێك ئەم بیرەی بە مێشکا تێپەڕی کە: نا, نا, ئەمە کارێکی زاڵمانەیە. ویتر دەمو چاوی لە کایەکەدا نقوم کرد.

متچیك دەیزانی کە هەرگیز نەیدەتوانی ئەم ڕەفتارە لە گەڵ جووتیارە کورياييەکان دا بکات, کەچی ئەویش لە گەڵ ئەوانەی دی دا بەشداری گۆشت خواردنەکەی کرد, چونکە ئەویش برسێتی کێشابوو.

لەگەڵ گەردی بەیاندا, دژمن لە کێوەکانەوە ڕێگای لڤنسون ی بڕی. پاش شەڕێکی دوو سەعاتی، کە لەو شەڕەدا لڤنسون نزیکە سی (30) کوژراوی دا، ڕێی خۆی بەرەو دۆڵی ئیروخدزا کردەوە، چونکە سوارانی کلچاك لەو نزیکانەوە لە پارێزدا بوون، لڤنسون ناچار ئەسپەکانی بە بارو بنەوە بەجێ هێشت، وەختێ چوونە سەر ئەو جادەیەی کە بۆ خەستەخانەکە دەچوو، نیوەڕۆ بوو. لڤنسون لە پڕ هەستی کرد کە زینەکە ئازاری دەدا، پاش ماندوو بوونیکی لە ڕادەبەدەر، هەستی دەکرد دڵی بەسستی و تەمەڵی لێدەدا، دەترسا هەر ساتێ لە لێدان بکەوێ، دەکەوێ، هەستی دەکرد،زۆری حەز بەخەوە، ملی خوار بۆوە، لە پڕ وای بە خەیاڵ داهات کە لە سەر زینەکە هەڵفڕیوەو هەموو شتێکی بە لاوە سادەو بێ بایەخە، لە پڕ وەکو ئەوەی ڕاچەنینێکی دەروونی وەئاگای هێنابێتەوە ئاوڕێکی دایەوە، چ کەسێك ئەوی بەو وەزع و حاڵەوە نەبینی بوو، هەموو پارتیزانەکان پشتی ئاشنای فرماندەکەی خۆیان دەبینی کە نەختێ بە پێشا خوار بوو بوو، کەسیان باوەڕیان نەدەکرد، نەدەچووە ئەقڵیانەوە کە لەوانەیە ئەویش وەکو خەڵکانی دی ماندوو بوو بێ و حەز بە خەو بکات! لڤنسون لە خۆی دەپرسی: باشە ئەوەندە بێ دەسەڵاتم کە نەتوانم بەسەر ئەم لاوازییەدا زاڵ ببم؟ پاشان سەری لەقاندو هەستی کرد زرانییەکانی دەلەرزن، ئەم هەستە یەجگار بە سوێ بوو.

کە لە خەستەخانەکە نزیك دەبوونەوە، دوبوف بە ماروسکای گوت باشە، هەنووکە بۆ خۆت ژنەکەت دەبینی.

ماروسکا وەڵامی نەدایەوە. هەر چەندە لەم ڕۆژانەدا زۆر بیری ڤاریای دەکردو بە تاسەی بینینییەوە بوو، وای بیر دەکردەوە کە ئیدی دەورانی ژیانی خێزانداریان تەواو بووەو بەسەر چووە، ماروسکا خۆی فریودەدا، کە گوایە تاسەی دیداری ڤاریا هەمان کەڵکەڵەی ئاسایی بینەرێکی بێگانەیە کە بیەوێ سەرەنجامی پێوەندی ئەو دوانە بە کوێ گەیی؟

وەختێ ماروسکا سەیری کرد –ڤاریاو ستاشینسکی و گونجارنکو لە پاڵ زنجەکەدا وێستا بوون بە دەم پێکەنینەوە تەوقەیان لەگەڵ یەك بە یەکی پارتیزانەکاندا دەکرد– هەموو شتێك لە



ناخیا هەڵگەڕایەوە. بێ چ هەڵوەستەیەك بەرەو دار ئەفراكان ڕۆیی، بەدەم شل كردنەوەی قایش و قروشی زینەكەوە، ماوەیەك خۆی لەگەڵ میشكادا مژوڵ كرد.

ڤاریا كە لە هۆڵی متچیكدا بوو، بەبیری ئالۆزەوە سلاوی پارتیزانەكانی دەسەندەوەو بە پەرێشانی و شەرمەزارییەوە بزەی بە ڕوودا دەدان، نیگای متچیك تێكەڵ بە نیگای ڤاریا بوو، متچیك سەرێكی لەقاندو لە شەرماندا سەری داخستەوە: دەترسا نەبادا ڤاریا ڕاستەوخۆ بەرەو پیری غار بدات و هەموو ڕازو نهێنییەكانیان ئاشكرا بێ، بەلام ڤاریاش زرنگ بوو، هەر چەند بە دیتنی متچیك گەلەك شاد بوو، بەلام زەقاو زەق دەری نەبڕی.

متچیك خێرا زیوچیخای بەستەوەو بە پەلە چوو بۆ نێو دارستانەكە, هێشتا چەند هەنگاوێ نەڕۆیی بوو، بەسەر پیكادا دانەوییەوە، پیكا لە تەنیشت ئەسپەكەیا ڕاكشا بوو، چاوە تەڕەكانی بە قولا چوو بوون.

بە دەنگێكی ماندوو بە متچیك ی گوت: دانیشە.

متچیك لە پاڵیا دانیشت.

– ئێستا بۆ كوێ دەڕۆین؟

متچیك بێ دەنگ بوو.

پیكا بە عەزرەتەوە گوتی: ئەگەر هەنووكە لە خانووەكەی خۆمدا بوایەم.... لە پاڵ باخی هەنگەكانم، دەمتوانی ماسیان بگرم، ئێستا ماسییەكان لەگەڵ ئاوەڕۆی چۆمەكەدا حەرەكەت دەكەن، تەنیا بەربەستێكی چكۆلەی دەوێ، ئەوجا تۆڕێكم لەبەر دەمیا دادەنا، ئیدی لێی دەگەڕام و ماسییەكان چ چارێكیان نەدەبوو جگە لەوەی بێن و بكەونە ناوییەوە. پیكا ماوەیك كڕ بوو، پاشان بە كەسەرەوە لەسەری ڕۆیی، بەلام ئێستا ئیدی كوا باغ! ئەگەر ببوایەتەوە زۆر چاك بوو، لە ڕەگ و ریشەوە دەریان هێناوە، ئێستا نەك هەر زەوییەكان مردوو بێدەنگن، بەڵكو هەنگەكانیشم كڕو بێدەنگن.

لە پڕ بەسەر ئانیشكێكیا شانی دادا، دەستێكی بە متچیكدا كێشا، بە دەنگێكی خەمناكی لەرزۆكەوە گوتی: گوێ بگرە پاڤل، گوێ بگرە پاڤل، كوڕە چكۆلەو عەزیزەكەم، ئاه، تۆ بڵێی جارێكی دی جێگایەكی وەها پەیدا ببێتەوە؟ پاڤلی ئازیز, كوا بەبێ ئەو هەڵدەكەم، پاڤل، كوڕی خۆشەویستم؟ من ئیدی لەم دنیایەدا چ كەسێكم نییە، هەر خۆم و خۆمم.... بابایەكی پیرەمێرد.... بەم زووانەش دەمرم.... وشەكان لە دەمی دەردەپەڕین، هەناسەی هەڵدەكێشاو هەوای هەڵدەمژی، بە دەستە ئازادەكەی گیاو پوشەكانی دەرنییەوە. متچیك تەماشای دەكرد، قسەكانی نەدەژنەوت، بەلام قسەكانی ئەو پیرەمێردە بە هێمنی شتێكی لە ناخیا دەڕوژاند. دەتگوت ئەو ڤامكانەی كە ئێستاكێ گەلا وشەكەكانی لە لقە تەڕەكان جیا دەكردەوەو دەیڕشتە سەر زەوی, ڕۆحی پیكای لە بەدەنی جیا دەكردەوە. ئەو وای بیر دەكردەوە كە هەموو شتێك بڕاوتەوەو چ شتێكیش ناگەڕێتەوە...., بۆ خەزانی ژیانی خۆی گەرمەشینی دەگێڕا.

متچیك، هەر چەند پێی ناخۆش بوو پیكا بە جێ بهێڵێ، گوتی: من ماندووم، دەڕۆم دەخەوم. متچیك چووە قوولایی دارستانەكەوەو لە نێو دەوەنەكانا هەلاژا. خەوێكی ناخۆش و ناڕەحەت



باڵی بەسەردا کێشا. بەڵام لە پڕ وەکو یەکێك رایتەکێنێ لە خەو راپەڕی و دڵی داخورپا. کراسەکەی ئارەقی کردبۆوەو بە بەدەنییەوە چەسپی بوو. دوو کەس لە پشت دەوەنەکانەوە قسانیان دەکرد. دەنگی لڤنسون و ستاشینسکی ناسییەوە. متچیك بە وردی دەوەنەکانی لار کردەوەو چاوی بڕییە ئەوان.

لڤنسون بە خەمبارییەوە دەیگوت: بە هەر حاڵ ئێمە ناتوانین ماوەیەکی زۆر لەم ناوچەیەدا بەرگری بکەین، تەنیا یەك رێگامان بە دەستەوەیە، ئەویش رێگای باکوورە –بەدەستی دۆڵی تیودو– ڤاکیودا. جانتا سوپاییەکەی کردەوەو نەخشەیەکی دەرهێنا: ئالێرەوە، دەبێ ئەم زنجیرە کێوە ببڕین و لە دەوروبەری خایونیخدزاوە داگەڕێین. سەفەرێکی درێژو سەختە، بەڵام چ چارەیەکی دی نییە.

ستاشینسکی هزرو بیری لای نەخشەکە نەبوو، چاوی بڕی بووە قوڵایی دارستانەکە، دەتگوت ئەندازەی ئەو قۆناغە رێیانەی دەگرت کە دەبوا بە عارەقی ئینسان تەڕ ببێ، لە پرس بە پەلە چاوی تروکاندو روانییە لڤنسون: ئەدی مەسەلەکەی فرولوف؟ هەمدیس لەبیرت کرد!

لڤنسون بە کەماڵی ئیسراحەت لەسەر گیایەکە دانیشت: وایە فرولوف، لایەکی روومەتی زەرد هەڵگەڕاوی لڤنسون لە متچیك–ەوە دیار بوو.

ستاشینسکی پاش هەڵوەستەیەك بە دەنگی نزم گوتی: هەڵبەتە من دەتوانم لێرەدا لەگەڵیاندا وەمێنم، ئەمە جگە لەوەی ئەرکی سەر شانمە.

لڤنسون سەری لەقاندو گوتی: قسەی قۆڕو بێ مەعنا، ژاپۆنییەکان شوێن پێمان هەڵدەگرن و بە مسۆگەری تا سبەی شەو دەگەنە ئێرە، ئەرکی سەر شانت ئەمەیە کە بکوژرێی؟

– ئاخر چ کارێکی ترمان پێ دەکرێ؟

– من نازانم.

متچیك هەرگیز لڤنسونی بەم پەشێوی و نائومێدییەوە نەبینی بوو.

– وا دەزانم تەنیا یەك کارمان لە دەست دێ، ئێستا بە بیرما هات...

لڤنسون کەمێ بێدەنگ بوو، ددانەکانی لێکدی سوو، و کڕ بوو.

ستاشینسکی بە دەم چاوەڕوانییەوە پرسی: بەڵێ: متچیك هەستی دەکرد کە پیلانێکی شووم لە ئەنجامداندایە، بە جۆرێ خۆی بە دەمابرد بووە پێشەوە خەریك بوو لەوانەوە دەربکەوێ.

لڤنسون دەیویست بە تاقە وشەیەك، ئەو کارەی هێشتا ئەنجام نەدراوە روون بکاتەوە، بەڵام وا دیار بوو وشەکە ئەوەندە قورس بوو هەر چەندی دەکرد نەدەهاتە سەر زاری. ستاشینسکی بە چاوانی ئەبڵەق و ترس ئامێزەوە روانییە لڤنسون.... لە هەموو شتێ حاڵی بوو. هەردووکیان بە ترس و لەرزەوە کەوتنە چپە دوو، ماوەیەکی باش لەسەری رۆیشتن، مەبەستەکە لە لای هەردووکیان ئاشکرا بوو، بەڵام ئاقیبەت کەسیان ئەو وشە بنج بڕەیان بۆ نەهات کە لەم دڵە راوکێ و ئازارە بە سوێیە رزگاریان بکات.



متچیك، لە ناخەوە راچڵەكی: دەیانەوێ بیكوژن! متچیك رەنگی زەرد هەڵگەڕا، دڵی كەوتە پەلەپەل، دڵی هێندە بە توندی لێی دەدا دەترسا نەوەك زەلامەكانی پشت دەوەنەكان گوێیان لە دەنگی دڵی بێ...

لڤنسون چەند جارێ پرسی: حاڵی چۆنە؟ خراپ؟ بە كورتی ئەگەر لەبەر خاتری ئێمە نەبوایە.... ئەگەر لەبەر خاتری ئێمە نەبوایە ئومێدی چاك بوونەوەی هەیە؟

– نەخێر، بە هیچ جۆرێ، بەڵام ئاخۆ ئەمە گرنگە؟

لڤنسون قەناعەتی وابوو كە ئەمە كارەكە ئاسانتر دەكات.

لڤنسون زانی دەیەوێ خۆی بخەڵەتێنێ، بۆیە دەست بە جێ لە ناخی خۆیدا تەریق بۆوە، بەڵام لە هەمان كاتدا پێی وابوو بەو رێگایە كارەكە ئاسانتر ئەنجام دەدرێ، پاش بێدەنگییەكی كەم بە هێمنی گوتی: هەر ئەوڕۆكە ئەم كارە ئەنجام دەدەین، بەڵام وریا بە چ كەسێك نەزانێ، لەهەمووی گرنگتر ئەمەیە كە نابێ بە خۆیشی پەی پێ ببات. دەتوانی بەو جۆرەی كە گوتم ئەنجامی بدەیت؟

– پەی پێ نابات.. ئا ئێستا وەختی دەرمان خواردنییەتی.

جا لەبری شروبی مقەوی... ناكرێ تا سبەینێ دوای بخەین؟

– بۆ نا، چ فەرقێ دەكات؟ ئەمجا نەخشەكەی خستەوە جانتاكەیو لە جێی خۆی هەستا: چارمان نییەو دەبێ ئەم كارە ئەنجام بدرێ، چ چارێكی دی هەیە؟

لڤنسون بێ ئەوەی لە دەسەڵاتی خۆیدا بێ پەنای بۆ پیاوێك دەبرد كە بە خۆی پێویستی بە یارمەتیو كۆمەك بوو.

ستاشینسكی لەبەر خۆیەوە بیری كردەوە: بەڵێ، وایە. چ وەڵامێكی نەدایەوە.

لڤنسون بە هێمنی لەسەری رۆیی، گوێ بگرە، دەبێ ئەم كارە بە دروستی ئەنجام بدرێ، دەتوانی بە باشی ئەنجامی بدەی؟ ئەگەر ناتوانی قسە بكە.

ستاشینسكی دووپاتی كردەوە: ناتوانم؟. بەڵێ من ئامادەم. لڤنسون قۆڵی كراسەكەی ستاشینسكی گرتو درێژەی دایێ: دەی دەست پێ بكە! ئەوجا بە جووتە بەرەو زنجەكە گەڕانەوە.

متچیك بە دەم چاو هەڵگلۆفتنەوە دەمەو روو لە نێو گیاكاندا كەوت، ماوەیەك، كە خۆیشی نەیزانی چەند بوو، بەو جۆرە مایەوە. لەبەر خۆیەوە دەیگوت: بەڕاستی ئەو كارە دەكەن؟

متچیك وەكو بریندارێكی بێ تاقەت بەدەم لەتردانەوەو بەنێو دەوەنەكاندا كەوتە شوێنی ئەوان.

ئەسپە رووتەكان فێنك بوو بوونەوە، سەری ماندوویان بەلای متچیكا وەرگێڕا.

دەستەیەك پارتیزان لە مەیدانە بەر بەتاكەكەی دارستانەكەدا بە دەم خەوەوە دەیان پرخاندو تاقمێكی دی خواردنیان لێ دەنا، متچیك بەدەم سەرەتاتكێوە چاوی بۆ ستاشینسكی دەگێڕا، كەبۆی نەدۆزرایەوە، بە پەلە بەرەو زنجەكەدا غاریدا.

متچیك لە كاتو شوێنی خۆیدا، خۆی گەیاندە زنجەكە، ستاشینسكی پشتی لە فرولوف بوو. پەرداخێكیدا بووە بەر شەوقی چراكەو دەرمانێكی تێ دەكرد، متچیك بە چاوانی ئەبڵەقەوە،



بەرەو ستاشینسکی هەڵمەتی بردو هاواری کرد: سەبرکە! ئەوە چ دەکەی؟ سەبرکە، گوێم لە هەموو شتێك بوو!.

ستاشینسکی راچڵەکی، بە پەلە سەری وەرچەرخاند. دەستەکانی بە شێوەیەکی ترسناك کەوتنە لەرزین و لە پڕ بەرەو متچیك چووە پێشێ، دەماری نێو چەوانی بە شێوەیەکی سامناك هەستا بوو.

بە دەنگێکی نزمی شووم و زۆر بە ئەسپایی گوتی: گوم بە لێرە، دەتکوژم!.

متچیك هاواری کردو لە زنجەکە دەرپەڕییە دەرێ، خۆیشی نەیدەزانی چ دەکات. ستاشینسکی دەست بەجێ هێور بۆوەو بەرەو لای فرولوف چوو.

فرولوف بە ترسەوە گۆشەی چاوی بڕییە پەرداخەکەی دەستی ستاشینسکی و پرسی: چییە.... ئەوە چییە؟

ستاشینسکی زۆر بەساردی و بە ڕەقی و ئەمرکردنەوە وەڵامی دایەوە: بیگرە. شروبی مقەوییە. هەردووکیان بیریان لەیەك شت دەکردەوە، چاوە مەنگ و وریاکانیان بڕی بووە یەکدی. فرولوف هەستی کرد کە هەموو شتێك لە بڕانەوە دایە. نەدەترساو نە خەفەتی دەخوارد، هێدی و ئارام، هەستی بەتاڵی و ترسی مەرگ نەدەکرد، هەموو شتێك بەلایەوە سادەو ئاسان دەینواند. هەنووکە بەلایەوە سەیر بوو کە ئەو هەموو رەنجەی کێشاوەو زۆر سەر سەختانە بە ژیانەوە نووساوەو لە مردن ترساوە. شتێکی بەڵگە نەویستە کە ژیان بۆ ئەو جگە لە مژدەی دەردو ئازار چی دی پێ نەبووەو ناش بێ، تەنیا مەرگ دەتوانێ لە هەموو ئەو دەردو ئازارانەی رزگار بکات، بێهودە دەیڕوانییە دەوروپشتی خۆی، دەتگوت چاو بۆ شتێ دەگێڕێ،چاوی بە خواردنێکی دەست لێنەدراو کەوت کە لەسەر مێزێکی تەنیشت ئەوەوە دانرابوو، خواردنەکە شیر بوو، سارد بوو بووەو مێش بەسەرییەوە هەڵدەفڕین.

لە سەرەتای نەخۆشییەکەیەوە تا ئێستا بۆ یەکەمجار خەمی ئینسانی لە چاوەکانیا ئاشکرابوو —دڵی بە خۆی یا بە ستاشینسکی دەسووتا، پێڵوەکانی لێك نا، وەختێ کردنییەوە هێوری و تەسلیم بوون لە سیمایدا دیار بوو. زۆر بەهێوری گوتی: ئەگەر جارێ رێت کەوتە ساچان، پێیان بڵێ زۆر خەم نەخۆن، ئەمە رێگای هەموانە.... بەڵێ، هەموویان.... ئەم وشانەی بە جۆرێ دووبارە دەکردنەوە دەتگوت هێشتا باوەڕی بەوە نەبوو کە مەرگ بۆ بنیادەم شتێکی حەتمییە— باوەڕی نەگۆڕ کە مەرگ، ئەو لە تەنیایی و ترس جیا دەکاتەوەو ئەمەش چەمکێکی ئاسایی و گشتی بە مەرگ دەبەخشێت. پاش کەمێك بێدەنگی گوتی: لەوێ کوڕێکم هەیە، لەمەعدەن.... نێوی فدیایە. کە شەڕ تەواو بوو, ئەو فەرامۆش مەکەن... ئەوەندە یارمەتی بدەن کە ژیانی هەڵبسوڕێ، ئەوجا ئەوەم بدەرێ لە پڕ دەنگی لەرزی و نزم بۆوەو قسەکەی بڕی.

ستاشینسکی لێوی تەتەڵەی دەکرد، ئازای بەدەنی دەلەرزی، لەو دەمەدا چاوێکی بە شێوەیەکی سەیر کەوتە پرتە پرت، پەرداخەکەی دایە دەستی فرولوف. فرولوف پەرداخەکەی بە هەردوو دەستان گرت و یەك بین هەڵیدا.



متچیك بە نالە نالٚو بە کوٚلٚیٚ کەسەرو داخەوە بەسەر لق و پوٚپ و گەلاّی درەختەکاندا، کەوتە لەتردان، بەرەو ناو جەرگەی دارستانەکە غاریدا. متچیك کلاّوەکەی گوم کرد بوو، چەپکیٚ قژی ناشیرینی پێکەوە چەسپاو بە شێوەی داوی جالّجالّوٚکە رژابووە سەر چاوەکانی، لاجانگەکانی پلیان دەدا، لەگەلٚ هەر پلدانێکا وشەیەکی بەزەیی ورۆژێن و بیٚ مەعنای بەزاردا دەهات، جگە لەو وشانە چ شتێکی دی نەدۆزییەوە کە پەنای بۆ بەریٚ، لە پرش تووشی ڤاریا بوو، راچڵەکی. چاوانی ڤاریا بە شێوەیەکی ترسناك دەبریسکانەوە.

ڤاریا بە خۆشحالّیەوە دەستی بە قسان کردو گوتی: من بە دووی توٚدا دەگەڕام... ڤاریا لە نیگا گێژەکانی متچیك ترساو قسەکەی بڕی. متچیك دەستی ڤاریای گرت، بەدەم غاردانەوە بە دووی خۆیا رایکێشاو گوتی: گویٚ بگرە، ئەوان، ئەویان ژەهر خوارد کرد... فرولوف یان... دەزانی ئەم کارەیان کرد...

ڤاریا دەست بەجیٚ حالّی بوو، هاواری کرد: چی؟ ژەهر خوارد؟ وس بە. ئەوجا بە توندی متچیك-ی بە سینگی خۆیەوە گوشی و دەستە گەرم و ئارەق کردوەکانی خستە سەردەمی: وس بە! قسە مەکە! با لێرە دوور بکەوینەوە. متچیك خوٚی لە دەستی ڤاریا راپسکاندو دەلّەکی دایەلاوەو بەدەم ددان چیڕ کردنەوە گوتی: بۆ کویٚ بڕۆین؟ وازم لیٚ بێنە، دەمەویٚ بە تەنیٚ بم!

ڤاریا هەمدیس قۆلّی کراسەکەی گرت و بەدەم راکێشانییەوە دووبارەی کردەوە: وس بە! با دوور بکەوینەوە، دەمان بینن، هەموو زەلامەکانمان لەم دەوروبەرەن.... وەرە! با بڕۆین،خێراتر!

متچیك ئەو جارە بە جۆریٚ خۆی لە دەستی ڤاریا راپسکاند،خەریك بوو ڤاریا بخات. ڤاریا بە دوویا رای دەکردو هاواری دەکرد: بۆ کویٚ دەڕۆی؟ سەبرکە!

لەم ساتەدا سیسکێن لە نێو دەوەنەکانەوە دەرپەڕی. ڤاریا لە جۆگەیەك پەڕییەوەو خۆی خزانە گۆشەیەکەوەو لە نێو دارستانەکەدا ون بوو.

- چ بوو، نەیهێشت بە عەمەلی بێنی؟ زۆر چاکە، لێی گەڕیٚ بۆ من، مەرج دەکەم کە لە تۆ بە شانس تر بم! ئەمجا دەستێکی بە رانی خۆیا کێشاو بە غار دووی ڤاریا کەوت.







**کۆرەو**

ماروسکا هەر لە منداڵییەوە بە دیتنی خەڵکانی وەك متچیك راهاتبوو، ئەو خەڵکانەی بیریان وەکو خۆیان بچووك بوو و لە ژێر پەردەی وشەی قەبەو قەڵەودادەیانشاردەوەو بەو جۆرە خۆیان لە خەڵکانی خۆیان ئاسا، کەتوانای رازاندنەوەی بیرەکانیان نەبوو، جودا دەکردەوە.

ئەگەرچی ماروسکا نەیدەزانی لەم بۆچوونەدا هەق بەوەو توانای نەبوو ئەو بوچوونانە بخاتە قاڵبی قسەوە، بەڵام هەمیشە دیوارێکی گەورەی درۆو ریاو هەندێ کردەوەی دەبینی کە خوا دەیزانی لەچ مەعدەنێك بوو.

بەم چەشنە متچیك لەو پێك دا هەڵشاخانەی لەگەڵ ماروسکادا، ئەو پێکا هەڵشاخانەی قەت لەبیر نەدەچۆوە، هەوڵی دابوو وا بنوێنێ کە بۆیە لەبەری داهێناوە چونکە ماروسکا رزگاری کرد بوو. متچیك لە ناخدا هەستی بە خەمێکی ئاسایی دەکرد، لەبەر ئەوەی کە گوایە هەستی گیانلەبەرانەی خۆی بۆ قازانجی بونەوەرێکی بێ نرخی وەك ماروسکا جڵەو کردبوو. ئەگەرچی متچیك پڕ بە دڵ لەخۆی‌و لە ماروسکا رەنجا بوو، و پڕ بەدڵ حەزی بە زەرەری ماروسکا بوو، بەڵام بەڕاستی دەترسا بچووکترین ئازاری پێ بگەیەنێ –متچیك بە تەواوی شەهامەت‌و زاتی ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارانەی نەبوو، ئەمە جگە لەوەی کە بەلایەوە ئاسایی بوو لەگەڵ ئەم خەمە بە سەبرەدا رابێ.

ماروسکا هەستی دەکرد، هەر ئەم توانای رواڵەت بازییەوە بوو. ماروسکا بە خۆی ئەم توانایەی نەبوو– کە ڤاریای وا لێ کرد پشت لەم بکات‌و روو بکاتە متچیك. ڤاریاش حەزی دەکرد وەکو جوانێکی مەعنەوی سەیر بکرێ، نەك وەکو جوانێکی رەوتەنی‌و تەمەن کورت، هەر بۆیەش وەختێ ماروسکا، ڤاریای بینییەوە، بێ ئەوەی لە دەستەڵاتی خۆی دابێ گێژاوی یادگارو بیرەوەرییەکان راپێچیان کردو خۆی‌و ڤاریاو متچیك لەبەر چاوی خەیاڵی دا بەرجەستە بوون.

ماروسکا بۆی دەرکەوت کە ڤاریا چووەتە پەنایەکەوە "هەڵبەتە لەگەڵ متچیکدا" هەر چەندە هەوڵی دا قەناعەت بەخۆی بکات کە ڤاریا چ پێوەندییەکی بەمەوە نەماوە، بەڵام ماوەیەکی زۆری شەوەکە نەیتوانی بخەوێ، بچووکترین دەنگ‌و خشپە دەیخستە سەرەتاتکێ‌و چاوی دەبڕییە ناوجەرگەی تاریکییەکە، دەتگوت بە ئاواتەوە بوو کە بە چاوی خۆی دوو تارمایی ببینێ، بە شەرم‌و دزییەوە لە دراستانەکەوە بێنە دەرێ. پاشان لەو غەڵبە غەڵبەی دەوروبەری بێدار بۆوە، بای پایز بەنێو مەشخەڵی ئاگردا دەی گڤاند. چەند تارماییەك لە شوێنێکی رووتەن‌و بێ درەختی دارستانەکەدا سەمایان دەکرد. پەنجەرەی کوختەکان جارێ رووناك‌و جارێ تاریك دەبوون. لەناو جەرگەی تاریکییەکەوە یەکێك شەقارتەی پێکرد. پاشان گونجارنکو لەزنجەکەی هاتە دەرێ، کەمێك لەگەڵ پیاوێکدا کە لە تاریکییەکەدا نەدەناسرایەوە، قسانی کرد. ئەوجا بەپاڵ ئاگرەکاندا رەت بوو، بە دووی یەکێك دا دەگەڕا.



ماروسکا بە پەلە پرسی: بە دووی کێدا دەگەڕێی؟ چ وەڵامێکی نەدرایەوە. دووبارەی کردەوە: چییە؟ گونچارنکو بە ئەسپایی وەڵامی دایەوە: فرولوف مردووە.
ماروسکا بە پەلە پاڵتۆکەی دا بە خۆیداو خەوت، کەمێك پاش سپێدە فرولوف یان بە خاك سپارد، ماروسکاش بێ چ شڵەژان و خەمێك لەگەڵ ئەوانی دیدا هەندێ خاکی خستە سەر گۆڕەکەی.
وەختێ ئەسپەکانیان زین دەکرد، بۆیان مەعلوم بوو کە پیکا دیار نەماوە. ئەسپەکەی بە قەپۆزە هەڵۆ ئاساکەیەوە کە لە دوێنێ شەوەوە زینەکەی پێوە بوو، بە خەمباری و پەشێوی لە ژێر درەختێکا وێستا بوو، وەزع و حاڵی ئەسپەکە بەزەیی و روژێن دەهاتە بەرچاو.
ماروسکا گەییە ئەم ئەنجامە: پیرەمێر چاك قوچاندی! نەیدەتوانی لەوەی پتر هەڵبکات.
ڤنسون لە بەیانییەوە تاکو ئێستا بەدەم ئازاری قەبرغەیەوە دەینالاند، روو گرژ کردو گوتی: زۆر چاکە پێی ناوێ بە دوویا بگەڕێن، بەڵام ئەسپەکەی لەبیر نەکەن... نا، پێی ناوێ باری بکەن، مەسئولی تەداروکات لە کوێیە؟ هەموو شتێك ئامادەیە؟ سواربین؟ ئاهێکی قوڵی هەڵکێشاو دووبارە نێوچەوانی دا بەیەکا. ڤنسون بە زەحمەت خۆی لەسەر زینەکە دەگرت، دەتگوت جەستەیەکی قەبەو قورسیان ئاخنیوەتە لەشییەوە. کەس هەر بە ئاستەمیش بیری لە پیکا نەکردەوە. تەنیا متچیك هەستی بە نەمانی دەکرد، ئەگەرچی لەم دواییانەدا پیکا، متچیکی بێ تاقەت کردبوو، بیرەوەری تاڵی لەلای زیندوو دەکردەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشا متچیك هەستی دەکرد پیکا بەشێك لە بوونی ئەوی لەگەڵ خۆیدا بردووە.
هێزەکە بەسەر زنجیرە چیایەکی پڕنشێودا، کە بزنە کێوی گیایەکی روتاندبووەوە، تێپەڕی. ئاسمانی ساردو قوڕقوشمین باڵی بەسەردا کێشا بوون. زۆر لە خواریانەوە، دۆڵە سپی واژەکان تا چاو هەتەر کات راکشا بوون. ئەو بەردە زلانەی لە ژێر سمی ئەسپەکانەوە هەڵدەکەندران بەرەو خوار خل دەبوونەوە، پاشان هێزەکە لە ئامێزی گەڵای زێڕینی دارستانەکەدا، کە نقومی بێدەنگییە پڕ لە چاوەڕوانییەکەی پاییز بوو، گیرسیایەوە. کەڵە کێویانی سیبری بە ریشی پۆشەوە مووەکانیان بەسەر لق و پۆپی زەرد باوا دەرشت. کانیاوە ساردەکان قوڵە قوڵیان بوو. شەونمی زوڵاڵ و ساف کە رەنگی زەردی گەڵاکانی گرتبوو، بە درێژایی رۆژ بە دەوەنەکانەوە هەڵواسرابوو. گیانلەبەرانی کێوی و درندەی دارستان لە گەردی بەیانییەوە نەعرەتەیان دەکێشا، نەعرەتەو دەنگەکانیان هاولفی رق و بێ قەراری بوو. مرۆڤ کە رەنگی زێڕینی دارستانەکەی دەبینی هەستی بە هەناسەی دێوێکی مەزن و نەمر دەکرد.
یفیمکای تەتەر، یەکەم کەس بوو کە شەڕو ئاژاوەی ماروسکاو ڤاریای زانی. یفیمکایان نارد بوو بۆ لای دەستەکەی کوبراك تا هەواڵی پێ بگەیەنێ کە: زلامەکان بەجۆرێ کۆ بکەرەوە کە ئازاریان نەگاتێ، یفیمکا بەر لە پشووی نیوەڕۆ گەیشتە جێ. ئەسپەکەی بەرەو کۆتایی هێزەکە تاودا، دەوەنە دڕکاوییەکان پانتۆڵەکەیان لە چەندین لاوە هەڵدڕی، لەگەڵ کوبراکدا بە شەڕ هات. یفیمکا سەیری کرد ماروسکا و ڤاریا ئەسپەکانیان دوور لە یەکدی داژۆن. وای هاتە



بەرچاو کە لەم ڕۆژانەی دواییەدا ئەوانی بە تەنیشت یەکەوە نەبینی بوو. فەرماندەی دەستە، یفیمکا ئاگادار کردبۆوە کە خۆی لە کاری خەڵکانی دی هەڵنەقورتێنێ.

یفیمکا لەگەڕانەوەدا بەرەولای ماروسکا چوو، و گوتی:

– بزانم لە ژنەکەت دوور دەکەویتەوە، شەڕتان بووە؟

ماروسکا گێژو پەشێو، بە چارەی عەبوسی وشك و تووڕەوە تەماشای یفیمکای کردو گوتی: شەڕی چی، چ شەڕێك لە ئارادا نییە، بەرەڵلام کرد.

– بەرەڵلات کرد! ئەمجا بۆ ماوەیەك بە بێدەنگی و پەشێوی چاوی بڕییە خاڵێکی دوور، وەك بڵێی وشەی بەرەڵاکردن سەرسامی کرد، کەمێ لەبەر خۆیەوە تێفکری و گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە هەرگیز پێوەندییەکی ڕاستەقینە لە نێوان ئەو ژن و مێردەدا نەبووە، ئەمجا گوتی: ئەم شتانە هەر دەبن خزمە، مەبەستم ئەوەیە کە ئیدی ئەمە بەخت و ناوچەوانە. دەی تێی تەقێنە ئەسپە چکۆڵەکەم. یفیمکا بە فیزێکەوە قامچییەکی بە ئەسپەکەی داکێشا. ماروسکا لە دواوە چاوی بڕییە کراسە خورییەکەی. یفیمکا چووە نك لڤنسون، هەواڵی دایێ و بە سواری لە تەنیشتیەوە کەوتە ڕێ.

ماروسکا بەوپەڕی نا ئومێدییەوە بە خۆی گوت: ئاه، کە ژیانێکی سەختە! هەستی کرد خەمێکی گەورەی لە دڵ بارە، هەر چەند سەری دەهێناو دەبر، هەستی دەکرد شتێك بە ئێرەوەی بەستۆتەوە، ناتوانێ وەکو ئەوانی دی ئازادانە بە درێژایی لەشکرەکەدا هاتوچۆ بکات و خۆی تێکەڵ بەوانی دی بکات و ببێ بە هاودەمیان.

بە حەسوودییەوە بیری دەکردەوە: هەموویان بۆ خۆ بەختەوەرن، دڵیان بە کوێوە بێ دەڕۆن، چ خەمێکیان هەیە؟ سەیری ئەم لڤنسون–ە بکەن ئیژی گەنەسوورکەیە، هەمووش ڕێزی دەگرن، هەر کارێکی بویێ ئەنجامی دەدا، ئەمەیە ژیان!

ماروسکا ئاگای لەوە نەبوو کە چۆن لڤنسون بە دەم ژانی قەبرغەوە ئازاری دەچەشت. لڤنسون مەسئولیەتی مەرگی فرولوف تەحەمول دەکرد، خەڵاتیان بۆ سەری دانابوو، ئەوجاش لەوانە بوو یەکەم کەس بێ کە لەم ڕێیەدا گیانی خۆی لە دەست بدا، هەموو ئەو شتانەی ماروسکا لە خەیاڵا بەرجەستەی دەکرد، دنیایەك بوو پڕ لە پیاوانی بە تواناو ئارام و شاد، کەچی تۆزقاڵە ئومێدێکی بۆ خۆی نەدەدۆزییەوە.

بۆ یەکەم جار بیرەوەرییە تاڵ و سوێرەکانی ئەو ڕۆژە گەرمەی تەمووز کە لە نەخۆشخانەکە دەگەڕایەوەو درەوەنییەکان تاریفی سوارییەکەیان دەکرد، هێرشی بۆ مێشکی هێنا، بیرەوەری تێك هەڵچوونی لەگەڵ متچیکدا، تێپەڕبوونی بە مەزرا تەرك کراوەکاندا، دیمەنی ئەو قەلە ڕەشەی بە تەنێ و بە کزی لەسەر گیشە پووشەکان هەڵنیشتبوو، ماروسکایان گەمارو دابوو.

ئێستا سەرجەمی ئەو بیرەوەریانە لە ناخیا دەبوژایەوەو ئازاریان دەدا، جاران وا نەبوو! ماروسکا هەستی دەکرد سەراپای تەمەنی ڕابووردوی هەر هەڵخەڵەتاوە، ئێستاش کە دەڕوانینە دەوروبەری خۆی جگە لە گومان و ڕیا چ شتێکی دیکە نابینێ، هەنووکە دڵنیا بوو کە تێکڕای ژیانی، هەر لە منداڵییەوە –سەراپا ڕەنج و کاری سەخت و بێهودەو ڕابواردنی مەستانە



بووه، دڵنیا بوو هەموو ئەو خوێن و ئارەقەی لە ژیانا رشتبووی تەنانەت هەموو "خۆشییەکان"یش و کارە هەڵەکان چ لەزەتێکی نەداوەتی و چ شتێکی بە دیاری بۆ نەهێناوە، جگە لە مەینەتی کۆیلەیەکی فەرامۆش کراو نەبێ کە کەس نرخی بۆ دانەناوەو هەرگیزیش بۆی دانانێ، ماروسکا بیری لە پەستی و شەکەتی و پەشێوی و خەمباری پیرەمێردێکی رەنجاو دەکردەوە کە هەنووکە (27)ەمین قۆناغی تەمەنی بەڕێ کردووەو ناتوانێ تەنانەت یەك سات لەو تەمەنە بەسەرچووەی بگەڕێنێتەوە تا بەدڵی خۆی و سەر لە نوێ بژێتەوە. ماروسکا ئایندەیەکی روناکی لەبەردەم خۆیدا بەدی نەدەکرد، رەنگە بەم زوانەش گوللەیەك ساردی بکاتەوەو کۆتایی بە هەموو شتێکی بینێ و بێ ئەوەی دڵۆپە فرمێسکێکی بۆ بێتە رژان. وەکو فرولوف کە کەس بە مردنەکەی پەشێو نەبوو، گیان بسپێرێ. ماروسکا ئێستا بە ئاشکرا دەیبینی کە بە درێژایی هەموو تەمەنی و بەگشت توانایەکییەوە هەوڵی دابوو کە رێگایەك بگرێ —رێگایەکی رۆشن، راست و راستەقینە، رێگایەك کە خەڵکانی وەکو لڤنسون و باکلانوف و تەنانەت یفیمکاش (کە بە لای ماروسکاوە ئێستا هەمان رێگای گرتبووە بەر) پێیدادەڕۆیشتن.

ماروسکا وای هەست دەکرد هەمیشە ئەم یا ئەو کەسی بەدرەوشت لەو رێگایە دووریان خستۆتەوە، ماروسکا هەرگیز ئامادە نەبوو وا بیر بکاتەوە کە دژمن و تەگەرەی سەر رێگاکەی، خودی خۆیەتی، بۆیە زۆر جار و بە شێوازێکی تایبەتی زۆری پێ خۆش بوو و بیر بکاتەوە کە لە ئەنجامی نزمی خەڵکانی دییەوە —خەڵکانێ کە زۆربەیان لە چەشنی متچیك بوون— ئازاری دەچەشت.

ماروسکا پاش فراڤین ئەسپەکەی برد بۆ چۆمەکە تا ئاوی بدات. ئەو کابرا قژلوولە قەرەباڵغەی کە وەختی خۆی پەرداخە فافۆنەکەی لێ دزی بوو بەشێوەیەکی ئاڵۆز لێی هاتە پێشەوەو بە پەلەو لە ژێر لیوەوە کەوتە قسان: ئەوەی کە دەمەوێ پێت بڵێم... ئەوەی کە دەبێ بیڵێم، دوای کارە نهێنییەکان بېڕێتەوە، ڤاریا دەڵێم —ئا ڤاریا... برالە! من بۆ ئەم شتانە زۆر بە هەستم.

ماروسکا سەری هەڵبڕی و بە رەقی پرسی: چی؟ چ دەڵێی" کابرا بە هەندێ سەرسامییەوە گوتی: دەربارەی ژنان. من گەلەك شتیان دەربارە دەزانم، وێرای ئەمەش هێشتا زۆر گرنگ نییە، زۆر جدی نییە، بەڵام ناتوانن چ شتێك لە من وەشێرن، لە من.... ناتوانن برالە! ئەو ناتوانێ دەست لەو کوڕە هەڵگرێ.... چاوی بڕیوەتە ئەو, ئەم کارە دەکات....

ماروسکا هەر چەندە دەیزانی مەبەستی متچیکەو بیری چوو بوو خۆی گێل بکات، بە گۆنای لە رقا سوور هەڵگەڕاوەوە پرسی: دەربارەی کێ قسان دەکەی؟

پیاوەکە لە رووی ریاو مەراییەوە لە کاتێکا وای دەنواند کەقسەکانی پێشووی چ نەبووەو، باس کردنیان تەنیا بۆ پاساوی هەڵەی پێشوو, و بە دەست هێنانی خۆشەویستی ماروسکا بووە، لەسەری رۆیی: کێ؟ چۆن، نا، هیچ کەسێك، هەر.

ماروسکا تفێکی رۆکردە سەر زەوی و گوتی: بە ڤیروسیا! من هەقم چییە! بە پەستی و بە شێوەیەکی تەوس ئامێزەوە لەسەری رۆیی: من لەوەش پتر دەزانم، دوور نییە تۆش لەگەڵیا خەوتبیت.





– چی؟ نەحلەتی خوام لیٚ بیٚ ئەگەر، بۆ....

ماروسکا بە رقەوەو لە پڕ هاواریٚ کرد: بچۆوە.... دایکت. دوای ئەو هەستەت بپڕێتەوە! ئێستا ملت دەشکێنی یان! تا توانی شاپێکی تێهەڵدا.

میشکا لەم حەرەکەتە کوت‌وپڕەی ماروسکا ترسا، لە پڕ راپەڕیو پاشووەکانی خزانە نێو ئاوەکەوەو گوێچکەکانی رووەو ماروسکا قوڵاخ کردەوە.

کابرا هەناسەی سوار بوو بوو، بە رق و سەرسامی و لە ژێر لێوەوە بۆڵاندی: باشە، توخمە.... بەر لەوەی قسەکەی تەواو بکات بە ماروسکادا هەڵشاخی.

وەکو دوو گوڕ هەڵکەنە تێك ئالاّن. میشکا بە پەلە کشایەوەو لێیان دوور کەوتەوە.

ماروسکا بە مستە کوڵە بەربووە قەبرغەی کابراو، کابرا خۆی پێوە نووساندبوو، ماروسکا پێی نەدەکرا بە دڵی خۆی پێیدا بکێشێت، بە رقەوە بۆڵاندی: ئێستا پێت نیشان دەدەم کە بەو هەستەت چی بکەی، تۆ....!

پیاوێك لە سەرووی چۆمەکەوە بە سەرسامی هاواری کرد:

– تەماشای ئەوانە، هێی، دەیانەویٚ چ بکەن؟

دوو دەستی بە هێز خزانە نێوانیانەوە، یەخەی هەردووکیانی گرت و لێکدی جودا کردنەوە، ئەوان بیٚ ئەوەی ئاگایان لەمە بیٚ، هەوڵیان دەدا هەمدیس بە یەکدیدا هەڵشاخێنەوە، بەڵام هەر یەکەیان جەزرەبەیەکی بەرکەوت. ماروسکا پاشەو پاش کشایەوەو پشتی بە درەختێکا کەوت. ئەوی دی کەوتە سەر گەڵاو لق و پۆپی رژاوی درەختان و بە دەم تل دانەوە لە نێو ئاوەکەدا گیرسایەوە.

گونجارنکو بە کاوەخۆ گوتی: کوا دەستت بدە من با یارمەتیت بدەم، گەمەیەکی خۆشتان کرد.

ماروسکا بەدەم راپسك راپسكو پەلاماردانەوە هاواری دەکرد: ئاخر چۆن زات دەکا.... کابرایەکی وا سووك و چروك.... مردنی فەرزە... کابرای دی بە سیمایەکی گەوجانەوە لە بەرانبەر ماروسکادا وێستا بوو، بە دەستێك خۆیدا بوو بەسەر گونجارنکوداو دەستەکەی تری دەکێشا بەسینگی خۆیاو شێت ئاسا سەری دەلەقاندو رووی دەمی تەنیا لە گونجارنکو بوو، بە خەم و کەسەرەوە هاواری دەکرد: نا، تۆ دەبیٚ پێم بڵێی... تۆ دەبیٚ تێم بگەیەنی، ئەمە مانای وایە کە هەقی هەیە ئەم کارە لەگەڵ هەموو کەسێکا بکات؟ ئەگەر بیەویٚ و حەز بکات.... دەتوانیٚ لە دەرگای ..... هەر کەسێك بدات.... لە دەرگای.... هەموو کەسێك؟ ئەمجا کە چاوی بە حەشاماتەکەی دەوروبەری خۆیان کەوت، هاواری کرد: ئەگەر ژنەکەی, چما تەخسیری کێیە... کە ژنەکەی..... گونجارنکو خەمی ماروسکای بوو، دەترسا لقنسون بەدەم غەڵبە غەڵب و قەڵەباڵغییەکەوە بیٚت و بە مەسەلەکە بزانیٚ، بۆیە پیاوەکەی بەرەڵلاّ کردو باوەشی بە ماروسکادا کردو بردییە پەنایەکەوە.

ماروسکا دەیویست خۆی لە دەستی گونجارنکو دەربێنیٚ. گونجارنکو بەدزییەوە پێی گوت: ئاخر قەحپە دایك واز بێنە! تۆ خۆت دەزانی دەرت دەکەن.



ماروسکا کە هەستی کرد ئەم پیاوە بە هێزو تووڕەیە خێری ئەوی دەوێ، ئیدی دەست بەردار بوو، کابرایەکی جەرمانی چاوشین کە لە دەستەکەی متلیستا بوو، بە غاردان بەرەو لایان چوو و پرسی ئەوە چییە؟ گونجارنکو بە ئەدەبەوە وەڵامی دایەوە: ورچێکیان گرتووە.

- ورچێك؟ کابرای چاو شین لەسەرسامیدا ئەبڵەق بوو، هەڵوەستەیەکی کردو بە پەلە کەوتە غاردان، دەتووت بە تەمای کوشتنی ورچەکەیە.

ماروسکا بۆ یەکەمجار بە سەرسامی و سەرنجەوە تەماشای گونجارنکوی کردو پێکەنی، ئەوجا بە بیری ئاسوودەوە گوتی: تۆ چ جانەوەرێکی سەیری! گونجارنکو پرسی: بۆ لەگەڵی بەشەڕ هاتیت؟

ماروسکا بە هەڵچوونەوە گوتی: بۆ.... هیچ و پوچ و خوێری وەکو ئەمە... دەبێ.... گونجارنکو کەوتە دڵدانەوەی ماروسکاو قسەکەی پێ بڕی.

- ئاه، ئەرێ، کەواتە هەقی خۆی بوو؟ زۆر چاکە!

باکلانوف لە پەنایەکەوە، بە دەنگێکی گڕ فەرمانیدا: بچنەوە شوێنی خۆ!

میشکا لەم ساتەدا کەڵڵە تووکنەکەی لەنێو دارستانەکەوە هێنایە دەرێ، بە چاوە زیت و رەشەکانی سەیرێکی کردن و بە هێوری حیلاندی.

ماروسکا کە کەوتبووە ژێر کاریگەری دەنگی میشکاوە، بانگی کرد: هێی، هاوڕێ!

- ئەسپێکی زۆر چاکت هەیە.

ماروسکا لە کاتێکابە دڵسۆزی و خۆشەویستییەوە دەستی بە ملی ئەسپەکەیدا دەهێنا، گوتی: ئامادەم گیانی خۆمی فیدا بکم!

گونجارنکو ردێنە رەش و بژەکەی جوڵاندو بزەیەکی دۆستانەی بە رووی ماروسکادا داو گوتی:گیانت بەفیڕۆ مەدە، رەنگە پیویستت پێی ببێ. با منیش بچم ئەسپەکەم ئاو بدەم، دەتبینمەوە... ئەوجا بە هەنگاوی زلەوە بەرەو ئەسپەکەی کەوتەرێ.

ماروسکا لە دواوە تەماشای گونجارنکوی کرد بەلایەوە سەیر بوو کە چۆن تا هەنووکە ئەم پیاوە بە نرخەی نەناسیوەو گوێی پێ نەداوە.

پاشان کە دەستەکان ریز بوون, ماروسکا خۆ بە خۆ چووە ریزەوەو لە تەنیشت گونجارنکووە وێستا، بە درێژایی کوڕەوەکە بەرەو چۆمی خوانیخدزا, بەنێونەخت لە گونجارنکو غافڵ نەبوو.

ڤاریاو ستاشینسکی و خارچنکو کە نەقڵ بوو بوون بۆ دەستەکەی کوبراك, دەستەی دواوە بوون. لڤنسون لە ریزی پێشەوەی هەموویانەوە سواری ئەسپەکەی بوو بوو, و بە لەقە لەق دەچووە پێشەوە. باکلانوف لە پاش- لڤنسون وەوە بوو بێ ئەوەی بە خۆ بزانێ لە رۆشتن و رەفتاردا لاسایی لڤنسونی دەکردەوە.

ڤاریا بە درێژایی رێگا وای هەست دەکرد متچیك لە دواوەیەتی, رەفتارەکەی دوێنێی متچیك ئازاری دەدا گڕی سوزو حەزی سارد دەکردەوەو دای دەمرکاندەوە. ڤاریا لەو رۆژەوە کە متچیك لە خەستەخانە دەرچوو بوو. بە نێو نەخت خەیاڵی ئەوی لەسەر دەرنەکرد بوو, هەر بە ئومێدو خەیاڵی دیداری تازەیان دەژیا، شیرینترین کەڵکەڵەو ئارەزو لە ناخی ئەم ئومێدو



خەیاڵانەی دادەگەشایەوە –کەڵکەڵەو ئارەزوو گەلێك کەڤاریا هەرگیز دانی پێدا نەنان– بەڵام ئەوەندە لە بەر چاوو زیندوو بوون کە بە دەست بێنە گرتن.

متچیك–ی دەهێنایەوە بەرچاوی خەیالی خۆی، کورێکی قۆزو سەلار، کەمێك شەرمن، بە قەمسەڵە چەرمییەکەیەوە لە قەراخ دارستانەکەوە دەردەکەوت. ڤاریا جڵەوی بۆ خەیاڵ شل دەکرد، هەستی دەکرد هەناسەی گەرمی متچیك بەدەنی دەوروژێنێ، دەستی سۆز بە قژە نەرمو پڕ پێچەکەیدا دەهێنێ، وشەی دڵگیرو بە ئاهەنگ بە گوێیدا دەدا. ڤاریا هەوڵی دەدا یادی سووکە شەڕەکەیان لەبیر بەرێتەوە. وای خەیاڵ دەکرد کە ئیدی هەرگیز جودایی ناکەوێتە نێوانیانەوە، پێوەندی ئایندەیان جیاوازتر دەبێ‌و تا خەیاڵ بڕ دەکات خۆش‌و ئاسایی دەبێ.

وەختێ ڤاریا تووشی متچیك بوو، بە حوکمی تەجرەبە بۆی دەرکەوت کە متچیك لەوە ئاشفتەو پەرێشانترە بتوانێ لە بەرانبەریا خۆی کونترۆڵ بکات, ئەو رووداوانەی کە ئێستا پەرێشان‌و پەشێویان کردووە، لە ئازارە شەخسیەکانی گرنگترە، بەڵام چونکە ڤاریا پێشتر ئەم دیدارەی بە جۆرێکی دیکە بەرجەستە کردبوو، بۆیە رقی‌و توندییە چاوەڕوان نەکراوەکەی متچیك زۆری ئازارداو خستییە ترسەوە.

ڤاریا بۆ یەکەمجار هەستی کرد ئەم رەقی‌و ساردییە زادەی رێکەوت نەبووە، رەنگە متچیك ئەو پیاوە نەبووبێ کە ڤاریا بەدەم چاوەڕوانییەوە شەو و رۆژی دوورو درێژی لە پێناویا گوزەراند بوو... بەڵام چ کەسێکی تری لە دڵی خۆیدا شك نەدەبرد.

ڤاریا نەیتوانی بوو تەنانەت لە دڵی خۆشیاو بۆ تاقە جارێکیش دان بەم کارەیدابنێ، زۆری بەلاوە ئەستەم بوو تەواوی ئەم ئارەزووانەی –گشت خەم‌و شادییەکانی– کە شەوان‌و رۆژگاری دوورو درێژ لە پێناویا ژیا بوو، فەرامۆش بکات‌و لە پڕ توڕیان بدات، بۆیە لە ناخا هەستی بە بۆشاییەکی ئەوتۆ دەکرد کە چ شتێك توانای پڕکردنەوەی نەبوو، دڵخۆشی خۆی بەوە دەدایەوە کە کارێکی نائاسایی رووی نەداوەو هەموو گۆڕانەکان زادەی مەرگی خەم‌و رۆژێنی فرولوف بووەو، بەم زووانە هەموو شتێك ئاوەڕۆی ئاسایی خۆی وەردەگرێتەوە. کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کەبیری دەکەوتەوە چۆن بە دنیایەك عەشق‌و خەونی زێڕینەوە بەرەو پیری متچیك چوو، چۆن متچیك رەنجاندنی، چۆن بە رەقی‌و ساردییەوە دەستی بە روویەوە نا، ئازاری دنیای دەچەشت.

ڤاریا بە درێژایی رۆژەکە بە ئاواتی ئەوەوە بوو کە متچیك ببینێ یان قسەی لەگەڵ دا بکات، کەچی متچیك تاقە جارێکیش ئاوڕی لێ نەدایەوە. تەنانەت لەو وەستانە کەمەشا کە بۆ فراڤین وێستان، نەچووە نك متچیك، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: خۆ تازە نابمەوە بە کچۆڵە تا لەم کون بۆ ئەو کون شوێنی بکەوم؟ ئەگەر راست دەکاو وەکو خۆی دەیگوت –خۆشی دەوێم، با ئەو یەکەم هەنگاو بنێ‌و بێتە سۆراخم– من یەك تۆزقاڵ گلەیی لێناکەم. خۆ ئەگەر ئیدی نەیەت... ئەوا ئیدی هەموو شتێکم بەلاوە وەکو یەك دەبێ‌و تا دوا هەناسە بە تاقی تەنێ دەمێنمەوە.

کە گەیشتنە سەر زنجیرە سەرەکییەکەی کێوەکە، جادەکە پان بۆوە، سیسکین بە هانکە هانك خۆی گەیاندە تەنیشت ڤاریا. سیسکین رۆژی پێشوو ڤاریای چنگ نەکەوتبوو، بەڵام لەم



مەسەلانەدا یەجگار قیرسیچمە بوو، بە ئاسانی نائومێد نەدەبوو، ئەژنۆکانی لەلاقی ڤاریا دەسوو، قسەی کرێت و سوکی بە گوێی دا دەدا، بەڵام ڤاریا چونکە لە دەریای بیرەکانی خۆیدا بوو، قسەکانی ئەوی نەدەژنەوت.

سیسکین بەپێ داگرتنەوە دەیگوت: باشە خانم، دەربارەی ئەو مەسەلەیە چ دەڵێی؟ باشە؟ (سیسکین بێ رەچاوکردنی تەمەن یان پایەو پێوەندی، وشەی خانمی بۆ هەموو ئافرەتێك بەکار دەهێنا).

ڤاریا لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە : ئەها ئێستا هەموو شتێ حاڵی بووم– وەك بڵێی دەبێ من لە ئاغا بپارێمەوە؟ ئەرێ بەڕاستی ئەوەندە زەحمەتە، کە لەگەڵ منا باش بێ؟ خۆ لەوانەیە ئەویش هەنووکە نیگەران و ناڕەحەت بێ، رەنگە واش بیر بکاتەوە کەمن لێی ناڕەحەتم، ئەدی چۆن دەشێت قسەی لەگەڵ بکەم؟ نا، مەحاڵە! دوای ئەو جۆرە ترۆ کردنە! نا, نا. با من دەستپێشکەری نەکەم.

– خانمی ئازیز، ئەوە کەڕیت، یان چی؟ دەڵێم رازیت؟

ڤاریا راچڵەکی و پرسی: ئەوە چی دەڵێی، رازی بوونی چی؟ خۆت دەزانیت... بۆ کوێ دەڕۆی بڕۆ.

سیسکین بە دڵشکاوییەوە شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی: چ خوڵکێکە! خانمی ئازیز، خۆت گران مەگرە، ئێژی ئەمە یەکەم جارتە، ئیژی کچۆڵەیە هیچ ناچێتە عەقڵییەوە. سیسکین ئەمجا بایدایەوەو بە کاوەخۆ کەوتە تکاو پاڕانەوە، بە خەیاڵی خۆی ڤاریا هەموو قسەکانی ئەوی ژنەوتووەو حاڵی بووە، بەڵام وەکو هەر ژنێك ناز دەفرۆشێ.

کە شەو داهات، تارێکی دۆڵەکانی قووتدا، تەمو مژ سەر کانیاوەکانی گرت و هێدی هێدی بەرەو دۆڵەکان کشا، ئەسپەکان شەکەت و ماندوو دەیان پرماند. متچیك هێشتا نەهاتبووە دیدەنی ڤاریا، ئاشکراش بوو کەنیازی هاتنی نییە. ڤاریا تا لە نەهاتنی متچیك دڵنیاتر دەبوو، پتر هەستی بەبێ ئەنجامی ئارەزووەکانی و تاڵی خەونەکانی پێشووی دەکرد، لەمەش قورسترو زەحمەت تر ئەوەبوو نەیدەتوانی ئارەزوو و خەونەکانی لە دڵ دەربکاو بە فەرامۆشییان بسپێرێ.

پارتیزانەکان شەوێ لە دۆڵێکا لایاندا، ئەسپەکان و پیاوەکان لە نێوان سێبەرە ساردو شێدارەکانا لە دەوری یەك خڕبوونەوە.

سیسکین بە منجڕی و لاساری عاشقانەوە پێی دادەگرت: باشە خانمی ئازیزم، کەواتە لەبیرت نەچێ باشە، بەو ناونیشانەی ئاگرێکی چکۆڵە دوور لەوانی دی دەکەمەوە، ئەمەت لەبیر نەچێ، دوای تۆزێك کەوتە بۆڵەبۆڵ بەسەر یەکێکدا: بۆ کوێ دەڕۆم! تۆ حەقت چییە؟ ئەدی خۆت لێرە چ دەکەی، حەرەسی رێگاکەی؟ بۆ دەتەوێ بە زۆر جێی خۆت لێرە بکەیتەوە، ئێرە شوێنی لقەکەی ئێوە نییە!

– ئەوە چ دەڵێی؟ لقی من نییە؟ چاوت بکەوە!



پاش بێدەنگییەکی کەم کە گوایە هەردووکیان بە رواڵەت –چاویان دەکردەوە– ئەو زەلامەی کە پرسیاری لە سیسکین کردبوو، وەکو یەکێك هەڵەیەکی کردبێ و ژیوان بێ، گوتی: نەحڵەت لە شەیتان، ئەمە دەستەکەی کوبراکە، ر استە. ئەدی دەستەکەی متلیستا لە کوێیە؟ کابرا هەستی کرد سەدای دەنگی تا رادەیەك هەڵەکەی داپۆشیوە، هەمدیس بە دەنگێکی بەرزو ناڕەحەت گوتی: مت– لی ستا؟.

لە قوولایی دۆڵەکەوە هاواری پیاوێك هاتە گوێ، دەتگوت کەسێکەو خۆ کوژی دەکات، یان کەسێکە دەپاڕێتەوەو کەس گوێی لێ ناگرێ، بە راست و بە چەپا دەکەوتە سەر عاردی: پێت دەڵێم ئاگر بکەوە!

لە پڕ لە قوولایی دۆڵەکەوە بڵێسەی گڕێك لەنێو کپی و بێدەنگیدا بەرز بۆوە، تارمایی پیاوانی شەکەت و سەرو کەللەی توکنی ئەسپان و بریقەی ساردی تفەنگ و فیشەکدانان لە ناو جەرگەی تاریکییەکەوە کەوتنە بەرچاو.

ستاشینسکی و ڤاریا و خارچنکو بە سواری چوونە کەنارێکەوە دابەزین.

خارچنکو بە شادییەکی دەست کردەوە کەکاردانەوەی لەلای چ کەسێك دروست نەدەکرد، گوتی: باشە، ئێستا ئێمەش بۆ خۆ ئاگرێ دەکەینەوە –تا ئیسراحەت بکەین، با هەموومان بچین چیلکان خڕ بکەینەوە، هەمیشە هەر وا بووە– قەت لە شوێنی خۆیدا نەوێستاوین و هەمیشەش زیانەکەیمان دیتوە. خارچنکو بە دوو دڵی دەدواو کوێرانە دەستی بە نێو پوشەکاندا دەگێڕا, خارچنکو بەڕاستی لەم وەزع و حاڵانە بێزار دەبوو، لەشێ، لەتاریکی، لە ترسی ئەوەی نەبادا مار بە دەستییەوە بدات و ئەنجام لە بێدەنگییە خەم وروژێنەکەی ستاشینسکی: لە بیرمە وەختێ ساچان– یشمان بەجێهێشت بەم جۆرە بوو، دەبوایە بەر لە رۆژئاوا لامان بدایە، ئێستا تاریکی هەموو لایەکی داگرتووە، بەڵام ئێمە....

ڤاریا لەبەر خۆوە تێفکری، بۆ ئێستا ئەم شتانە دەڵێ؟ ساچان.... کە ئەوێیان بەجێهێشت... تاریکی هەموو لایەکی داگرتووە.... قسە بۆ کوێ دەکات! کێ گوێی لێ دەگرێ؟ خۆ هەنووکە هەموو شتێ تەواو بووە، چ شتێکیش رووی نەداوە، ڤاریا برسی بوو، بیری لەو بۆشاییە خامۆش و سەختە دەکردەوە کە چ شتێك لە عالەما نەبوو بتوانێ پڕی بکاتەوە، بە دەم بیرکردنەوە دانەی فرمێسك بە سەر گۆناکانیا خزین.

بە هەر حاڵ پاش شێو خواردن خۆیان لەبەر ئاگرەکە گەرم کردەوە، هەرسێکیان خۆشحاڵ بوون. ئێستا ئەو دنیا ساردو غەریبە سپی واژەی، گەمارۆی دابوون، لەلایان ئاشناو گەرم و هۆگر بوو.

خارچنکو کەوتە کردنەوەی بوخچەکەی، وەکو یەکێکی لەخۆڕازی گوتی: ئەمەش پاڵتۆکەم، پاڵتۆیەکی کەون و عەنتیکەیە! نە لە ئاگرا دەسووتێ، نە لە ئاوا نقوم دەبێ، خۆزیا ژنێکم دەبوو، بە دوو قۆڵی لە ژێریا دەخەوتین ئەمجا چاوێکی داگرت و پێکەنی.

ڤاریا پاش ئەوەی لەبەر ئاگرە خۆشەکە گەرم بۆوە، شێوەکەی خواردو قسە خۆمانییەکانی خارچنکوی ژنەوت، هەستی کرد ئاسوودەیی باڵ بەسەر رۆحیا دەکێشێت و دڵی دەکاتەوە،



لەبەر خۆوە تێفکری: بۆ وا شتەکەم لەگەڵ ئەو کوڕەدا خەست کردۆتەوە؟ ئاخر شتێکی گرنگ نەقەوماوە، ئەدی بۆ ئەوەندە توڕەو کەللەیی کردم؟ قەلەندەرە تەنیا لە بەر خاتری گەوجێتی من بە تەنێ لەوێ دانیشتووە، من هەر ئەوەندەم لەسەرە هەستم و بچمە کنی، ئیدی هەموو شتێك وەکو جارانی لێ دێتەوە.

ڤاریا هەستی کرد بە هیچ جۆرێ حەز ناکات رق لە متچیك هەڵگرێ, رقێ کە دەبێ هەر خۆی پێوەی بتلێتەوەو ئازارەکەی بچێژێ, ئەویش لە کاتێکا هەموو دەوروبەرەکەی خۆیان بەوە راهێنا بوو کە لەبەر خاتری هیچ شتێك خۆیان ئازار نەدەن و بێ دڵی خۆیان نەکەن, بۆیە هەر لەوێ داو دەمو دەست بڕیاریدا هەموو بیرێك لە مێشکی خۆی بتارێنێ و دەست بەجێ بچێتە نك متچیك, ڤاریا هەنووکە چ شتیکی ناشرین و کرێت و ناپەسەندی لەم کارەی خۆیدا بەدی نەدەکرد.

لەپڕ بە خۆشییەوە لەگەڵ خۆیدا کەوتە بیرکردنەوە: بەس پێم رازی بێ, خۆشی بوێم, هەر ئەوەندە لەلام بێ هیچی دیم لێی ناوێ, ئەگەر هەمیشە ئەسپەکەی لە تەنیشتمەوە باژوێ و قسەم لە گەڵدا بکات و لەلام بخەوێ.... هەموو شتێکی خۆمی فیدا دەکەم.... گەلەك گەنج و قۆزە...

متچیك و سیسکین دوور لەوانی دی ئاگرێکیان بۆ خۆ خۆش کرد. بەڵام لەوە تەمەڵ تر بوون کە شیوێ بۆ خۆ چێ بکەن، هەندێ گۆشتی چەق و لەڕی بەرازیان بۆ خۆ برژاند، ئەوەندە بەئشتیاوە پەلاماری گۆشتەکەیان دا، نانیان بیر چوو، وەختێ گۆشتەکەیان تەواو کرد هێشتا هەر برسی بوون.

متچیك هێشتا بە تەواوی لە مۆتەکەی مەرگی فرولوف و گوم بوونی کوتو پڕی پیکا رزگاری نەبوو بوو، هەستی دەکرد بیری سەیرو پەرێشان، تەنیایی، مەرگ، لە هەموو لایەکەوە تەم ئاسا گەمارۆیان داوە. دەمەو عەسر ئەم تەمە رەوییەوە، بەڵام هێشتا لە هەموو کەسێك دەترساو حەزی نەدەکرد چ کەسێك ببینێ.

ڤاریا پاش زەحمەتێکی زۆر ئاگرەکەی ئەوانی دۆزییەوە. روناکی ئەو ئاگرانەی لە ئۆردوگاکەدا کرابوونەوە سەرانسەری دۆڵەکەی داگرتبوو، پیاوان لە نێوان دوکەڵی ئاگرەکانەوە سەرگەرمی گۆرانی چڕین بوون.

ڤاریا بە هەناسە بڕکێو دڵە خورپەوە لە بێشەکەوە دەرچوو، و گوتی: ئاه، ئەوە ئێوە لێرە خۆتان شاردۆتەوە.

متچیك راچڵەکی، نیگایەکی ساردی ڤاریای کردو بە شپرزەییەوە رووی بۆ لای ئاگرەکە وەرچەرخاند.

سیسکین بەدەم پێکەنینێکی ئاساییەوە گوتی: هێی, تۆمان ون کردبوو، دانیشە خانمی ئازیزم، دانیشە!

پاڵتۆکەی داخستو ڤاریای خوڵك کرد کە لە تەنیشتییەوە دانیشێت. ڤاریا لە لایەوە دانەنیشت، ڤاریا هە ر چەند پێشتر وەکو سەرنجی خۆی سیسکینی بە پیاوێکی کەمو



نەفس نزم دەزانی، بەڵام کە ئەو کردەوەیەی لێ بینی هێندەی دی لەلای سووك بوو، و رقی لێی هەستا.

ڤاریا بێ ئەوەی بەلایەوە شەرم بێ ئەوە نیشان بدات کە تەنیا لە بەر خاتری متچیك هاتووە، رووی کردە متچیك و بە دەنگێکی ناسكو پەرێشان لەسەری رۆیی، هاتم بزانم چۆنی. خۆ تۆ ئێمەت بە تەواوی فەرامۆش کردووە، خارچنکو ئەحواڵی دەپرسیت. شتێکت لێ هاتبوو.... دەیگوت خراپ بریندار بوویت. بەڵام وادیارە لە خەتەر رزگار بوویت. خۆ بە نیسبەت خۆمەوە چت عەرز بکەم....

متچیك بە ساردییەوە شانەکانی هەڵتەکاند.

سیسکین کە دەیویست بە هەر جۆرێ بێ ڤاریا بەلای خۆیدا راکێشێت، بە تاسەوە لەسەری رۆیی. پێیان بڵێ وەعزمان زۆر چاکە- هیچ خەمیان نەبێ. بەڵام خانم وەرە دانیشە، شەرم مەکە!

ڤاریا وەڵامی دایەوە: قەیدی نییە، هاتبووم.... بە رێکەوت بە ئێرەدا تێدەپەڕیم.

ڤاریا لە ناخدا بە خۆیدا شکایەوە. لە بەر خاتری متچیك بۆ ئەوێ چوو بوو کەچی متچیکیش بەوپەڕی ساردییەوە شانی هەڵتدەتەکاند، ڤاریا بەم چەشنە لەسەری رۆیی: بزانم هیچت نەخواردووە.قسعەکەت پاكو تەمیزە.

سیسکین سیمایەکی تایبەتی گرتە خۆو گوتی: ئەدی لەوێ چ پەیدا دەبێ! خۆ ئەگەر هەمان ئازوقەی راستەقینەمان بدەن.. بەڵام کوا, مەگەر شەیتان بزانێ کەچمان دەدەنێ! هەمدیس بە شێوەیەکی نائومێدانە کەوتەوە خولَق کردنی ڤاریا. دەستی ڤاریای گرتو بەرەو لای خۆی رای کێشا: دەوەرە ئیدی، وەرە لە کنم دانیشە: دانیشە خانم، دانانیشیت؟ لەسەر پاڵتۆکەو لە تەنیشتییەوە دانیشت.

سیسکین چاوێکی لێ داگرتو گوتی: قەولەکەی خۆت لەبیرە؟ ڤاریا بەدەم گوێ هەڵخستنەوە هاواری کرد: کام قەول؟ کە زانی ئەم پیاوە چی مەبەستە، لەبەر خۆوە تێفکری: ئاخ نەدەبوو بێم. دەتگوت ئازارێکی سەخت لە ناخیا هاتەوە سوێ.

- چۆن- کام قەول؟ ئەها، حاڵی بووم، ئێستا پێت دەڵێم. ئەمجا بە پەلە بەسەر متچیکدا دانەوییەوە، شانی متچیکی گرتو رووی بۆ لای ڤاریا وەرگێڕاو گوتی: ئەگەرچی کاری ژێراو ژێر لە لقدا کارێکی چاك نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا....

ڤاریا خێرا خێرا چاوانی دەتروکاند، بە پەنجە سستو لەرزۆکەکانی یاری بە قژەکەی دەکرد، بە پێکەنینێکی تاڵەوە گوتی: کاری ژێراو ژێر؟ بڵێ بزانم.....

سیسکین رووی کردە متچیك و بە چپەوە پێی گوت: ئاخر تۆی ئیبلیس بۆچی وەکو بەرازی ئاوی لێرە دانیشتوویت؟ بە هەزار زەحمەت سازم کردووەو تۆش...

متچیك خۆی لە دەستی سیسکین راپسکاند، سەیرێکی ڤاریای کرد، لە شەرمانا سوور هەڵگەڕا، نیگای پڕ لە گازاندەی ڤاریا دەتگوت بەسەرزەنشتەوە لێی دەپرسی: چاك بوو، ئێستا دڵت داکەوت؟ بینیت چم پێ دەڵێ!



هەر کە سیسکین گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی, ڤاریا بە شپرزەییەوە گوتی: نا، نا، من دەڕۆم.... نا، نا,... نا، نا... من دەڕۆم. ئەوجا هەستایە سەر پێ، بەسەری لەشەرما شۆڕو بە هەنگاوی وردو خێراوە لەناو تاریکییەکدا ون بوو.

سیسکین وەکو مار دەیفیشکاند، لە متچیك پڕو پەست بوو، گوتی: ناشی، هەمدیس لێت تێکداینەوە! وەك بڵێی هێزی رووتی حەیوانی لە ناخیا پەتی پچڕاند، بۆیە لە پڕ هەستاو بە گورگە لۆقە دووی ڤاریا کەوت.

سیسکین خۆی گەیاندە ڤاریا، بە توندی دەستێکی لە قەدی ئاڵاندو لەسەری رۆیی: وەرە بڕۆین، خانمی ئازیز یاڵڵا دەی، چکۆلانەکەم ئەمجا رایکێشایە نێو بێشەکەوە.

ڤاریا لە تاقەت کەوتبوو، قورگی پڕ بوو بوو لە گریان. بە پاڕانەوەوە گوتی: وازم لێ بێنە با بڕۆم، حەز دەکەم بە تەنێ بم، ئەگینا فیزاح دەکەم. هەستی دەکرد توانای فیزاحکردنی نییە. وێڕای ئەمەش چ پێویست بە فیزاحکردنە! بۆ فیزاح بکات؟ لەبەر خاتری کێ؟

سیسکین دەستێکی خستە سەردەمی، سات بە سات پتر جۆشی دەسەند، گوتی: با بڕۆین خانمی ئازیز، بۆ فیزاح دەکەی؟

– راستیش دەکات، بۆ فیزاح بکەم؟ ئیدی چ فایدەیەکی هەیە؟ بە خەمبارییەوە بیری کردەوە: بەڵام ئاخر ئەمە سیسکینە.

سیسکین! ئاخر بۆ ئەم؟ ئاه، چ فەرق دەکات! بەڕاستی هەموو شتێکی بەلاوە وەکو یەك لێهات.







**ڕەنج**

**ماروسکا دەیگوت: من ئەوانم خۆش ناوێ، ئەو جووتیارانە. من ناتوانم بە ئاسانی لەگەڵیاندا هەڵبکەم، و بەردەوام لەسەر زینەکە دەجووڵا. هەر جارێ کە میشکا دەستی ڕاستی هەڵدەبڕی، ماروسکا قامچییەکەی دەکێشا بە گەڵای زەردو لەرزۆکی درەختانی غاندا، لەبیرمە هەندێ جار دەچووومە دیدەنی باپیرەم-جگە لەو، دوو مامیشم لەوێ بوون... ئەوانیش کێڵگەیان دەکێڵا. نا، ناتوانم بە ئاسانی لەگەڵیاندا هەڵکەم، ئەوان وەکو هاوڕێ مەعدەنچییەکانم نین، خوێنیان لە یەکدی جیاوازە. ئەوان هەم ڕەزیلن و هەم موزیرن، ئەمە حەقیقەتێکە بۆ خۆی! کە دارغانێکی لە دەست دەچوو، هەر بۆ پاراستنی ئاهەنگی جەزرەبەکانی قامچییەکەی بە پێڵاوەکانی خۆیا دەکێشا. بەدەم سەر هەڵبڕینەوە پرسی: ئەرێ ئەم ڕەزیلی و موزیرییە چ سوودێکی هەیە؟ بۆ خاوەنی خوێنێ نین کە ناوو عادەتێکیان پێ ببەخشێت! هەر هەموویان گەدان! بە حاڵەتی بێگانەیەکی دڵپاك و دڵسۆزێ کە بۆ هەژاری جووتیاران بە داخ بێ، پێکەنی.**

**گونجارنکو بەدەم گوێ گرتنەوە، لە بەینی هەردوو گوێچکەی ئەسپەکەیەوە چاوی بڕی بووە بەردەم خۆی. حاڵەتی وریایی و زیتی چاوەکانی ئەوەی دەنواند کە دەزانێ چۆن گوێگرێکی باش بێ و چۆن وەڵامی ئەو قسانە بداتەوە کە دەیان ژنەوێ.**

**گونجارنکو بە باوەڕێکی بەتینەوە گوتی: ئەگەر تۆ بە ئاستەم هەر یەکێك لە ئێمە بورووژێنی، هەر یەکێك لە ئێمە-پاش تەماشاکردنی ماروسکاو تاکید کردن لەسەر وشەی (ئێمە) لەسەری ڕۆیی: بۆ نموونە من بڵێ، یان خۆت یان دوبوف- لە ناخی هەر یەکێکماندا جووتیارێك دەدۆزیتەوە. بەڵێ دەیدۆزیتەوە. بە دڵنیاییەوە دووبارەی کردەوە: جووتیارێك بە هەموو خەسڵەتەکانی جووتیارەوەو بە هەموو شتەکانی دیکەشەوە جگە لە پێڵاوە کەتانیەکانمان.**

**دوبوف ڕووی کردە ئەوان و پرسی: باسی چی دەکەن؟ لەوانەیە لە پێڵاوە کەتانیەکانیشماندا... سەبارەت بەجووتیار قسان دەکەین. من دەڵێم لە ناخی هەر یەکێکماندا جووتیارێك هەیە.**

**دوبوف بە دوو دڵی پرسی: باشە ئەگەر وابێ چییە؟**

**- مەبەست شتێکی دییە؟ ماروسکا دەڵێ کە باپیرێك و دوو مامی لە گوندیدا هەیە. تۆ....**

**دوبوف هاتە نێو باسەکەوەو گوتی: هاوڕێ من هیچ کەسێکم نییەو لەم ڕووەوە شوکرانەی خوا دەکەم! منیش، دەبێ دان بەوەدا بنێم کە لەم ئەسڵ و فەسڵە بێزارم. با ئەم کوبراکی حازرییە بە نموونە وەربگرین، یەکەمجار خۆی.**

**- زۆر باشە، دەڵێن بنیادەم ناتوانێ چاوەڕوانی ئەقڵ و هەست لە هەموو کەسێك بکات- بەڵام تۆ بزانە کەسێك لە لقەکەی دا پەیدا دەبێ! و بە ڕقەوە تفێکی ڕۆکردە سەر زەوی.**



ئەم گفتوگۆیە لە پێنجەمین رۆژی کۆڕەکەدا, وەختێ هێزەکە لەسەرچاوەی خوانیخدزا لای دا، روویدا. ئەوان شان بە شانی کۆنە جادەیەکی زستانەی بە پووش و پەڵاش داپۆشراو دەڕۆیشتن. هەر چەندە کەسیان یەك تۆزقاڵ لەو ئازوقەیەیان پێ نەمابوو کە یاریدەدەری مەسئولی تەداروکات لە خەستەخانەکەوە برد بوونی. بەڵام ورەیان زۆر بەرز بوو, چونکە دڵنیا بوو بوون کەئیدی پەناگایان زۆر دوور نییە.

ماروسکا بەدەم چاو داگرتنەوە پرسی: گوێت لێ بوو چی گوت؟ چونکە فەرماندەکە لەگەڵ رایەکانی ئەودا بوو نەك رایەکانی کونجارنکو، بۆیە بە سەرسامی پێدەکەنی و کەیفی دەکرد: دۆستی دێرینە، ئەدی نابێ دوبوف ئەم شتانە بزانێ؟

مینەرەکە بێ ئەوەی شێلو بێ، گوتی: بەم جۆرە راو بۆچوون لەسەر هاووڵاتیانمان دەرنابڕدرێ، زۆر چاکە ئێوە قەوم و قیلەتان لە گوندا نییە– ئەمەیان مەسەلەیکی گرنگ نییە. منیش جارێ هیچ کەسێکم لەوێدانین. بەڵام ئێوە خەڵکانی مەعدەن لەبەر چاو بگرن، دیارە تۆ لە دەوروبەری "اورال"ەوە هاتوویت، بەڵام دێینە سەر ماروسکا کە جگە لە زنجەکانی مەعدەن چ شوێنێکی دی نەدیتوە.

ماروسکا نیگەران و سەخڵەت دەهاتە بەرچاو, بە ناڕەزاییەوە پرسی: مەبەستت لە چ شوێنێکی دی نەدیتووە، چییە؟ ئەدی بەرەی جەنگ چ بوو کە من.....

دوبوف بەدەم دەست جوڵاندنەوە، قسەکەی ماروسکای بڕی و گوتی: تۆ وس بە! با قسەکەی تەواو بکات.

گونجارنکو بە هێمنی لەسەری رۆیی: چما مەعدەنەکەی ئەنگۆش هەر گوندێك نییە: یەکەم هەر کەسەو باخێکی بۆ خۆی دابڕیوە، نیوەی خەڵکەکەتان زستانان بە دووی کاردا دەڕۆن و هاوینان دەگەڕێنەوە گوندی، چونکە لەوێدا تەنانەت گا کێوییەکانتان، بەرازان گاز دەکەن، من بە خۆم لە مەعدەندا بووم و دەزانم.

دوبوف توانای بەرپەرچ دانەوەی گونجارنکوی نەبوو. بەسەرسامی پرسی: وتت گوندێکە؟

– ئەدی چی؟ ئەو خەڵکانەی لە دەوروبەری باخاتدا دەژین و ژنەکانیان لەوێن هەموویان جووتیارن، لات وایە ئەمانە بێ تاسیرن؟ هەڵبەتە تاسیریان هەیە!

بەدەست هەواکەی لە خۆی دوور خستەوە.

دوبۆف لە کاتێکدا دەترسا کە نەوەك لە قسەکانیا شتێکی ئابڕووبەر بۆ مەعدەنچیەکان هەبێ، بە دوو دڵی پرسی:

– هەڵبەتە دەبێ ئەمە حسێبی بۆ بکرێ.

– زۆر چاکە، ئەوەمان وا، با ئێستا بێینە سەر شارەکان. دیارە شاری زۆرمان هەن و هەموویان گەورەن، ها؟

تا چاو هەتەر دەکات، بە پانی و درێژی هەزاران قۆناغ، دێهات دەوروبەری گرتوون. تۆ دەڵێی ئەمە چ تاسیرێکی نییە؟



فەرماندەی دەستەکە بە پەشێوی گوتی: سەبرکە! دەڵێی هەزاران قۆناغ؟ دێهات دەوروبەری گرتوون؟ بەڵێ، هەق بە تۆیەو ئەمەش تاسیری هەیە. باشە ئیدی؟ گونجارنکو گوتی: زۆر چاکە، هەموو ئەم قسانە لەیەك خاڵدا کۆدەبنەوەو ئەویش ئەمەیە کە لە ناخی هەر یەکێکمانا بەشێك لە جووتیارێك هەیە. لە کاتێکا بەم چەشنە وەڵامی قسەکانی دوبوف-ی دابووە، ئیشارەتی بە مەبەستی یەکەمجاریان دایەوە.

ماروسکا بە ستایش و ئافەرینەوە هاواری کرد: تەواوی بکە! هەر یەکەم خۆ هەڵقورتانی دوبوف لە باسەکە، بەلای ماروسکاوە خۆش بوو، رووی دەمی کردە دوبوف و گوتی: دۆستی ئازیز چاکی بەزاندیت و ئیدی ناشتوانی وەڵامی بدەیتەوە!.

گونجارنکو بێ ئەوەی دەرفەتی دوبوف بدات کە بێتەوە سەرخۆ، لەسەری رۆیی: هەموو ئەمانە، ئەوەمان پێ دەڵێ کە ئێمەو ئێوەو هەروەها ماروسکا -نابێ لە ئاستی جووتیاراندا غەڕابین و چۆن ئێمە بەبێ جووتیاران دەتوانین... سەری لەقاندو بێدەنگ بوو. دیار بوو کە ئیدی هەموو ئەو قسانەی کە دوای دوبوف گوتبونی نەیدەتوانی باوەڕی گونجارنکو بگۆڕێ.

ماروسکا بە دزییەوە دەیڕوانییە گونجارنکو، هەستی بە ڕێزێکی پتر بەرانبەر بە گونجارنکو دەکرد، لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: ئیبلیسی زانا! چۆن پیرەمێردەکەی تەنگاو کرد، هەر نەیتوانی لە جێی خۆی بجمێ. ماروسکا دەیزانی رەنگە گونجارنکو وەکو هەموو کەسێکی دی هەڵان بکات و هەمیشە هەق بەو نەبێ. بۆ وێنە ماروسکا هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوو کە چ نیشانەو ئاسەوارێکی جووتیاری لە گونجارنکودا هەبێ، کەچی ئەوەتانێ بە خۆی باوەڕی بەمە هەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا لە هەموو کەسێك پتر متمانەی پێ پەیدا کرد. گونجارنکو بەو چەشنەی ماروسکا ناسی بووی "یەکێك بوو لە خۆیان". گونجارنکو پیاوێکی "بە هەست بوو" و هەرگیز خۆی لە قسەی پوچ و بێهودە هەڵنەدەقورتاند. پیاوێکی تەمەڵ و بێ با شار نەبوو، دەستە قاوەییە لیرەکانی هەردەم ئامادە کاربوو، یەکەم کەڕەت پێ دەچوو دەستەکانی خاو بن. بەڵام لە کردارا یەکجار کاراو رەنگین بوون.

پێوەندی ماروسکاو گونجارنکو گەلێك بەتین بوو، بەرادەیەك هاوڕێکانیان دەیانگوت: لە ژێر یەك پاڵتۆدا دەخەون و لە یەك قاپ دا نان دەخۆن.

پێ دەچوو ماروسکا رازی بێ لە هەڵس و کەوتی رۆژانەی لەگەڵ گونجارنکودا، هەروەها وەکو پارتیزانێکی جدی دەیڕوانییە خۆی: ئەسپەکەی چاك تیمار دەکرد. تفاقی زینەکەی رێك و پێك بوو، تفەنگەکەی دەتگوت ئاوێنەیە دەبریقێتەوە. لە شەڕا هەمیشە لە پێشی پێشەوە بوو، جێگای متمانە بوو، بەم چەشنە مایەی خۆشەویستی و رێزی هاوڕێکانی بوو و لە راستیا ئەم کارە بە شێوەیەکی خۆ بە خۆ ماروسکای بەرەو ژیانێکی دروست و هۆشیارانە برد، کە بەڕای خۆی. گونجارنکو دەستی تێدا هەبوو, ژیانێك کە جێی بێکاری و تەمەڵی تێدا نەبوو.

لە پێشەوە هاوارێك کرا: بوەستە! بوەستە! ئەم فەرمانە سەرانسەری لەشکرەکەی گرتەوە. ئەوانەی پێشەوە وەستان ریزەکانی دواوە چوونە پێشەوەو ئەنجام ریزی لەشکرەکە تێك چوو.



ئەوجا فەرمانی دووەم دەم بە دەم گەییە دواوە: متیلیستا بۆ پێشەوە! باش چەند دەقەیەك متلیستا بە چەشنی سەرگەرێك كەوتە فڕین و وەكو با تێپەڕی. سواریی پڕ شكۆی زەلامێك كە قوتابخانەی سوپایی و مەشق و فێربوونی سواری نەدیتبوو، سەرنجی پڕ ئافەرین و ستایشی تێكڕای ئەندامانی هێزەكەی بەلای خۆیا راكێشا، دوبوف گوتی: وا بزانم پێویستە بە خۆم بچمە پێشەوە با بزانم مەسەلەكە چییەو لەچ دایە.

دوبوف پاش كەمێك گەڕایەوە، پەست بوو، دیار بوو هەوڵی دەدا ئەم پەستیەی وەشێرێ.

دوبوف گوتی: متلیستا بە ماموریەت دەچێتە تاقیب كردنی حاڵ و وەزعی دژمن، ئێمە شەوێ لێرە دەمێنینەوە.

هەڵچوون و نیگەرانی لە دەنگیا هەست پێ دەكرا، بەڵام ئەو پیاوێكی خۆراگرو نهێنی پارێز بوو.

ئەو پیاوانەی لەو دەوروبەرە بوون، هاواریان كرد: ئاخر ئەمە چ كارێكە؟ بێ نان و ئاو؟ ئاخر بەمە دەڵێن چی؟ ئەمەش بووە بە ئیسراحەت!

ماروسكا گەییە لایان و گوتی: چ شانسێكە!

ریزی پێشەوە تازە لە ئەسپەكانیان دابەزیبوون. لڤنسون بڕیاریدا شەوێ لە بێشەكەدا وەمێنن., چونكە دڵنیا نەبوو كە جۆگەلەكانی خوا رووی خوانیخدزا لە دەستی دژمنا نەبن. بە هەر حاڵ بە ئومێد بوو بەم حاڵەشەوە رێگایەك بۆ دۆڵی تیودو —واكیو بدۆزێتەوەو وردە وردە بڕۆن.

بە درێژایی رێگا ژانی لە رادە بەدەری قەبرغەی، كە رۆژ بە رۆژ لە زیادی بوو، ئازاری دەدا، لڤنسون دەیزانی ئەم ژانە ئەنجامی ماندوو بوونی لە رادەبەدەرو كەم خوێنییەو بە چەند هەفتەیەك ئیسراحەت و پارێز چاك دەبێتەوە، بەڵام چونكە لای روون بوو كە بەم زووانە دەستی ناگاتە خۆراكی چاك و ئیسراحەتی تەواو، ناچار بە درێژایی رێگا هەوڵی دەدا خۆی لەگەڵ ئەم ژیانە تازەیەدا رابهێنێ و قەناعەتی بە خۆی دەكرد كە بێ تاقەتییەكەی تەنیا بەشێكە لە تێكچوونی میزاج كە هەمیشە ئازاری دەداو رەنگیشە هەرگیز دووری نەخستبێتەوە لە ئەنجامدانی ئەو كارانەی كە بەشێك بوون لە ئەركەكانی سەرشانی.

كوبراك چاوی بڕی بووە پێلاوە نەرمەكانی ئاگای لە قسەكانی لڤنسون نەبوو، وەكو لاسارێك كە جگە لە خەمی سكی خۆی، خەمی چ شتیكی دی نەبێ، بۆ چوارەمین جار دووبارەی كردەوە: من دەڵێم پێویستە بڕۆین.

– زۆر چاكە، ئەگەر ناتوانی بمێنی. فەرموو بڕۆ، بەڵام یەكێك لە شوێنەكەی خۆت دابنێ، ئیدی بۆ خۆت سوار بەو بڕۆ. بەڵام من نیازم نییە هەموو هێزەكە بخەمە خەتەرەوە.

دەنگی لڤنسون ئەوەی نیشان دەدا كە كوبراك زۆر سوور بووە لەسەر رایەكانی خۆی.

لڤنسون گوێی لە قسەكانی تری كوبراك نەگرت، لەسەری رۆیی: برادەر وا چاكە بچی سەرێك لە ئێشكگرەكان بدەیت. كە هەستی كرد كوبراك هەمدیس ئامادەی پێ داگرتنە لە پرچارەی بەیەكا داو بە رەقی پرسی: چییە؟



کوبراک بەدەم چاوتروکاندنەوە سەری هەڵبڕی.
ڤنسون بە هەمان شێوازی ئاساییەوە کە کەمێك شۆخیشی تێدا بوو. لەسەری ڕۆیی: دەوریێەك بنێرە سەر جادەکە، چەند ئێشك گرێك لە پشت هێزەکەوە بە دووری نێو قۆناغێك دابنێ. بۆ وێنە لەو شوێنەدا کە چۆمەکەمان بڕی. حاڵی بوویت؟
کوبراك بۆڵاندی: بەڵێ. لای سەیر بوو کە بۆچی لەبری ئەو شتەی کە دەیویست بیڵێ، ئەمەی گوتبووو، لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: بەراز!؟ هەستی بێزاری و بەزەیی هاتنەوە بەخۆ، لەگەڵ جۆرە ڕێز گرتنێکی ڤنسوندا، لەلای تێکەڵ بوون.
ڤنسون وەکو جاران لە خەو ڕاپەڕی. ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ کوبراکدا کردبووی، هێنایەوە بیری خۆی، جگەرەیەکی داگیرساند، چووە دەرێ تا سەری ئێشك گرەکان بدات.
بە جۆرێ ڕێی خۆی بە نێو کوانووە دوکەڵ کردووەکانا دەکردەوە کە پێ نەنێ بەپاڵتۆی ئەو پارتیزانانەی لە خەوا بوون. دوورترین ئاگری دەستە ڕاست لە هەموو گەشتر بوو. ئێشك گری شەو بە دیارییەوە هەڵتروشکا بوو.
دەستەکانی دابووە ئاگرەکە، دیار بوو مەلی خەیاڵی شوێنانی دووری تەی دەکرد، کڵاوە پێستییە ڕەشەکەی بە پشتا شکابوو، چاوەکانی خومارو خواڵوو بوون، لێوەکانی بزەیەکی سادەو منداڵانەیان گرتبووە خۆ. ڤنسون لەبەر خۆیەوە گوتی: باش سەیری بکە!
دیمەنی بڵێسەی شین باوی دووکەڵاوی، بزەی سەر لێوی ئێشکگرەکە، تاریکی شەو و خەتەری وەزع و حاڵ، هەستێکی ئاڵۆزو تێکەڵ و پێکەڵی لای ڤنسون دروست کردو ئەو وشانەی خستە سەر زاری.
بە وریاییەکی زۆرترەوە چووە پێشەوە، هەڵبەتە نەك لەبەر ئەوەی لە چاوی ئێشکگرەکە دوور بێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی نەیدەویست بزە لە لێوانی ئێشکگرەکە بتارێنێ. ئێشکگرەکە هێشتا لە دەریای بیرەکانی خۆیدا مەلەی دەکرد، بزەکەی بەرانبەر بە سەمای بڵێسەکان بەردەوام بوو، بێگومان ئەم ئاگرەو دەنگی هەڵبزرقانی ئەو گیایانەی لە باوەنی ئەسپەکانەوەو لە ناو جەرگەی بێشەکەوە دەبیسترا، کابرای ئێشکگریان بردبۆوە بۆ شەوانی منداڵی، کە چۆن ئەو شەوانەی لەگەڵ ئەسپانداو لەنێو کێڵگەکاندا بەسەر بردبوو، زۆر شتی بیر هاتەوە، چیمەن زارە شەونم لێنیشتوەکانی بەر تریفەی مانگەشەو. بانگی دوور بە دووری کەڵەبابانی گوند، لەوەڕانی ئارام بەخشی ئەسپان، دەنگی پاوەندو زنجیرەکانیان و سەمای مەشخەڵەکان لەبەر چاوە ئەبڵەق و منداڵانەکانی، ئەو مەشخەڵانەی لەمێژ بوو دامرکابوونەوە، بەڵام لەبیرو هزری ئێشکگرەکەدا لەو ئاگرە گەرمترو گەشتر بوو کە هەنووکە لەبەردەمیا بوو.
ڤنسون هێشتا بە تەاوی لە ئوردوگاکە دەرنەچوو بوو، تاریکییەکی شێدارو بۆنخۆشی بەسەرا هات، پێی چوو بەشتێکی نەرم و سپرینگ ئاسادا، شەو، بۆنی کارگ و داری رزیوی لێدەهات.
ڤنسون لەبەر خۆیەوە گوتی: بەڕاستی بەسامە! و ئاوڕێکی دایەوە. ئێستا چ ئاسەوارێکی گڕە زێڕینەکان نەمابوو، دەتگوت هەموو ئوردوگاکە لەگەڵ بزەی ئێشکگرەکەدا چوو بوو بەناخی



زەویدا. هەناسەیەكی قوڵی هەڵكێشا، بە دڵ رۆشنییەكی پترەوە، كە پێشتر هەستی پێ نەدەكرد، بەسەر جادەكەدا كەوتە رێ.

زۆری پێ نەچوو گوێی بە خوڕەی جۆگایەك زرینگایەوە، هەڵوەستەیەكی كردو گوێی بۆ نەوای دڵگیری بێشەكە رادێرا، پاشان لەبەر خۆیەوە پێكەنی، ئەوجا بە هەنگای سووكترو وریاترەوە كەوتەوە رێ، بە جۆرێ پێی بە عاردی دا بكێش دەكرد كە دەنگی پێی دەبیسترا.

لە ناو جەرگەی تاریكییەكەوە دەنگێكی گڕو لەرزۆك بەرز بۆوە، كێی زەلامم؟ لڤنسون دەنگی متچیكی ناسییەوەو بێ وەی وەڵامی بداتەوە، یەكڕاست بەرەو رووی چوو، سەدای میل هێنانەوەی تفەنگێك لەو تاریكییە كپەوە هەستا. ئەوجا دەنگی سامناكو وشكی گیربوونی فیشەكێك لە لوولەی تفەنگەكەدا هات. لڤنسون بە ئاستەم جوڵەی شێت ئاسای دەستی متچیكی دەبینی كە دەیویست فیشەكەكە بخاتە بەر تفەنگەكە.

لڤنسون بە ساردییەوە گوتی: پێویستە پتر چەوری بكەی. متچیك كە هەستی بە هێوری كرد گوتی: ئاه، تۆیت، نا... زەیتم كردووە... نازانم چییەتی... بە پەشێوییەوە چاوی بڕییە لڤنسون. لە كاتێكا بیری چوو میلی تفەنگەكەی بباتە پێشەوە، چەكەكەی هێنایە خوارەوە.

متچیك حەرەسی سێیەم بوو، نۆرە حەرەسیاتەكەی لەنیوە شەوەوە دەستی پێكردبوو، هێشتا نیو سەعات بەسەر حەرەسیاتەكەیا تێنەپڕیبوو. سەر حەرەس گەڕابۆوە بۆ ئوردوگاو دەنگی هەنگاوەكانی لە نێو پوشەكاندا ون بوو بوو، بەڵام بەلای متچیك-ەوە زۆر لەمە پتر تێپەڕی بوو، چونكە بە تاقی تەنێ كەوتبووە دەریای بیری خۆیەوەو لە نێو ئەم دنیا فراوانو بێگانەیەدا زۆر بە وریاییەوە درێژەی بە ژیانی خۆی دەدا، ئەم دنیایەی كە هەموو شتێك تیایدا بەدزیو ئەسپایی دەجوڵا.

متچیك هەموو ئەو ماوەیەی بە یەك فیكر گوزەراند، فكرێ نەیدەزانی كەیو لە كوێوە لە مێشكیا دروست بوو بوو.

بێ گوێدان بەو بیرانەی دی كە هزریان مژول دەكرد، بەردەوام دەگەڕایەوە سەر بیری یەكەمی. متچیك بە خۆی دەیزانی كە ئەم بیرە بیرێكی نەگریسو پڕ شەرمەزارییەو هەرگیز بۆ كەسی باس ناكات. هەروەها دەیزانی كە هەرگیز دەست بەرداری ئەم بیرە نابێو لە پێناوی ئەنجامدانیا هەموو كارێ دەكات، ئەمە تەنیا شتو دوا شت بوو كە بۆی مابۆوە.

نیازو پلانی متچیك ئەمە بوو: هەر چۆنێ بووەو تا زووە، بە چنگ بە ددان هەوڵ بدات لە هێزەكە فیرار بكات.

گەرچی جاران ژیانی شاری، ناخۆش و بێ گیان دەبینی، بەڵام ئێستا لە كەڵكەڵەی ئەوەدا بوو بگەڕێتەوە بۆ باوەشی ئەو ژیانەو بەلایەوە شادی بەخشو ئاسوودە بوو، و لە راستیا تەنیا ژیانێكی لەبار دەهاتە بەرچاوی.

وەختێ لڤنسون ناسییەوە، متچیك پەشۆكا، هەڵبەتە نەوەك لەبەر ئەوەی تفەنگەكەی رێك و پێك نەبوو، بەڵكو پتر لەبەر ئەوە بوو كەلڤنسون متچیك و بیرەكانی غافڵگیر كردبوو.



ڤنسون بە روو خۆشییەوە گوتی: کە سەربازێکی چاکی! ڤنسون هێشتا بزەی ئێشکگرەکەی لەبەر چاو بوو، دڵی نەدەهات تووڕەبێ: تەنیایی بۆ ئێرە کەمێك سامناکەنا؟

متچیك لە ژێر لێوەوەو بە هەڵچوونەوە وەڵامی دایەوە: نا... سامناکی چی؟ ئیدی لەگەڵ ئەم شتانەدا راهاتووم.

ڤنسون بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: بەڵام من هەرگیز لەگەڵیا رانەهاتوم بە مەرجێ ساڵانی دوورو درێژم، بە شەوو بە رۆژ، بە تەنیا بە پیادەو بە سواری گوزەراندووە، کەچی هێشتا دەترسم، باشە وەزعو حاڵی ئەم ناوە هێمنە؟

متچیك بەترس و سەرسامییەوە لێی راماو گوتی: بەڵێ، هێمنە. ڤنسون بۆی روون کردەوە کە وەزعو حاڵ زۆر لە بارو چاکەو بەم زووانە بە چاوی خۆی دەبینێ کە باشتر دەبێ، پێدەچوو ئەم قسانەی لەبەر خاتری قسەکانی ئەو نەکردبێ، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە ناخی ئەو هەڵسەنگێنێ و بپشکنێ: هەر ئەوەندە بتوانین لە دۆڵی تیودو واکیو بپەڕینەوە ئیدی وەزعمان زۆر باشتر دەبێ. جگەرە دەکێشیت؟ نا؟.

متچیك کە کیسە توتنەکەی ڤاریای دێنایەوە بیری خۆیو دەیزانی لەوانەیە ڤنسون لەوە بێ ئاگا بێ، لەسەری رۆیی: نا، تەنیا جار جارێ –قەت حەزی لێ دەکەی؟ کانی نیکوف، یەکێکە لە پارتیزانە باشەکانمان، ئەو کابرایە نیو سەعات بەبێ جگەرە هەڵ ناکات, دوو دڵم لەوەی بە سەلامەتی گەییبێتەوە شار.

متچیك پرسی: بۆچی بۆ شار؟ دڵی بە توندی کەوتە لێدان.

– خۆم بە نامەیەکەوە ناردم، هەنووکە چوونە ناو شار زۆر خەتەرە، هەواڵەکانمانی بردووە.

متچیك بە شێوەیەکی ئاسایی و لە کاتێکا هەوڵی دەدا وا بنوێنێ کە پرسیارەکەی تەنیا رێکەوتە، پرسی: ناتوانن یەکێکی دی بنێرن، بیرتان لەوە کردۆتەوە کە یەکێکی دی بنێرن.

ڤنسون کە بە وریاییەوە گوێی هەڵخستبوو، پرسی: چۆن؟

– هەروا، تەنیا پرسیار بوو، ئەگەر ئێوە رازی بن– من دەتوانم راسپاردەو نامەکانتان بۆ شار بەرم، زۆر شارەزای شارم.

متچیك ترسی ئەوەی لێنیشتبوو نەبادا زۆر شپرزە بووبێ و ڤنسون پەی بە هەموو شتێکی بردبێ.

ڤنسون کە بەوردی وشەکانی هەڵدەبژارد، لە وەڵاما گوتی: نا پێم وانییە بتوانم، قەوم و قیلەت لە شار هەن؟

– نا، بەڵام لە شار کارم دەکرد، یانی ناسراوم هەیە، بەڵام لەبەر ئەوان نییە... نا، ئێوە دەتوانن متمانەم پێ بکەن، وەختێ لە شار بووم بە زۆری نامە نهێنییەکانم دەگەیاندە جێ.

– لەگەڵ کێدا کارت دەکرد؟

– لەگەڵ ماگزیمالیستەکاندا، بەڵام ئەو ساکە وام دەزانی کەکار کردن لەگەڵ ئەواندا چ عەیبێکی نییە.





- مەبەستت لە عەیبی نییە، چییە؟
- مەبەستم ئەمەیە کە ئەوساکە عەیبی نەبوو پیاو لەگەڵیاندا کار بکات.
- ئەدی ئێستا؟

متچیك بە ترسەوە بێ ئەوەی بزانێ چ وەڵامێك چاوەڕوانێتی گوتی: ئێستا سەرم لێشێواوە، دروست و نادروستم لەلا تێکەڵ بووە.

ڤنسون کە دەتگوت چاوەڕێی ئەم وەڵامە بوو، بە سەدا یەکی درێژ گوتی: کە — وا — تە— بە — م جورە! نا، نا بەهیچ جۆرێ نیازم نییە کەس ڕەوانەی شار بکەم.

متچیك کە ڕوو بەڕووی ئەو بڕیارە کوتوپڕەو تا ڕادەیەك تووڕەیە بۆوە، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: —نا.... دەزانی بۆ ئەمەم خستەڕوو.... هەر بیری خراپ مەکەوە! خەیاڵ نەکەی شتێکم لێت شاردۆتەوە، زۆر لەگەڵت ڕاستم.

ئەمجا لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: پێویستە هەر ئێستا هەموو شتێکی پێ بڵێم، بەڕاستی هەستی دەکرد حەز دەکات گرێی دڵی خۆی بۆ بکاتەوە، هەر چەندە نەیدەزانی ئاخۆ ئەنجامی ئەو کارەی ئاقڵانەیە یان گەوجانە!

بۆیە ئەمەم خستەڕوو چونکە وام دێتە بەرچاو کە پارتیزانێکی لاوازو بێ کەڵکم، ئەگەر من بنێری و بڕۆم باشتر دەبێ، خەیاڵ نەکەی کە دەترسم، یان شتێك لە تۆ دەشارمەوە، تەنیا لەبەر ئەمەیە کە هەست دەکەم ناتوانم هیچ کارێك بە دروستی ئەنجام بدەمو هیچیش تێناگەم، هەر لەبەر ئەمەشە ناتوانم لێرەدا لەگەڵ هیچ کەسێکدا دۆست بم، لەگەڵ هیچ زیروحێکا، چ کەسێك شك نابەم کە داوای یارمەتی لێ بکەم، ئەمەش هەڵەی من نییە، هی منە؟ من بە دڵێکی پاکەوە ڕووبەڕووی هەموویان دەبمەوە، کەچی ئەوەی لەوانەوە بە نسیبم دەبێ هەر هەمووی ڕەقی و گاڵتە پێکردن و فێڵ لێکردنە، باشە منیش شان بەشانی ئەوان نەجەنگیوم؟ بەخەستی برینداد نەبووم؟ بەخۆت دەزانی متمانەم بە هیچیان نییە، خۆ ئەگەر منیش بەهێزتر بام دەمزانی هەموویان گوێ ڕایەڵم دەبوون،ن گوێیان لێ دەگرتم، لێم دەترسان، بۆچی؟ چونکە ئەمە تاقە شتێکە کە ئەوان لێرەدا حەزی پێدەکەن، هەر کەسەو لەخەمی تێرکردنی سکی خۆیدایە، ئەگەر شتەکە لە هاوڕێکانی خۆیشیان بدزن، کەس بە تەنگ کەسەوە نایەت.

هەندێ جار وام دێتە بەرچاو کە ئەگەر سبەینێ بکەونە گیرو گازی هێزەکانی کلچاکیشەوە، لەگەڵ ئەوانیشدا هەر بەو جۆرە دەجەنگن و بە هەمان زوڵم و زۆرەوە ڕەفتار لەگەڵ خەڵکانی ترشدا دەکەن، بەڵام من ناتوانم، ناتوانم وەکو ئەوان بم!....

وای هەست دەکرد لەگەڵ درکاندنی هەر وشەیەکدا درزێکی تازە دەکەوتە پەردەی ئەو تەمەی کە لەبەر چاوەکانیا بوو، وشەکان ئازادانە لەم درزانەوە دەڕژان و درزەکانیان شاش تر دەکرد، متچیك دەیویست بەردەوام قسان بکات، کە قسەی دەکرد هەستی بەئارامییەکی تایبەتی دەکرد، هەنووکە بەلایەوە گرنگ نەبوو ڤنسون چۆن بیر لە قسەکانی دەکاتەوە.

ڤنسون تێفکری: کەواتە تۆ ئەم چەشنە مرۆڤەی! چ خەمیرەیەکی تێکەڵی! لە کاتێکا وشەکانی بەهێوری دەدرکاند و حەزی دەکرد ئەوە کەشف بکات کە چ هۆیەك لە پشت ئەم هەڵچوونە



تورەیەوە هەیە، گوتی: کەمێ سەبرکە! قۆڵی کراسەکەی گرت. متچیك زیرەکانە هەستی کرد کە لڤنسون چاوە رەش و درشتەکانی بڕیوەتە ئەو: برا، تۆ زۆرت قسان کرد،من سەر لە هەموویان دەرناکەم. باشە تۆ لێرەدا بوەستەو با لە گرنگترینیان بدوێین، تۆ دەڵێی لێرەدا هەر کەسەو لە خەمی تێر کردنی سکی خۆیدایە.

متچیك هاواری کرد: چۆن، نا؟ چونکە متچیك باوەڕی وابوو کە گرنگترین بەشی قسەکانی بەهیچ جۆرێ ئەو خاڵە نەبوو کە لڤنسون ئیشارەتی بۆ دەکرد، بەڵکو گرنگترین بەشی قسەکانی پێوەندی بە ژیانی نالەباری ئێرەوە هەبوو، ئەو زوڵمانە بوو کە لەلایەن یەك بەیەکی پارتیزانەکانەوە لێی دەکراو ئەمە حەقیقەتێکە کە بەڕاستی شایانی باسکردنە: من دەمویست بڵێم کە.....

لڤنسون بە هێمنی قسەکەی پێ بڕی: نا، سەبرکە، ئیدی نۆرەی منە، تۆ گوتت لێرەدا هەر کەسەو لە خەمی تێر کردنی سکی خۆیدایە. خۆ ئەگەر بە رێکەوت بکەوینە گیروگازی کلچاکەکانەوە....

– نەخێر من هیچم دەربارەی شەخسی خۆتان نەگوت... من...

– فەرق ناکا. گوتت ئەگەر ئەوان بکەونە گیروگازی کلچاکەکانەوە، لەگەڵ ئەوانیشدا بە هەمان بێ رەحمی و بێ خەمییەوە دەجەنگن؟ ئەم قسەیە تەواو هەڵەیە! لڤنسون هەمان بەڵگە ئاساییەکانی خۆی هێنایە پێشەوە، دەیویست ئەوە روون بکاتەوە کە چۆن ئەم قسانە بە رای ئەو دروست نین.

لڤنسون چەندی قسان دەکرد، پتر بۆی دەردەکەوت کە وەختەکەی خۆی بە فیڕۆ دەدات. ئەو قسانەی کە جار جارێ متچیك دەیدایە بەر قسەکانی، تێی دەگەیاند کە دەبێ لە مەسەلە سەرەتاییەکانەوە قسانی لەگەڵدا بکات. لەو مەسەلە سادانەوە دەست پێ بکات کە وەختی خۆی دەرك کردنیان بۆ ئەویش زەحمەت بوو، بەڵام هەنووکە بوو بوون بە بەشێك لە گۆشت و خوێنی، ئێستا سەردەمی ئەو کارانە بەسەر چوو بوو، و هەر ساتێك کاری خێراترو بنج بڕ تر دەهاتە گۆڕێ.

لڤنسون ئەنجام بەساردییەکی ئەو تۆوە کە لەمیهرو دڵسۆزی خاڵی نەبوو، لە سەری رۆیی: زۆر چاکە، من چ کارێکم لە دەست نایەت، تەنیا خۆت ناڕەحەت دەکەی، ناتوانی بۆ هیچ شوێنێ بڕۆی، ئەمە بیرێکی گەوجانەیە.

– ئەوان دەتکوژن، ئەوەندەو بەس، چاکتر وایە زۆرتر لەم بارەیەوە بیر بکەیتەو. بەتایبەتیش ئەو شتانەی کەمن پێم گوتیت بە قازانجی خۆتە.

متچیك بە خەمبارییەوە وەڵامی دایەوە: ئەمە تاقە شتێکە کە دەتوانم بیری لێ بکەمەوە... ئەو هۆیە تورەیەی کە ئەوی هاندەدا بە ئاشکراو لاساری قسان بکات، زۆر بە ئاسانی لە بەین چوو.

– لە هەموو گرنگتر ئەوەیە کە خەیال نەکەی هاوڕێکانت لەتۆ خراپترن... خراپتر نین...

لڤنسون بە هێمنی کیسە توتنەکەی دەرهێناو کەوتە سیغار پێچانەوە.



متچیك به نائومێدییەوە سەیری كرد. لڤنسون بە جۆرێكی چاوەڕوان نەكراو لەسەری ڕۆیی:
چاكتر وایە میلی تفەنگەكەت بخەیتەوە جێی خۆی.
دیار بوو بە درێژایی گفتوگۆكەیان ئەم مەوزوعەی لەمێشكی خۆیدا هەڵگرتبوو: هەنووكە وەختی ئەوە هاتووە كە ئەم شتانە فێر بوویی –خۆ تۆ لە ماڵی خۆتدا نیت، تێ دەگەی؟ ئەمجا دەنكە شقارتەیەكی داگیرساند. بۆ ساتێك، چاوە نیوە داخراوەكانی بە برژانگی درێژەوە، كونەكانی كەپوی، ردێنە سوورەكەی رووناك بۆوە، بەڕاست وەزعی ماینەكەت چۆنە؟ هێشتا سواری دەبی؟
– بەڵێ. لڤنسون كەمێك داما: زۆر چاكە سبەینێ پێیان دەڵێم با "نیو كات" بدەنێ– دەیناسیت؟ ئەوەی كە پیكا سواری دەبوو، تۆزیوجیخا بدەوە بە مەسئولی تەداروكات... باشە؟
متچیك بە گوێ رایەڵییەوە وەڵامی دایەوە: باشە، لڤنسون لەبەر خۆیەوە بیری كردەوە: بنیادەمێكی چ بێ عەقڵە! ئەوجا بە وریایی و هێمنییەوە كەوتە ڕێ، مژێكی قووڵی لە سیغارەكەیدا، هێندەی لەگەڵ متچیكدا گوتبوو، كاس بوو بوو، لەبەر خۆیەوە گوتی: تێكڕا كابرایەكی بێ توانا، تەمەڵ و نەفس نزمە، چەند مایەی شەرمە پیاوی وا سست و بێ دەسەڵات لە داوێنی نیشتمانا لە دایك بێ و پەروەردە بكرێ: هەنگاوەكانی گورج تر كردەوەو مژێكی قوڵتری لە سیغارەكەی دا: بەڵێ: وەختێ كە ملیۆنان مرۆڤ لە وڵاتەكەماندا لە میانی هەژاری و چەپەڵیدا دەژین و لە سایەی ڕۆژگاری درێژا بە گاو بە هەوجاڕی سەردەمی بەرد زەوی دەكێڵن و باوەڕیان بە خوای نەبوو، و بێ هەست و زاڵم هەیە، پیاوی وا بێ با شارو بێ كارەو بێ كەڵكیان تێدا بێتە ئاراوە!
لڤنسون پەریشان بوو. چونكە ئەوانە قوڵترین و پیرۆزترین بیری ئەو بوون، چونكە چەمكی سەرەكی ژیان لەلای ئەو بریتی بوو لە سەركەوتن بەسەر ئەم هەژاری و ڕۆژ ڕەشییەدا. چونكە ئەگەر بە جۆرێكی بەهێزتر لە گشت بزوێنەرەكان درێژەی بە ژیان نەدابایەو ئومێدی ئەوەی نەبایە كە مرۆڤی بەهێزترو میهرەبانترو شادتر ببینێ، ئەوساكە هەرگیز ئەم لڤنسونە نەدەبوو، بەڵكو كەسێكی دی دەبوو، بەڵام مادامەكی هێشتا ملیونان مرۆڤ لەوانە، ناچارن درێژە بە ژیانێكی وا سەرەتایی و پڕ لە نەگبەتی بدەن، ئینسان چۆن دەتوانێ ئومێدی دیتنی مرۆڤانی نوێ و جوانی هەبێ؟
لڤنسون وەختێ متچیك ی بیر دەكەوتەوە، لەبەر خۆیەوە تێدەفكری: ئایا منیش ڕۆژێ لە ڕۆژان وەكو ئەو بووم؟ هەوڵی دەدا سەردەمی منداڵی و لاوی خۆی بێنێتەوە یاد. بەڵام ئەم كارە زەحمەتێكی زۆری دەویست قۆناغەكانی ئەم دواییەی ژیانی واتە ئەم ساڵە نزیكانەی ئەو ئاخرو ئۆخرانەی كە لڤنسونی دروست كرد بوو –ئەو لڤنسونەی كە ئێستا هەموو كەسێك بە ناوی لڤنسونەوە دەیانناسی، ئەو لڤنسونەی هەمیشە لە پێشەوەی هێزەكەوە بوو، ئەو ساڵانە گەلێك گرنگ و پڕ لە ڕووداو بوون.
تەنیا یەك شتی رابردووی دەهاتەوە یاد، ئەویش كۆنە وێنەیەكی دەورانی منداڵی بوو، وێنەكە منداڵێكی جولەكەی لاوازی چاو گەش و درشتی نیشان دەدا كەچاكەتێكی ڕەشی لەبەردا بوو. لڤنسون لە وێنەكەدا بە تاسەیەكی سەیری نا منداڵانەوە چاوی بڕیبووە خاڵێكی كامیراكە، چاوی



بڕیبووه ئەو شوێنەی کە پێیان گوتبوو باڵندەیەکی بچووك و جوان دەفڕێ... بەڵام چ باڵندەیەکی جوان لە گۆڕێ دا نەبوو بوو، ئێستاش لە یادی ماوە کە چۆن لە نائومێدیا چاوی پڕ بوو بوو لە گریان، بەر لەمەش زۆری لەم چەشنە نا ئومێدیانە بینی بوو. تا ئەنجام قەناعەتی کرد بوو کە ... ژیان "ئەفسانە نییە". وەختێ کە قەناعەتی کرد، بۆی دەرکەوت کە بەشەر چ رەنجێکی زۆری بە ئەفسانەی درۆی باڵندەی بچووك و جوانەوە کێشاوە- ئەو باڵندە جوانانەی کە چاوەڕوان دەکرا لێرە یان لەوێوە دەربکەون، خەڵکانێکی زۆر بە دەم چاوەڕوانی دیتنی ئەو باڵندە جوانانەوە ژیانیان بە فیڕۆ دەدا. بەڵام باڵندەکان هەرگیز پەیدا نەدەبوون نا، ئەو ئیدی پێویستی بەم جۆرە شتانە نەبوو! و سەر سەختانە هەموو شادیو دڵە خورپەیەکی بێ مانای لە مەڕ باڵندەکان نایە لاوە- هەموو ئەو شتانەی کە بابەل باب بۆیان مابۆوە، ئەفسانەی ساختەو درۆی باڵندەی بچووك و جوان رۆژ بە رۆژ پوچەڵ دەبۆوە.

ڤنسون بۆ دەرك کردنی واقیع، بۆ گۆڕینی ئەو وەزعە، بۆ خێرا خوڵقاندنی ئەو شتەی کە پێویستە بێتە دیو دەبێ بمێنێتەوە، بۆ دەرك کردنی ئەم سادەترینو قورسترین شتانە، پەنای بردە بەر عەقڵو هۆش.

ڤنسون هەنووکە بە هەستێکی تیژی لە وەسف نەهاتووەوە، کەلەو چاوەڕوان نەدەکراو کەسیش پەی بەو هەستە نەدەبرد، بیری کردەوە: بەڵام تێکڕا من بنیادەمێکی بە سەبرو بەتەحەموول بووم، زۆر لەو بە سەبرو بە تەحەمولتر بووم. من نەك هەر چاوەڕوانی چ شتێك نەبووم، بەڵکو کارێکی زۆریشم دەکرد: بەلێ ئەمە خۆی لە خۆیدا لە هەموو شتەکان گرنگترە.

ڤنسون بە پەلەو یەکڕاست بە نێو دارستانەکەدا تێپەڕی. لق و پۆپی ساردو شەونم لێنیشتووی درەختان دەموچاویان فێنك دەکردەوە، هەستی دەکرد شەپۆلێکی یەکجار توند لە زەوییەوە هەڵی گرتووەو بردویەتێ سەرێ. لەم بەرزاییە هەست پێکراوەوە بەسەر هەموو بێ توانایی و لاوازیەکانیا زاڵ بوو.

وەختێ گەیشتەوە ئۆردوگا، ئاگرەکان دامرکابوونەوە. بزەی سەر لێوی ئێشکگرەکە ئاوا بوو بوو - گوێی لێ بوو ئێشك گرەکە بەدەم تیمار کردنی ئەسپەوە لە ژێر لێوەوە جنێوی دەدا. ڤنسون بەرەو ئاگرەکەی خۆیان، کە هێشتا دوکەڵی لێ هەڵدەستا- چوو، پاڵتۆکەی لە پاڵ ئاگرەکەدا راخست. باکلانوف لە شیرین خەوا بوو. ڤنسون هەندێ چڵو چیوۆی وشکی خستە کووانوەکەوەو کەوتە فوو لێ کردنی، هێندە فووی لێکرد سەری کەوتە سوڕان. باکلانوف بەدەم خەوەوە هەستی بە گەرمایی ئاگرەکە کرد، لێوەکانی جولاندو ملچە ملچێکی کرد، دەموچاوی دانەپۆشرابوو، لێوی بە جۆرێکی منداڵانە شۆڕ بوو بۆوەوە، کڵاوەکەی بەسەر لا جانگیا پەسترابۆوەو رەق بوو بوو، پتر لە تولە سەگێکی رەسەنو خرپن دەچوو: ڤنسون لە کاتێکدا بەخۆشەویستییەوە پێی پێدەکەنی، لەبەر خۆیەوە گوتی: تۆش وابە! پاش ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ متچیکدا کرد بووی، تەماشا کردنی باکلانوڤ زۆر بەلاوە خۆش بوو.



لڤنسون بەدەم بۆڵە بۆڵەوە لە تەنیشت باکلانوفەوە راکشا، هێشتا چاوی لێك نەنا بوو، هەستی کرد سەری کەوتە سوڕان، بە دەوری خۆیدا وەرچەرخاو بێ ئاگا لە لەشی، لە ئاسمانی بێ کۆتاییدا کەوتە فڕین، تا لەنکاودا لە موغارەیەکی تاریكو بێ بندا گیرسایەوەو دابەزی.







**متلیستاو تاقیب کردنی دژمن**

وەختێ لڤنسون، متلیستای نارد بۆ تاقیب کردنی دژمن، دەستووری دایێ کە دەبێ هەمان شەو بگەڕێتەوە، بەڵام ئەو گوندەی متلیستا بۆی دەچوو، زۆر لەوە دوورتر بوو کە لڤنسون تەسەوری کرد بوو.

متلیستا سەعات چواری پاش نیوەڕۆ هێزەکەی بەجێهێشت و بەشی هەرە زۆری ڕێگای بە چارنارە بڕی، چەشنی باڵندەیەکی شکاری بەدەنی بە سەر ملی ئەسپەکەوە دانەواند بوو، کونە کەپوی بەشێوەیەکی شادی وروژێن کرابۆوەوە، دەتگوت ئەو چارنارە شێتانەیە، پاش ئەو پێنج ڕۆژە ڕێیە مەستی کردبوو، دەمەو ئێوارە گەیی، هێشتا پوش و پەلاشی نێو دارستانەکەی باوەشی پایز لەبەر تیشکی زەردەپەڕی ساردو خەم وروژێنا، بە پەلە بە تەکیا ڕەت دەبوون، کە لە دارستانەکە دەرچوو دنیا تاریک بوو بوو، ئەسپەکەی لە پاڵ کەوێڵێکی پەرپوت و وێران دا کەسەرەکە داتەپی بوو، ڕاگرت، دیاربوو، لەمێژ بوو کەس ڕێی تێنەکەوتبوو.

ئەسپەکەی لە سووچێکەوە بەستەوە، دەستی بە دیرەگێکی شکاوەو گرت و خۆی گەیاندە گۆشەیەکی سەربانەکە، خەریک بوو بکەوێتە چاڵێکەوە کە بۆنی بۆگەنی دارو پوشی ڕزاوی لێدەهات. بە ماتە مات و ورییاییەوە بە پێوە وێستاو بە وردی ڕوانییە ناو جەرگەی تاریکە شەوەکەو گوێی بۆ دەنگەکانی شەو هەڵخست.

نزیکەی دە دەققەیەکی بەم چەشنە قەتاند، سێبەرەکەی لەگەڵ تاریکی دارستانەکەدا تێکەڵ بوو. پتر لە هەموو وەختێ بە باڵندەیەکی شکاری دەچوو، دۆڵێکی سامناکی پڕ درەخت و قۆپەنە پوش لەبەر دەمیاو لە میان دوو زنجیرە کێوی بورکانیدا، کە تۆپەڵە ڕەشاییەکی گەورەی بەرانبەر بە ئاسمانی ڕۆشنی پڕ ئەستێرە پێك دەهێنا دەهاتەوە یەك.

متلیستا لە سووچێکی سەربانەکەوە خۆی هەڵدایە سەر ئەسپەکەی و ڕووی کردە ڕێگایەك کە لەبەر پوش و پەلاش بە زەحمەت دەبینرا، قەدی هەڵکشاوی درەختانی غان لەو تاریکە شەوەدا چەشنی مۆمی کوژاوە سپی دەچۆوە.

ئەسپەکەی بەسەر تەپۆلکەیەکی بچوکا ئاژۆت. بە دەستە چەپدا زنجیرە کێوێکی بورکانی ڕەش درێژ دەبۆوە چەشنی پشتی دێوێکی زەلامی نووستوو دەهاتە بەرچاو. دەنگی شڵپ و هوڕو هاڕەو هاژەی چەمێك دەهاتە گوێ. ئاگرێك لە دووری نزیکەی دوو قۆناغە ڕێگاوە, ڕەنگە لە کەناری چۆمەکەوە بووبێ، بەرزو نزم دەبۆوە. ئاگرەکە ژیانی تەنیایی شەوانی بیر خستەوە. کەمێ لەو لاترەوە،لە ئاستی جادەکەوە، ڕوناکی زەردو کزو سەقامگیری چراکانی گوندەکە دیار بوو.

بە دەستە ڕاستا بەرزی زنجیرە کێوەکان کەم دەبۆوەو لە نێو تاریکییە شین باوەکەداون دەبوو، لە هەمان شوێنا چالاکییەك دەبینرا، ڕەنگە ئاسەواری چۆمێکی تەرك کراو بووبێ، دارستانێکی چڕو تاریك دەوری دابوو.



متلیستا بیری کردەوە، ڕەنگە گۆماو بێ. هەستی بە سەرما کرد. چاکەتێکی سوپایی یەخەوازی لەسەر بلوزە سوپاییەکەیەوە، لەبەر کردبوو... بڕیاریدا بەر لە هەموو کارێك بەرەو ئاگرەکە بچێ، دەمانچەکەی لە کیفەکەی دەرهێناو لە ژێر چاکەتەکەیەوە خستیە بەر پشتێنەکەی، کیفە بەتاڵەکەی خستە ناو خورجی پاشکۆی ئەسپەکەیەوە، تفەنگی پێ نەبوو، کوت و مت لە جووتیارێك دەچوو کە لە مەزرا بگەڕێتەوە: پاش جەنگ لەگەڵ ئەڵەمانەکاندا زۆربەی جووتیارەکان، چاکەتی سوپاییان لەبەر دابوو.

تەواو نزیکی ئاگرەکە بوو بۆوە کە لە پڕ حیلەی ئەسپێك تاریکی شەوەکەی ڕەواندەوە. ئەسپەکەی متلیستا تەکانیدا بۆ پێشەوە، هەیکەلی بەهێزی لەرزی و بە هەڵچوونەوە لە وەڵامی ئەو حیلەیەدا، حیلاندی. لەم ساتەدا تارماییەك بە پەلە لە بەرانبەر ئاگرەکەوە دەرکەوت. متلیستا قامچییەکەی بە ئەسپەکەی خۆیدا کێشا، ئەسپەکە کشایە دواوە.

مێرد منداڵێکی لاوازی قژڕەش بە چاوی ئەبڵەق و ترساوەوە تەماشای دەکرد، قامچییەکی بە دەستەوە بوو.

دەستەکەی تری هەڵکرد بوو، دەتگوت خۆی بۆ بەرگری ئامادە کردبوو، پێڵاوێکی کەتان و پانتۆڵێکی شڕی لەپێ بوو، چاکەتێکی شۆڕی لە خۆیەوە پێچا بوو. بە پەتێك ناو قەدی توند بەست بوو. متلیستا ئەسپەکەی بە جۆرێ تاودا، خەریك بوو مێرد منداڵەکە بکاتە ژێرەوە. منداڵەکە تاس بردییەوە. چاوانی ترساوی مێرد منداڵەکە، پانتۆڵە شڕەکەی کە زرانییە ڕووتەکانی لێوە دیار بوون، چاکەتەکەی کە بە جۆرێکی بەزەیی وروژێن گەردنە لاوازو منداڵانەکەی لێوە دیار بوو، ڕەنگە ئاغاکەی پێی دابووبێ، سەرنجی متلیستا یان ڕاکێشا.

متلیستا بە پەرێشانی و بە دەنگێکی ناپەسەند کە تەنیا بۆ ئەسپەکەی بەکاری دەهێنا گوتی: چ دەکەی لێرە؟ ترسایت؟ ئاه، بەچکە شەتیان، شێتۆکە! ئێژی ئەجەلت هاتووە وا لێرە وێستاوی! ئەگەر بمکردبایتا ژێرەوە چت دەکرد، ها؟ دووبارەی کردەوە: چ کەرێکی! کە منداڵەکەی بەو وەزعە قەلەندەرانەیەوە بینی سارد بۆوە. لە پڕ هەستێکی بە زەیی ئامێزو منداڵانە لە ناخیا وروژا.

منداڵەکە کە وردە وردە ترسەکەی دەڕەوییەوە، دەستی ڕاستی هێنایە خوارەوەو گوتی: بۆ وەکو هەڵۆ لە پڕ هەڵت کوتایە سەرم؟ هەوڵی دەدا وەکو پیاوێکی کارامە بە هێمنی و ماقووڵی قسان بکات و هێشتا هەر دەلەرزی، لەسەر قسەکەی ڕۆیی:

– هەر کەسێك بێ دەترسیت. من لێرە لەلای ئەسپم.

متلیستا بە پێکەنینەوە پرسی: ئەسپ! بەڕاستتە؟

چنگی خستە سەر ڕانی خۆی. خۆی بە پشتا شکاندو بەچاوی نیوە داخراو لە مێرد منداڵەکەورد بۆوە، برۆ باریك و ناسکەکانی هاتنەوە یەك، لە پڕ لەقاقای پێکەنینیدا. پێکەنینێکی ئەوەندە بەرزو بێ باکانە کە بە خۆیشی لە دەنگەکەی سەرسام بوو.

منداڵەکە شەرمی دەکرد. هەناسە برکێی پێ کەوتبوو، هێشتا بە گومان بوو. کە وردە وردە زانی چ ترسێك لە گۆڕێدا نییەو هەموو شتێك بەرەو گاڵتەو شۆخی دەچوو، بە جۆرێ چارەی بەیەکدا دا کە کەپووی بە ئاشکرا دەرکەوت. لە پڕ ئەویش دەستی بە پێکەنینێکی منداڵانەو



شەیتانانە کرد. ئەم پێکەنینە چاوەڕوان نەکراوە گوژمێکی زیاتری بە قاقاکەی متلیستادا ئیدی هەر یەکەیان کە سەیری ئەوی تری دەکرد، لە قاقای پێکەنینی دەدا. چەند لەحزەیەك بە خۆشی تێپەڕی.

پێکەنین، متلیستای لەسەر زینەکە رادەژنی. منداڵەکەش لەسەر گازی پشت کەوتبوو. بەدەم کوڵی پێکەنینەوە لاقەکانی لە حەوادا سەمایان دەکرد. متلیستا ئەنجام گوتی: باشە کوڕیژگە، بە راستی هێنامتە پێکەنین! لاقێکی لە ئاوزەنگییەکە دەرهێنا! بەڕاستی کوڕێکی قۆشمەیت، زۆر قۆشمەیت! خۆی لەسەر ئەسپەکەی هەڵدایە خوارەوەو دەستەکانی بەرەو ئاگرەکە درێژ کرد.

کوڕەکە لە پێکەنین کەوت. بەسەرسامی و شادییەوە روانییە متلیستا، دەتگوت ئەمجارەیان چاوەڕوانی شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، گوتی: تۆ مەلعونێکی بە دەماخی! وشەکانی بە جۆرێ دەدرکاند وەك بڵێی دوا رای خۆی دەربڕێ.

متلیستا پێکەنی: من؟ بەڵێ برادەر من زۆر بە دەماخم.

منداڵەکە گوتی: زۆر ترسام، بە دەم ئەسپ لەوەڕاندنەوە، خەریك بوو چەند پەتاتەیەکم دەبرژاند.

متلیستا لە تەنیشتیەوە دانیشت, جڵەوی ئەسپەکەی بە دەستەوە بوو: پەتاتە؟ کەشتێکی چاکە: پەتاتەت لە کوێ بوو؟

– لە کوێ؟ چۆن، یەك کۆمەڵ پەتاتە لە وێیە! بۆ نیشاندانی قەوارەی, کۆمەڵە پەتاتەکە، دەستەکانی بە دەوری شانەکانی متلیستادا بڵاوکردەوە.

– یانی دزیوتە؟

منداڵەکە گوتی: ئەدی چی! بێنە ئەسپەکەت بۆ بگرم. جوانووە؟ مەترسە لە دەستم بەرنابێ، ئەسپێکی چاکە، بە چاوی شارەزاییەوە سەیرێکی هەیکەلی خورتی ئەسپەکەی کرد: لەکوێوە دێی؟

متلیستا قسەکەی سەلماند: ئەسپێکی خراپ نییە، تۆ خەڵکی کوێی؟

منداڵەکە بەسەر ئیشارەتی بۆ چراکانی نێو گوندێك کردو گوتی: خەڵکی ئەوێم، خوانیخدزا، ئەوە گوندی ئێمەیە. رێك (120) خێزانی تێدایە، بێ کەم و زیاد.

دیار بوو ئەم قسەیەی وەکو چۆن لە یەکێکی دی بیستبوو, دووبارە دەکردەوە، تفێکی کردە عاردی.

– دەزانم منیش خەڵکی ڤارو پیفکام، لەوبەری ئەم کێوەیە، ناویت ژنەوتووە؟

– ڤارو بیفکا؟ نا، دیارە زۆر دوورە، نا؟

– بەڵێ زۆر دوورە.

– ئەدی بۆچی هاتوویت بۆ ئێرە؟

متلیستا بە پێکەنینێکی دەستکردەوە گوتی: بەڵێ، حەقایەتی من زۆر دوورو درێژە برادەر، تێگدەی. وتم بەڵکو چەند ئەسپێك بکڕم، دەیانگوت گوایە ئێوە ئەسپی زۆرتان هەیە، من زۆرم



حەز لە ئەسپە برادەر. هەموو تەمەنم لە ئەسپ بەخێو کردنا بەسەر بردووە، بەلاّم هەموو ئەسپەکان هی خەڵکی بوون.

– وا نەزانی ئەمانە هی منن؟ ئەمانەش هی ئاغان.

منداڵەکە دەستە لاوازو بچووك و قرێژاوییەکەی لە قوڵی کراسەکەیەوە دەرهێنا، بە دەسکی قامچییەکەی، شارەزایانە ژیلەمۆکەی تێکدا، پەتاتە رەشەکان لە نێو ژیلەمۆکەوە دەرکەوتن.

منداڵەکە پرسی: دیارە برسیشتە، ها؟ نانم هەیە، بەلاّم زۆر نییە.

متلیستا بە درۆ گوتی: مەمنونم، ئێستا نانم خوارد. دەستی تا ئاستی گەرووی هەڵبڕی، هەر خۆی دەیزانی چەندی برسی بوو. منداڵەکە پەتاتەیەکی لەت کرد، هەندێ فوی لێکردو هەر بە توێکڵەکەوە لەتێکی خستە دەمییەوە، هەندێك لەسەر زمانی گلاندی و بە تاسووقەوە کەوتە جوینی. لەگەڵ قوتدانی پەتاتەکەدا سەیرێکی متلیستای کرد، بە هەمان بێ پەروایییەوە کە پێی گوتبوو تۆ مەلعونێکی بە دەماخی، گوتی: من هەتیووم، شەش مانگێ دەبێ کە هەتیوو کەوتووم، قۆزاقەکان بابیان کوشتم، دایکیشیان فەساد کردمو ئەوجا کوشتیان، پاشانیش براکەمیان کوشت.

متلیستا لەپڕو بەترسەوە پرسی: قوزاقەکان؟

– بەڵێ، لە هیچە هەموویان کوشتن، خانووەکەمانیان وێران کرد –نەك هەر خانووەکەی ئێمە، بەڵکو زیاد لە (20) خانووی تریان ویران کرد، هەموو مانگێکیش دێنە ئێرە، چل کەسیان لێرە هەڵیان داوە، فەوجێکیان ئەم هاوینە لە گوندی "راکیت نویە" بوون دێیەکی گەورەیە، لەپەنای گوندەکەی ئێمەوەیە. ئای چ بەلاّیەکیان بەسەر خەڵکی دا هێنا! دە تۆزێ پەتاتە بخۆ.

– ئەدی بۆ فیرارتان نەکرد، تەماشا چ دارستانێکی گەورەتان هەیە. متلیستا بە دەم قسەکەیەوە تۆزێ خۆی بەرز کردەوە تا سەیری دارستانەکە بکات.

– جا فایدەی چیە؟ خۆ مرۆڤ ناتوانێ هەموو تەمەنی خۆی لەوێدا بقەتێنێ، ئەمەجگە لەوەی لەوانەیە بکەونە گۆماوەکانەوە، زۆر قوڵ و گەورەن. متلیستا لە دڵی خۆیدا گوتی: رێك بەو جۆرەیە کە من بیرم لێ دەکردەوە. بەدەم هەستانەوە گوتی: دەزانی چی؟ تۆ لێرە تۆزێ ئاگات لە ئەسپەکەم بێ تا من بە پێیان سەرێ لە گوندەکە بدەمو شتێ بکرم.

کوڕە ئەسپەوانەکە هەستایە سەرپێ و بە نائومێدییەوە گوتی: بۆ ئەوەندە پەلە دەکەی؟ تۆزێ سەبرکە!

ئێرە بۆ بنیادەمی تەنیا زۆر خراپە. بە خەمبارییەوە قسەکەی کردو بە پاڕانەوەوە چاوە درشتەکانی بڕییە متلیستا.

متلیستا بە خەمبارییەوە لەسەری رۆیی: چار نییە برادەر! ئێستا باشترین وەختە تا چاوێ بگێڕمو سەرێ بدەم، چونکە تاریکە، زوو دەگەڕێمەوە ئەوسا ئەسپەکەم بە دەستمەوە... تۆ لات وایە سەرۆکەکانیان لە کوێن؟



منداڵەکە بۆی روونکردنەوە کەچۆن ئەو خانووە بدۆزێتەوە کە فەرماندەی سوارەکانی تێدایە، لێی دووپات کردەوە کە ئەگەر بە نێو باخەکەی پشتەوەدا رەت بێ باشترە.

– سەگی زۆری لێیە؟

– زۆرە، بەڵام درِنین.

متلیستا ئەسپەکەی بەستەوە، خوا حافیزی کردو شان بەشانی ئاوەرِۆی چۆمەکە کەوتە رێ، تا لە تاریکییەکەشا ون بوو، مێرد منداڵەکە هەر لە دواوە بەخەمبارییەوە سەیری دەکرد.

پاش نیو سەعاتێك متلیستا خۆی لە نزیکی گوندەکەدا بینییەوە، جادەیەك بە دەستە راستا پێچی دەکردەوە، بەڵام لەسەر قسەی منداڵەکە، راستەوخۆ بە نێو کێڵگەیەکی تازە درەوکراوا رەت بوو، گەییە پەرژینێ کە دەوری باخی جووتیارەکانی دابوو، ملی رێگای گرت. گوندەکە لەباوەشی خەوێکی خۆش و ئارام دابوو. لە هیچ شوێنێکەوە روناکی بەدی نەدەکرا. لە نێو باخەکەوە بە زەحمەت سەربانی کوختەکان لەبەر تریفەی مانگە شەوا دەبینرا، باخەکان بۆنی رتوبەت و خاکی تازە بێڵ تەپکراوی لێدەهات.

متلیستا دوو کوڵانی برِی و خۆی بە سێیەم داکرد. سەگەل بە دەنگی نووساوو ناسازەوە پێشوازیان کرد، دەتگوت ئەوانش دەترسن لە کوڵانەکەدا کەسی تووش نەبوو، سەیری دەکرد گوندەکە خووی بە هەموو شتێکەوە گرتووە. تەنانەت بەو بێگانە نەناسراوانەشەوە کە لە کوڵانەکانا دەسورِێنەوەو چیبیان بوێ دەیکەن متلیستا تەنانەت تووشی جووتە دڵدارێکیش نەبوو کە خەریکی رازو نیاز بن–دیمەنێ کە لەم وەرزەی ساڵدا، یانی وەرزی زەماوەندو گۆڤەند، پێشبینی دەکرا، لەم وەرزی پایزەداو لە پەنای پەرژینە قامیشە چرِەکانی دەوری باخەکانەوە چپەیەکی عاشقانە نەدەبیسترا.

بە پێی ئامۆژگارییەکانی کورِەکە درێژەی بە رێگای خۆیداو بە چەند کوڵانێکی دیدا رەت بوو، بە پەنای کڵێسای گوندەکەدا رەت بوو، تا گەیشتە پەرژینی رەنگاو رەنگی باخی کەشیش. فەرماندەی سوارەکان لەماڵی ئەم کەشیشەدا نیشتەجێ بوو.

متلیستا چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێراو بە وردی گوێی هەڵخست، هەستی بە چ شتێکی گومان لێکراو نەکرد، پاشان بەبێ خشپە بەسەر پەرژینەکەدا رەت بوو.

هەر چەند وەرزی خەزان بوو، بەڵام باخی میوەکە پرِ بوو لە درەخت و دەوەنی چرِ، متلیستا هەوڵی دەدا لێدانی توندی دڵی خاوبکاتەوە، نەیدەهێشت بە تەواوی هەناسەی دەربچێت، زیاتر چووە قوڵایی باخەکەوە. دەوەنەکان لە شوێنێکا کۆتاییان دەهات کە دوو شەقام یەکیان دەبرِی، بە دەستە چەپاو لە دووری چل هەنگاوێکەوە چاوی بە پەنجەرەیەکی رۆشن کەوت، پەنجەرەکە کرابۆوە، هەندێ پیاوی بینی لە ژوورەوە دانیشتبوون. تیشکی پرشنگدار بەسەر گەڵا زەردە رژاوەکانی سەر عاردەکەوە دەبریسکایەوە.

قەدو لق و پۆپی رووتی دار سێوان لە تیشکێکی زێریندا هەڵکشابوو.

متلیستا بە توورِەییەوە گۆنایەکی گرژ کردو بە خۆی گوت: ئێرەیە! ترسێکی زۆرو هەستی بێ پەرواییەکی دلێرانە، کە هەمیشە بۆ ئەنجامدانی کارە گەورەکان هانی دەدا، سەراپای بوون و



لەشی گەرم راهێنا. هەر چەند هێشتا دوو دڵ بوو لەوەی کە گوێگرتن لە قسەی پیاوەکانی ناو هۆدەکە سوودێکی هەبێ یان نا، بەلآم ئیدی دڵینا بوو کە لەوێ ناجمێ تا مەبەستەکەی جێبەجێ نەکات، پاش تۆزێك لە پشت دار سێوێکی نزیك پەنجەرەکە وێستاو گوێی بۆ ئەو قسانە هەڵخست کە لە هۆدەکەدا دەکران، هەوڵی دەدا هەموو قسەکان لە مێشکی خۆیدا بچەسپێنێ.

لە هۆدەکەدا، چوار کەس لە دەوری مێزێکی پان دانیشتبوون یاری وەرەقیان دەکرد. کە شیشێکی پیری ئەندام وردیلە لەلای راستەوە دانیشتبوو، قژی ساف و تەنك و رۆنکراو بوو، چاوەکانی زالو ئاسا بوون، بە شارەزاییەوە دەستی بەسەر مێزەکەدا دەگێرا، بەبێ خشپە وەرەقەکانی بە پەنجە ناسکەکانی تێکەڵ دەکرد. دەتگوت چاوەکانی وەرەقەکانی بە دەم دابەش کردنەوە دەخوێندەوە. ئەو پیاوەی لە تەنیشتی ئەوەوە پشت لە متلیستا دانیشتبوو، کە هەر وەرەقەیەکی لێوەردەگرت، بە تووڕەییەوە سەیرێکی دەکردو بەپەلە لە ژێر مێزەکەدا دەیشاردەوە. ئەفسەرێکی کەتەی بەخۆوە روو لە متلیستا دانیشتبوو،بە رواڵەت کابرایەکی هێمن و خۆش مەشرەب بوو، ماندوو دیار بوو، پایپێکی خستبووە لا لێویەوە. رەنگە هەر لەبەر ئەو رواڵەتەی بووبێ کە متلیستا بە فەرماندەی سوارەکانی دەزانی. بە هەر حاڵ متلیستا بە درێژایی یارییەکە بێ ئەوەی بە خۆ بزانێ، سەرنجی لەسەر یاری کەری چوارەم گیرسابۆوە — پیاوێکی گۆنا هەڵپەنماو، رەنگ پەڕیوو، برژانگ بێ جووڵە، کلاوێکی قوزاقی رەشی لەسەر بوو، جبەیەکی خوری لەبەر بوو، دوای هەر دەسە یارییەك جبەکەی بە توندی لە خۆیەوە دەپێچا.

بە پێچەوانەی پێشبینی متلیستاوە، ئەوان باسی شتی بەردەست و تایبەت بە خۆیان دەکرد. زۆربەی قسەو باسەکانیان دەربارەی وازییەکە بوو.

ئەو پیاوەی کە پشتی لە متلیستا بوو، گوتی: تا هەشتا هاتووم کابرای کلاو رەش وەلآمی دایەوەو گوتی: زۆر دەترسی، جەنابی ئاغا زۆر دەترسیت، بەبێ موبالاتییەوە لەسەری رۆیی، لە نەدیتە تا سەد هاتووم.

کابرای کەتە چاوەکانی چکۆڵە کردەوە، پایپەکەی لە نێو دەسیا جێ گۆڕکێ پێ کردو سەیری وەرەقەکەی کردو بە بلۆف "تا سەدو پەنجا هات".

پیاوی یەکەم کە بەرانبەر بەکەشیشەکە دانیشتبوو، و لەسەر بانق بوو، گوتی: من نایەم.

ئەفسەرە کلاو رەشەکە بە تەوسەوە گوتی: دەمزانی تۆ دەچیتە دەرێ، پیاوی یەکەم کە خۆی بەبێ قسور دەنواند، بۆ ئەوەی وای دەربخات کە هاوخەمی کەشیشەکەیە رووی تێکردو گوتی: کە وەرەقە نەیەت، خەتامە؟ کەشیشەکە بەدەم شۆخییەوە رووی گرژ کردو زۆر بەبێ تامی پێکەنی، پێکەنینێ، دەتگوت نە شارەزایی و غەشیمی خۆی دەسەڵمێنێ، بە خۆ نواندنەوە پەنجەکانی جولآندو گوتی: فێڵباز گیر مەبە، هێشتا دوو سەد خاڵ لە دواوەی.

دەستی فێڵبازانت لە پشت را بەستووە.

متلیستا بە خۆی گوت: چ قیرسیچمەیەکە!



کەشیشەکە لە پیاوە کەتەکەی پرسی: ئاە، تۆش دەرچووی؟ رووی کردە پیاوە کڵاو رەشەکە گوتی: ئاغا بێ زەحمەت لەسەر بانق بە. بێ ئەوەی وەرەقەکان بخاتەڕوو، بانقەکەی بۆ لای ئەو خزاند، دوای یەك دوو لەحزەیەك و لە کاتێکا بە دەنگەوە وەرەقەکانیان دەکوتایە سەر مێزەکە، درێژەیان بە گەمەکەی خۆدا تا لە ئەنجاما کابرای کڵاو رەش دۆڕا.

متلیستا دوو دڵ بوو لەوەی کە بڕوات یا کەمێکی دی لەوێ وەمێنێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: سزای بابایەکی بەرەڵلا هەر ئەمەیە! لە جێی خۆی چەقی —لەم ساتەدا کابرای دۆڕاو هاتە بەر پەنجەرەکە. متلیستا بۆی دەرکەوت کە کابرا،چاوەتیژەکانی رێك بڕیونەتە ئەو.

لەم کاتەدا ئەو پیاوەی کە پشتی لە متلیستا بوو خەریکی تێکەڵ کردنی وەرەقەکان بوو، جوڵەی دەستی چەشنی پیرەژنێ کە خاچ دروست بکات، وریاو شارەزا بوو. ئەفسەرە کەتە رێکەکە بە بێ تاقەتی و بەدەم باوێشك دانەوە گوتی: نیچی تائیلو هێشتا لە سەفەرە، وا بزانم ئەو ژنۆکەیەی خستۆتە داوەوە، زۆرم حەز دەکرد لەگەڵیا بچوومایە.

کابرای کڵاو رەش لەبەر پەنجەرەکە گەڕایەوەو پرسی: بەدوو قۆڵی؟ بەرگەیان ناگرێ. ئەوجا بە شێوەیەکی سەیر پێکەن.

کەشیشەکە پرسی:ڤاسنکا دەڵێن؟ ئا، بەڵێ بەرگە ناگرێ، ئێمە لێرە پیرێژنێکی قەڵەومان هەیە بۆ نا... ئا... بەڵێ، لەمەو بەریش باسم بۆ کردوون. سرگی ئیڤانوفیچ هەرگیز کەس لەگەڵ خۆی نابات هەرگیز.

دەزانی دوێنێ بە تایبەتی چی و چی پێم گوت؟ دەیگوت: دەچم ئەو لەگەڵ خۆما دەبەم،بەلامەوە گرنگ نییە کەبشی خوازم. ئەو گوتی: "ئاە..." کەشیشەکە لە پڕ دەنگی بەرز کردەوە. نێو لەپی دا بە دەمیاو چاوەکانی بە شێوەیەکی شەیتانانە بریسکانەوە.

چ یادو بیرەوەرییەکم لایە! هەنووکەش دڵم نەدەهات ئەو بیرەوەریانە بخەمە روو. بەڵێ چاوەڕوانم مەبە بیڵێم. کەشیشەکە وای دەنواند دەترسێت ئەو شتانە بدرکێنێ. دەستەسڕەکەی لە بەردەم روویا تەکان دەدا گەرچی هەموو ئەوانیش وەکو متلیستا هەستیان بە لەگامی هەموو وشەیەکی دەکرد، کەچی هەر هەموویان پێکەنین و چ وەلامێکیان نەدایەوە.

متلیستا کەوتە خۆو کوت و پڕ لەبەر پەنجەرەکە دوور کەوتەوە، هەر کە گەییە ئەو شوێنەی دوو شەقامەکە یەکیان دەبڕی تەقی بەڕووی پیاوێکا کە پاڵتۆیەکی قوزاقی دابوو بەسەر لایەکی شانیاو دوو کەسی بە دواوە بوو.

پیاوەکە بە سەرسامی پرسی: چ دەکەی لێرە؟ خۆ بەخۆ دەستی بۆ پاڵتۆکەی برد کە لە کەوتنا بوو.

متلیستا خۆی دایە پەنایەك و غاری دایە ناو دەوەنەکانەوە...

دەنگی تێخوڕین بەرز بۆوە: بوەستە؟ ئاگات لێی بێ! بیگرە ئەهای قوزاقان! هێی!...

فیشەکێك لە ئاسماندا تەقیەوە.

متلیستا کڵاوەکەی لێ کەوتبوو، بە سەری کۆتەوەو بێ ئامانج و سەرگەردان بە نێو دەوەنەکاندا غاری دەدا.





دەنگ دان و تێخوڕین لەگۆشەو کەنارەکانەوە هەڕەشەی لێ دەکرد، حەپەی شێت ئاسای سەگەل لە جادەکەوە دەهات.

یەکێك لە قوزاقەکان کە بەرەو متلیستا تەکانی دەدایە خۆی، بانگی کرد: ئەمەتا! بیگرە! گوللەیەك بە بناگوێی متلیستادا گڤەی کرد، متلیستاش بە گوللەیەك وەلامی دایەوە، ئەو پیاوەی بە دوویەوە بوو تلی داو کەوتە سەر زەوی.

متلیستا بەباوەڕی بە تینەوە هاواری کرد: ناتوانن من بگرن! بەڕاستیش تا دوا لەحزە هەر لەو باوەڕەدا بوو کە ناتوانن بیگرن. کابرایەکی کەتەی زەلام لە دواوە خۆی دا بە سەریاو خستییە سەر عاردەکە. متلیستا هەولی دەدا دەستەکانی ئازاد بکات, بەلام زەربەیەکی قورس بەر سەری کەوت و بوراندییەوە. بێ وچان وەکو گەنمی خێر دەیان کوتا، تەنانەت کاتێ کە بواربوشەوە هەستی بەو لێدانەیەك لە دوای یەکانە دەکرد کە بە لەشیاندا دەکێشا.

ئەو دۆڵەی پارتیزانەکان هەواریان لێ خستبوو، دۆڵێکی تەنگو تاریك بوو، بەلام هەتاو لەپشت شەقامی دارستانەکەوەو شان بەشانی خوانیخدزا کە بنکەی مەیلەو سوور بوو، خۆی دەنواند.

رۆژی پڕ لەبۆن بۆگەنی پایز بەسەر دارستانەکەوە دەردەکەوت. پاسەوانی ئۆردووەکە لەپاڵ ئەسپەکاندا وەنەوزی دەدا، بەدەم خەوەنوتکێوەو لە دوورەوە هەستی بەدەنگی بەردەوامی دەستڕێژی رەشاشێك دەکرد، بەترسەوە لە جێی خۆی راپەڕی و دەستی دایە تفەنگەکەی. تومەزئەوە دارکون کەرەیەك بوو، و کەوتبووە گیان پیرەدارێکی کەنار چۆمەکە. پاسەوانەکە بەدەم لە سەرما هەڵ لەرزین و جنێودانەوە پاڵتۆکەی دا بەشانیاو خۆی بە مەیدانە وازو روتەنەکەی دارستانەکەدا کرد. چ کەسێك لەو ناوە بێدار نەبوو —پارتیزانەکان—. ئەو پیاوە نیگەران و نائومێدانە، ئەو برسی و شەکەتانە، ئەوانەی چ ئومێدێکیان بە سبەینێ نەبوو. چوو بوونە باوەشی خەوێکی قورسەوە.

پاسەوانەکە تێفکری: هێشتا سەر دەستەکە نەگەڕاوەتەوە.... بێگومان هەنووکە سکی خۆی تێر کردووەو بەبێ خەمی لە کوختێکدا خەوتووەو ئێمەش لێرەدا دەبێ دەردی برسێتی بکێشین!

ئەویش "پاسەوانەکە" جاران وەکو خەڵکانی دی ستایشی متلیستای دەکرد و شانازی پێوە دەکرد، کەچی هەنووکە پڕ بەدڵ هەستی دەکرد کە متلیستا پیاوێکی تا رادەیەك نزم و کەمو گەلێك هەڵە بوون کە ئەویان بە فەرماندەی خۆیان هەڵبژاردووە. پاسەوانەکە هەستی بە بێزاری کرد، بۆ دەبێ ئەو لەو دارستانەدا رەنج بکێشێت و کەسانی وەکو متلیستاش دەستیان بە هەموو لەزەت و خۆشییەکی ژیان بگات. پاسەوانەکە دەترسا بەبێ بەڵگەی تەواو لڤنسون لە خەو هەستێنێ، بۆیە چوو بەسۆراخی باکلانوفەوە.

باکلانۆف دانیشت، چاوە خەواڵو ئەبلەقەکانی بڕییە پاسەوانەکەو پرسی: چی؟ هێشتا نەهاتۆتەوە؟ گوتت =نەهاتۆتەوە؟ باکلانۆف هێشتا بە تەواوی خەبەری نەبوو بۆوە، هەستی بە خەتەر کرد. ئێشگرەکەی گاز کرد: نا، مەحاڵە برادەر، تۆ گەوجی، ئاه، ئەرێ، زۆر چاکە



ڤنسون هەستێنە! هەستایە سەر پێ، بە پەلە پشتێنەکەی توند کردەوە، کەمێك چاوەکانی داخست و لە پڕ هاتەوە سەرخۆو خۆی کونترۆڵ کرد.

گەرچی ڤنسون لە پرخەی خەوا بوو، بەڵام هەر کە گوێی لە نێوی خۆی بوو، دەست بەجێ چاوی هەڵێناو لەسەر جێگاکەی دانیشت، کە چاوی بەباکلانوف و پاسەوانەکە کەوت، یەکسەر زانی هێشتا متلیستا نەگەڕاوەتەوە وەختی حەرەکەت کردنە، بۆ لەحزەیەك هەستی بەماندوویەتیەکی ئەوتۆ کرد کە پڕ بە دڵ حەزی دەکرد سەری بخاتەوە ژێر پاڵتۆکەی و لێی بخەوێتەوە، تا متلیستاو هەموو داخ و نیگەرانییەکانی خۆی لە بیر بچێتەوە. بەڵام دوای تۆزێك هەستایە سەر چۆکان، پاڵتۆکەی لوولدا.

بەشێوەیەکی وشك دەستی بە وەڵامدانەی پرسیارە پڕ لە هەڵچوونەکانی باکلانوف کرد.

– زۆر باشە، چۆن دەبێ، من زۆرم بیر لێ کردەوە، لە رێگا دەیبینین.
– ئەدی ئەگەر نەمان بینی؟
– ئەگەر نەمانبینی؟ ئەرێ ژێر زگێکی زیادەت هەیە بمدەیتێ بۆ ئەسپەکەم؟ پاسەوانەکە لە کاتێکدا زەلامە نووستووەکانی بە لەقە لە خەو هەڵدەستاند، هاواری کرد: هەستن، هەستن ئەی بەرازە خەو خۆشەکان! دەبێ بەرەو گوند حەرەکەت بکەین! کەللەی قژلوولی پارتیزانەکان لەسەر پوش و پەلاشەکان بەرز بۆوەو یەکەم دەمرێژی جنێوی بێ ریا بەسەر پاسەوانەکەدا داباری. دوبوف لە رۆژانی ئاساییدا عادەتەن بیری دەخستنەوە کە رۆژ باش لە یەکدی بکەن. باکلانوف هەندێك راماو گوتی: بەڕاستی هاوڕێکانمان بوون بە دڕندە، برسیانە.

ڤنسون پرسی: ئەدی تۆ برسیت نییە؟

باکلانوف نێو چاوانی گرژ کرد، من؟ منن گوێی نادەمێ، تۆ خۆت دەزانی منیش دەتوانم وەکو تۆ بکەم. ڤنسون ئەوەندە بە هێمنی و ئاساییەوە سەیری کرد، وەك بیەوێ بڵێ: دەزانم.

باکلانوڤ ناچار کرد بە جۆرێ لێی ورد بێتەوە وەك بڵێی هەرگیز لەوەو پێش نەیبینی بوو.

بە دڵسۆزییەکی چاوەڕوان نەکراوەوە گوتی: دەزانی زۆر لاواز بوویت، هەر ردێنەکەت ماوەتەوە، ئەگەر من لە جیاتی تۆ بام...

ڤنسون لە ژێر لێوەوەو بە بێ موبالاتیەوە پێکەنی و گوتی: پێویستە بچی خۆت بشۆی، ها؟ یاڵلا.

چوون بۆ چۆمەکە، باکلانوف کراس و بلوزەکەی داکەندو هەر لەو دەوروبەردا کەوتە شڵپە شڵپ، دیار بوو کە لە ئاوە ساردەکە نەدەترسا، هەتاو بەدەنی پتەوی خۆشەکردبوو، دەتگوت لە پۆڵا دایان رشت بوو، کەللەی خڕو منداڵانە بوو، بە جۆرێکی مەیلەو ناشیانەو منداڵانە سەری دەشت, بە دەستێکی تۆزێ ئاوی پێدا دەکردو بە دەستەکەی دیکەی هەڵیدەگلۆفت.

ڤنسون لە پڕ بیری کردەوە: دوێنێ شەو سەبارەت بە گەلێك شت قسانم کردو قەولی شتێکیشم دا، بەڵام ئەمرۆکە هیچیان بە پێویست نازانم یادی ئەو گفتوگۆ نائاساییەی کە لەگەڵ متچیکدا کردبووی و ئەو بیرە ئاڵۆزو ناخۆشانەی خۆیشی کە ئازاریان دابوو، دووبارە هێرشیان بۆ



مێشکی هێنایەوە، ئەگەرچی هیچ وشەیەکیان هاوتاو رەنگدانەوەی ئەو هەستەی نەبوون، بەڵام ئێستاکێ بێ سوودو پوچ نەدەهاتنە بەر چاوی. لڤنسون دەیزانی گفتوگۆکەی دوێنێ شەوی زیرەکانەو پڕ مانا بووە، بەڵام هەر کە بیری کەوتەوە، هەستێکی ناخۆش و سەیر سەراپای داگرت: ئاه، بەڵێ، من قەولی ئەسپێکی ترم داوەتێ، ئاخۆ کارێکی خراپم کردووە؟ نا ئەمڕۆش دەمتوانی ئەم کارە بکەم —هەمووی دروست بوو، ئەدی کوێی هەڵەیە؟ سەریەشەکە ئەمەیە کە ....

باکلانوف لە خۆشتن بووە، بە خاولییەکی چڵکن بە جۆرێ لەشی دەسڕی کە هەموو پێستی بەدەنی سوور هەڵگەڕا بوو.

پرسی: ئەدی بۆ خۆت ناشۆی، ئاوەکە ساردە، زۆر باشە!

لڤنسون بەو دەقەوە کە لە کەنارەکەوە دادەگەڕا، لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە:.... سەریەشەکە ئەمەیە کە من نەخۆشم، رۆژ بەرۆژ کەسیرەم دەکات، لەوە کەسیرەترم دەکات کە بتوانم بەسەر خۆما زاڵ بم. بە هەر حاڵ پاش خۆشتن و، وەختێ پشتێنەکەی بەست و هەستی بە سەنگی ئاشنای دەمانچەکەی لە سەر رانی کرد، بۆی دەرکەوت کە خەوەکەی ئەمشەوی هێزێکی تازەی پێ بەخشیوە.

متلیستا چی بەسەر هاتووە؟ ئەم بیرە هەموو بوونی داگیرکرد بوو.

لڤنسون نەیدەتوانی متلیستایەکی بێ جوڵە بێنێتە بەرچاوی خۆی چ جای متلیستایەکی مردوو. لڤنسون هەمیشە هەستی بەمەیلێکی نامەفهوم بەرانبەر بە متلیستا دەکرد، زۆر جار هەستی کردبوو سواری لە تەکیا، قسەکردن لەگەڵیا، یان تەنیا بینینی، بۆ ئەو "لڤنسون" شادی بەخشە.

لڤنسون لەبەر خاتری خەسڵەتە دیارو بەرزو بەسوودە کۆمەڵایەتییەکان، متلیستای ستایش نەدەکرد —چونکە لە راستیا تارادەیەك لەو خەسڵەتانە بەدەر بوو— لڤنسون لەم رووەوە گەلێك لەوبالاتر بوو. بەڵکو لە بەر خاتری ئەو توانا جەستەییە ستایشی دەکرد کە بەردەوام لە ناخیا دەجۆشا. لڤنسون لەم بارەیەوە کەمێك نوقستان بوو، هەر کاتێ هەیکەلی نەرم و گورج و چاپوکی متلیستای دەبینی کە بەردەوام ئامادەی کار بوو یان وەختێ هەستی بە بوونی ئەو دەکرد، بێ ئەوەی بە خۆ بزانێ ناتوانایی جەستەی خۆی فەرامۆش دەکردو وای دەزانی متلیستایەکە بۆ خۆی. کە دەیبینی فەرماندەی متلیستایە هەستی بە غرور دەکرد.

ئەم فیکرەی کە رەنگە متلیستا کەوتبێتە دەستی دژمن —گەرچی لڤنسون لە جاران پتر قەناعەتی پێ هێنا— ناچووە ئەقڵی هیچ کەسێکەوە. پارتیزانە شەکەتەکان بە لاساری و دوو دڵییەوە ئەم فیکرەیان لە خۆ دەتاراند، چونکە ئەگەر ئەمە راست بوایە، خۆی لە خۆیدا دەبوو بە نیشانەی رۆژ رەشییان، هەر بۆیەش بەلایانەوە درۆ بوو. لەلایەکی ترەوە گومانی پاسەوانەکە لەسەر دەستەکە دەبێ بۆ خۆی سکی خۆی تێر کردبێ، بێ خەم لە کوختێك دا نووستبێ، ئەگەر چی ئەم کارە لە هۆش و ئەرکناسی متلیستاوە دوور بوو، پەتیا پەیتا لایەنگرانی پەیدا دەکرد.



هەندێکیان بە ئاشکرا سکاڵایان لە ترسنۆکی و خیانەتی ئەو هەبوو، بەردەوام پێیان لە لڤنسون دا دەگرت کە هەتا زووەو کات بەسەر نەچووە، بەپەلە بە دوایا بڕۆن، لڤنسون لە کاتێکا پتر لە جاران بایەخی بە کارەئاساییەکانی نێو هێزەکە دەدا–کە یەکێك لەو کارانە دانی ئەسپێك بوو بە متچیک– فەرمانی حەرەکەتی هێزەکەی دەرکرد.

کە پارتیزانەکان بەم فەرمانەیان زانی، نەیان دەزانی لەخۆشیا چ بکەن وەك بڵێی ئەم فەرمانە دەست بەجێ و هەر لێرەدا کۆتایی بە هەموو ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانیان هێنابوو.

سەعاتە رێیەك رۆیشتن، پاشان سەعاتێکی تریش رۆیشتن بەڵام چ هەواڵێك لەسەر دەستەکەو لە کاکۆڵە رەشە ناپوختەکەی سەر نێو چەوانییەوە نەبوو.

دوو سەعاتی تریش رۆیشتن و چ ئاسەوارێکی متلیستا دیار نەبوو. ئێستا ئیدی نەك هەر لڤنسون، بەڵکو ئەوانەش کەبەغیلیان بە متلیستا دەبردو جوێنیان پێ دەدا کەوتنە گومانی ئەوەوە کە نەبادا تووش بووبێ.

هێزەکە، بەکپی و بێدەنگی، بەسواری ئەسپان بەرەو قەراخی دارستانەکە دەچوو.







**سێ مەرگ**

وەختێ متلیستا هاتەوە سەر هۆش، خۆی لە گەوڕێکی گەورەو تاریکدا بینییەوە, دەمەو روو کەوتبوو, یەکەمجار هەستی بەوە کرد کە شێیەکی سارد لە نێو گەوڕەکەوە دەچووە ناخی لەشییەوە, لە پڕهەموو ئەو بەسەرهاتانەی وەبیرهێنایەوە کە بە سەری هاتبوون, هێشتا دەنگی لێدان لەمێشکیا دەزرینگایەوە, هەستی بە لینجی ئەو پەلە خوێنانە دەکرد کە بە سەر تەوێڵ و گۆناکانییەوە بوون.

بەر لە هەموو شتێ بیری لە فیرار کردن کردەوە, متلیستا نەیدەتوانی پاش ئەو هەموو شتانەی لە ژیاندا کردبوونی, پاش ئەنجامدانی ئەو هەموو کارە گەورەو دیارانە, پاش ئەو هەموو خۆشیانەی کە ئەو کارانە هێنا بوویانە ئاراوەو لە نێو خەڵکیدا نێوبانگی دەرکرد بوو، ئەوە قەبووڵ بکات وەکو خەڵکانی دی بکەوێتە سەر زەوی و بۆگەن بکات. بە لەپەکوتێ هەموو لایەکی عەمارەکەی تاقی کردەوە، هەموو درزو قلێشەکانی پشکنی و تەنانەت هەوڵی دا دەرگای عەمارەکە بشکێنێ، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. داری ساردو بێ گیان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان دا بوو: تەختەکان ئەوەندە سفت و لە پاڵ یەك بوون تەنانەت تەماشا کردن لە درزەکانیانەوە مەحاڵ بوو. تیشکی کزی سپێدەی پایز بەئاستەم لە درزەکانەوە رەت دەبوو.

بە هەر حاڵ زۆری هەوڵدا، ئومێد بڕ بوو، دڵنیا بوو کە ئەمجارە شانسی هەڵاتنی لەدەست چووە. کە گەییە ئەم قەناعەتە ئیدی بایەخی مەرگ و ژیانی لەلا دابەزی.

هەر هەموو تواناو هێزێکی بەدەنی و ئەقڵی لەسەر یەك شت گیرسا بۆوە، لەسەر شتێ کە لە باری مەرگ و ژیانەوە گەلەك بێ بایەخ بوو، بەڵام لەرووی شەخسییەوە بۆ ئەو گەلەك گرنگ بوو: ئەگەر متلیستا بێ، ئەو متلیستایەی کە تا ئێستا شەهامەت و ئازایەتی بێ قسور بووە، دەبێ بە هەر جۆرێ بووە هەوڵ بدات ئەوە بە بکوژەکانی نیشان بدا کە لێیان ناترسێت و بە خوێڕی و بۆدەڵەیان دەزانێ.

متلیستا، هێشتا ئەم مەسەلەیەی بە تەواوی لە مێشکی خۆیدا تاوتوێ نەکردبوو کە لە دەرێ را دەنگێك هات. دەنگی کێلۆنی دەرگاکە هات و دوو قۆزاقی پانتۆڵ دەڵب، لەگەڵ تیشکی شین باوی کزو لەرزۆکی سپێدەدا هاتنە ژوورەوە.

متلیستا لاقەکانی بڵاو کردبۆوەو وەستا بوو، چاوەکای بچووك کردبۆوە، و زەق زەق سەیری دەکردن، کە قوزاقەکان، متلیستایان بەوجۆرە بینی، ترسیان لێنیشت، لەبەر دەرگادا وەستان. قوزاقەکەی پاشەوە هەناسەی سوار بوو بوو. ئەنجا قوزاقەکەی پێشەوە گوتی: وەرە





هاوشاری... چ بێزارییەك لە دەنگیا هەست پێ نەدەکرا، دەتگوت نەختۆکەکیش هەست بە تاوان دەکات.

متلیستا بەنیگایەکی تورەی رقایەوە سەری داخستو لە عەمارەکە دەرچوو, زۆری نەبرد لەبەردەم زەلامێکا گیرسایەوە. متلیستا زەلامەکەی ناسییەوە هەمان زەلام بوو کە دوێنێ شەو لە هۆدەکەدا لەگەڵ کەشیش و ئەوانی دیدا وازی وەرەقی دەکرد، ئەو پیاوە بوو کە کلاوێکی رەشی قوزاقی لەسەرو جبەیەکی خوری لەبەر بوو. ئەفسەرە خۆش ئەندامەکەش، کەمتلیستا بە فەرماندەی سوارەکانی زانی بوو، لەوێ بوو لەسەر کورسییەکی نەرم دانیشتبوو و بە چاوانی گێژو ناجیدییەوە سەیری متلیستای دەکرد. متلیستا لە ئەنجامی سەرنجدان و تەحقیقی دوورو درێژی هەر یەکێکیانەوە، بە قەرینە بۆی دەرکەوت کە ئەفسەرە خۆش ئەندامەکە، فەرماندە نییە، بەڵکو ئەو پیاوە فەرماندەیە کە جبە قوزاقیەکەی لەبەر دابوو.

کابرای کلاو رەش چاوێکی بەو دوو قوزاقەدا گێڕا کە لە پاڵ دەرگاکەدا وێستا بوون، بەتوندی گوتی: ئێوە بڕۆن.

قوزاقەکان بەدەم یەکتر دەڵەك دانەوە، پێیان بەعاردیدا کوتاو لە دەرگاکە چوونە دەرێ.

کابرای کلاو رەش چاوی بڕییە متلیستاو بەرەو رووی چوو، لە پڕ پرسی: دوێنێ لە باخەکەدا چیت دەکرد؟

متلیستا بە قێزەوە تەماشای ناو چاوی کرد، بێ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، چاوی بڕییە ناو چاوی، برۆ رەشە جوانەکانی بەئاستەم لەرزین و هەموو رەفتارێکی ئەوەی نیشان دەدا کە سوورە لەسەر ئەوەی شتێ نەڵێ مایەی شادی ئەوان بێ، جا چی لێ دەپریسن و چۆنی دێننە قسان، گرنگ نییە.

سەرۆك گوتی: گەوج مەبە! سەرۆك نە تووڕە بوو و نە دەنگی بەرز کردەوە. بەڵام دەنگی ئەوەی دەردەخست ئاگای لە هەموو ئەو شتانەیە کە لەو لەحزەیەدا لە ناخی متلیستا بوو.

سەردەستە، بەهێمنی پێکەنی و گوتی: قسەی من چ سوودێك دەگەیەنێ، فەرماندەی سوارەکان، روانییە جێ ئاوڵە بە خوێنەکانی دەموچاوی متلیستاو لەپڕ پرسی: لە مێژە ئاوڵەت دەرداوە؟

سەر دەستەکە بە سەرسامی پرسی: چیە؟ متلیستا سەرسام بوو، چونکە نە تەوس و پێکەنین، نە چەمك و مەبەستێکی تایبەتی لە پرسیاری ئەفسەرەکەدا نەبوو. تەواو دیاریش بوو کە چاوی لە دەموچاوە ئاوڵاوەییەکەی متلیستا بوو. متلیستا گەلەك تووڕە بوو. بە پرسیارەکەدا وا دیار بوو، فەرماندەی سوارەکان دەیوست بەرقەراری بناغەی پێوەندییە بە رواڵەت ئینسانیەکان شی بکاتەوە.

= باشە تۆ کێی– خەڵکی ئەم ناوچەیەی یان لە شوێنانی ترەوە هاتوویت؟.

متلیستا بە رقەوە نەڕاندی: فەرق ناکات ئاغا! ئەمجا سوور بۆوە، مستەکانی نوقاندو بە زەحمەت توانی زاڵ بێ بەسەر ئەو هاندەرەدا کە هانی دەدا پەلاماری ئەفسەرەکە بدات.

متلیستا دەیویست قسەی تریش بکات بەڵام ئەم بیرە مژولی کردبوو: بۆ نەکرێ ئەم پیاوە کلاو



ڕەشە، بەم سیما ئارامەوە بەم دەموچاوە هەڵماساوە بێزار کەرەوە کەیەك پارچە مووی زبرو سووروو ناشیرین بوو، بگریّ و بخنکێنیّ؟ ئەم بیرانە وایان جۆش دابوو کە پاش سووکە هەڵوەستەیەك هەنگاوێك چووە پێشەوە، بە توندی دەستەکانی جوڵاند، دەموچاوە ئاوڵاوییەکەی نیشتە سەر ئارەقە.

کابرا بە دەنگی بەرز: ئەهای! چاوی بڕییە چاوانی متلیستاو لە جێی خۆی نەجولاً.

متلیستا هەڵوەستەیەکی کرد، چاوەکانی بریسکانەوە. پاشان کابرا دەمانچەکەی دەرهێناو لەبەر لووتی متلیستادا رای گرت. متلیستا هاتەوە سەرخۆ، چووە لای پەنجەرەکەوەو بە کپی و بێدەنگی وێستا. پاشان سەرەڕای هەڕەشە کردن بە دەمانچەو هەڕەشەی ئەشکەنجەی سەخت و کوشندە، وێڕای ئەو بەڵێنانەی کەئەگەر ئیعتراف بکات بەردە بیّ، متلیستا نەك تاقە وشەیەکی نەدرکاند، بەڵکو بە درێژایی تەحقیقەکە هەر سەیریشی نەکردن. لە کاتی تەحقیقەکەدا دەرگا بە هێمنی کرایەوە، روخسارێکی توکنی چاودرشت و گەوج و ترس لێنیشتوو، روانییە نێو هۆدەکە.

فەرماندەی سوارەکان گوتی: ئەها! هەموویانتان کۆکردەوە؟ زۆر چاکە، بە سەربازەکان بڵێ با بێن ئەم کابرا لە خۆ رازییە بەرن.

هەمان دوو قوزاق متلیستایان بردە حەسارێکەوە، دەرگایەکی وازیان پیشان داو دایانە پێش. متلیستا ئاوڕی نەدایەوە، بەڵام هەستی دەکرد دوو قوزاقەکەو ئەفسەرەکەش بەدوایەوەن. گەیشتە مەیدانی کڵێساکە.

قوزاقەکان، خەڵکی گوندیان لە تەنیشت کوختی زەیەوانی کڵێساکەوە خڕ کردبووەو ئابڵوقەیان دابوون. متلیستا هەمیشە وا بیری دەکردەوە کە خەڵکی خۆش نەویّ، لەسەر شتی بچووك تەکتیری دەکردن–رقی لە خۆیان و لە هەرچی شتێك پێوەندی بەوانەوە بوو، دەبۆوە، بە تەواوی قەناعەتی بە خۆی کردبوو کە خەڵکی هەرچییەکی دەربارە بڵێن، گرنگ نییە، نە دۆستی هەبوو، ونە لە هەوڵی دۆست پەیدا کردنیشا بوو. سەرەڕای ئەوەش،هەر چەندە خۆی پێی نەزانی بوو، کاری گەلەك مەزن و گرنگی بۆ ئەو خەڵکەو لە پێناوی ئەو خەڵکەدا ئەنجامدا بوو. لەم رووەوە خەڵکی بەشانازییەوە تەماشایان دەکردو سروودیان لە ستایشیدا دەگوت بەڵام ئێستاکیّ کە رووی وەرگێڕاو ئەم حەشامەتە جەنجاڵەی گوندنشینانی بینی: ئەم پیاوو منداڵە هەراسانانە، ژنان بە بەرهەڵبێنەی رەنگاو رەنگی دەست درۆی خۆوە، کیژان بە لەچکی سپی و رەنگاو رەنگەوە، پیاوان بەبیّ قەراری بەسەر ئەسپەوەو بەجلی ئاڵ و واڵای تازەوە، کە پتر لە وێنە رەنگییە هەرزانەکانی قوزاقەکاندا دەبینرا.

چەپکیّ قژ لە کڵاوەکانیانەوە هاتبووە دەریّ و بەتەوێڵیاندا شۆڕ بوو بووەو, سێبەرە درێژەکانیان بەسەر پوش و گیاکاندا سەمای دەکرد، تەنانەت گومەزە کۆنەکانی کڵێسا کە بەدیار سەریانەوە لەبەر تیشکی نیوە گەرمی هەتاوا، پورترێتێکی لە دڵی ئاسماندا پێك دەهێنا. کە هەموو ئەمانەی بینی نەك تەنیا بە چاو بەڵکو بە هەموو دڵییەوە خۆشی ویستن و پێشوازی لێکردن.



بە دەنگێکی نیمچە بەرز هاواری کرد: سەیرە! لە پڕ دڵی بە پەلە چوو بۆ نێو حەشاماتەکە.
هەموو دیمەنەکان بەلایەوە لەزەت بەخش بوون- ئەم جەماوەرە زیندوو و کپ و هەژارە، گشت ئەوانەی هەناسەیان دەداو لەو ناوە دەدرەوشانەوە، خوێنی متلیستایان دەهێنایە کوڵ، بە هەنگاوی سووک و گورجەوە، ئازادانە هەنگاوی دەنا، دەتگوت بەسەر زەویدا باز دەدا، گشت ئەوانەی لە مەیدانەکەدا بوون هەناسەیان لە خۆ بڕی بوو، و سەیریان دەکرد، هەستیان بەو هێزو توانا حەیوانییە دەکرد کە لە بە دەنیا جێگیر بوو، ئەو بەدەنە گەرم و گوڕەی کە وەکو شەقاوەکانی توندو خێرا بوو. بە دەم تەماشا کردنەوە بە نێو حەشامەتەکەدا ڕەت بوو، بێ دەنگی و کپییەکەیان سەرنجی ڕاکێشا بوو، لەبەر هەیوانی ژوورە کڵۆڵەکەی مجێوری کڵێساکەدا وێستا. ئەفسەرەکان بە تەنیشتیا ڕەت بوون و بە پلەکاندا سەرکەوتنە سەرێ.
فەرماندەی سوارەکان لە تەنیشت خۆیەوە شوێنێکی بە متلیستا نیشانداو گوتی: وەرە ئێرە!
متلیستا بێ باکانە بە پلەکاندا سەرکەوت و لە تەنیشت ئەودا وێستا.
هەنووکە هەموو حەشاماتەکە بەتەواوی دەیانبینی: بالآی بەرزو ڕێك و هەڵکشاو، قژی ڕەش، جووتێ پێڵاوی لە پێدا بوو، لە پێستی حەیوانە کێوی دروست کرابوو، کراسێکی لەبەر بوو قۆپچەکانی کرابۆوە، پشتێنێکی بەسەرا بەستبوو کە گوڵینگەی گەورەو کەسکی پێوە شۆڕ بوو بۆوە، چاوە تیژو هەڵۆ ئاساکانی بە تیشکێکی خەست بریسکانەوەو بەسەر ئەو کێوانەدا گیرسانەوە کە بە شکۆوە لە ناو جەرگەی تەم و مژی سپێدەدا قوت بوو بوونەوە.
فەرماندە نیگا تیژەکانی بڕییە حەشامەتەکەو وەك بڵێی لەسەر هەر یەکێکیان نەختێ بوەستێ، پاشان پرسی:
کێ ئەم کابرایە دەناسێت؟
هەموو کە چاویان بە چاوی تیژی متلیستا دەکەوت، بە پەشێوی و بە پەلە چاویان دەتروکاندو سەریان دادەخست. تەنیا پیرێژنێك نەبێ کە توانای روو وەرگێڕانی نەما بوو، بە جۆرێکی گەوجانەو تەوس ئامێزەوە چاوی بڕی بووە چاوی ئەو.
فەرماندە بە ساردییەوە پرسی: کەس نایناسێت؟ بە جۆرێ تاکیدی لەسەر وشەی "کەس" کرد، وەك بڵێی لای روون بوو کە هەر هەموو دەیانناسی. فەرماندە بە دەست ئیشارەتێکی بۆ ئەفسەرێکی بالآ بەرز کرد کە پاڵتۆیەکی قوزاقی درێژی لەبەر بوو، سواری ئەسپێکی سورخنی چەموش بوو بوو، بانگی کرد: زۆر چاکە، هەنووکە مەعلووم دەبێ، نی چی تائیلو!
حەشامەتەکە خرۆشا، چپە چپ و خوتەو بۆڵەیان تێکەوت. ئەوانەی پێشەوە بە چاوەڕوانییەوە چاویان بە دەوروبەردا دەگێڕا. کابرایەك بە جبەیەکی ڕەشەوە، بەتۆبزی ڕێی خۆی لە نێو حەشاماتەکەوە کردەوە، بە جۆرێ سەری داخستبوو کە تەنیا بریقەی کڵاوەکەی دەبینرا.
کابرا بەدەستێك دڕی بە خەڵکەکە دەداو بە دەستەکەی تری یەکێکی ڕێنوێنی دەکرد، پەیتا پەیتا دەیگوت: ڕێ بدەن! ڕێ بدەن!
سەر ئەنجام گەیشتە بەر هەیوانەکە. پاشان هەموو بینیان کە مێرد منداڵێکی لەگەڵدا بوو،مێرد منداڵێکی لاوازی قژ ڕەش، چاکەتێکی درێژی لەبەر بوو، دەترساو ڕێی دانەدەگرت.



نیگای چاوە رەشەکانی منداڵەکە لەسەر متلیستاوە چووە سەر کابرای فەرماندە. غەڵبە غەڵب و هەراو هوریا بەرز بۆوە. یەکو یۆی ژنان دەگەییە گوێ. متلیستا روانییە خوارەوە، هەر کە روخساری منداڵە قژرەشە چاو ترساوە مل باریکەکەی بینی، ناسییەوەو زانی ئەو منداڵەیە کە دوێنێ شەو ئەسپەکەی پێ سپاردبوو.

ئەو جووتیارەی دەستی منداڵەکەی گرتبوو، کڵاوەکەی لەسەر خۆی داکەند. کەللە تەخت و بۆرەکەی بە چەپکێك قژی بۆزەوە دەرکەوت و دەتگوت بە شێوەیەکی نارێك خوێیان بە قژییەوە پرژاندووە، کڕنوشی بۆ فەرماندەی سواران برد: شوانەکەم هێناوەتە خزمەتتان... وەلێ ترسا کەنەبادا قسەکەی نەژنەوتبێ، بە پەلە بەسەر منداڵەکەدا دانەوییەوەو پەنجەی بۆ لای متلیستا راکێشاو گوتی: ئەمەیە، ها؟

چاوانی منداڵەکەو متلیستا بۆ چەند لەحزەیەك راستەو راست لەسەر یەکدی گیرسانەوە — متلیستا بەبێ پەروایی و منداڵەکە بەترس و هاوخەمی و دڵسۆزییەوە، سەیری یەکتریان کرد. پاشان منداڵەکە نیگای گواستەوە سەر فەرماندەی سواران و چەند لەحزەیەك لێی راما، دەتگوت نیگای بە چارەی ئەوەوە دورا بوو، پاشان سەیرێکی ئەو جووتیارەی کرد کە دەستی گرتبوو و بە دنیایە ئومێدەوەوە بەسەریا دانەویبووە، ئاهێکی لە کانگای دڵەوە هەڵکێشاو بە خەمبارییەوە سەری لەقاند کە گوایە نایناسێت. بێدەنگی یەکی ئەوتۆ باڵی بەسەر حەشاماتەکەدا کێشا کە هەموو کەسێك خشەخشی پێی ئەو گوێرەکەیەی ناو تەویلەکەی لای ژووری مجێوری کڵێساکە بژنەوێ کە جارێ دەرۆیی و جارێ دەوەستا.

جووتیارەکە بە پێکەنینێکی تەوس ئامێزو بە دەنگێکی لەرزۆکەوە بە منداڵەکەی گوت: مەترسە گەوجە، مەترسە! جووتیارەکە بە خۆی دەترساو بەبێ ئۆقرەییەکی رقاوییەوە، بە یەك قەمکان ئیشارەتی بۆ لای متلیستا کرد: ئاخر ئەگەر خۆی نەبێ کێیە؟ بڵێ خۆیەتی، مەترسە، مەترسە... ئاە، ئەژدیها! تۆزێك وێستا —پاشان بە رق و بێ رەحمییەوە بازووی منداڵەکەی راتەکاند: دەقاو دەق خۆیەتی قوربان، ئەگەر خۆی نەبێ کێیە پایە بەرز؟ وەك بڵێی بە وتنی ئەم قسەیە بە دەنگی بەرز، خۆی تەبرێ دەکرد، جووتیارەکە بە مەرایی و ریاوە کڵاوەکەی لە نێو دەستیا دەگوشی: دەترسی بڵێ خۆیەتی: لەو زیاتر کێیە؟ ئەوەتا ئەسپەکەی بەزین و تەدارەکەوە حازرە، کیفی دەمانچەکەی لە نێو خورجەکەیدایە؟ دوێنێ شەو دەچێتە دیار ئاگرەکەو دەڵێ: با ئەسپەکەم لێرە بلەوەڕێ. خۆی دێتە نێو گوندو ئەم منداڵە چاوەڕێ دەکات تا دنیا روناك دەبێتەوە، بەڵام ئەم ئیدی ناگەڕێتەوە....

ئەوسا منداڵەکە ئەسپەکە دێنێتەوە بۆ ماڵێ، کیفی دەمانچەیەکی حەوت تیریش لەنێو خورجەکەیە— باشە، شایەت لەوە شایەت تر؟...

فەرماندەی سوارەکان پرسی: کابرای سوار کێ بوو؟ کیفی دەمانچەکە هی کێیە؟ بێهودە هەوڵی دەدا خاوەن ئەسپەکە بناسێت. جووتیارەکە پتر هەڵدەچوو، هەندێ خۆی بە کڵاوەکەیەوە خەریك دەکردو هەمدیس وەکو جاران بە قسەی بێ سەرو بەر دەستی بە رووکردنەوەی رووداوەکە دەکرد، کە چۆن شوانەکەی لە بەرە بەیاندا ئەسپێکی غەریبی زین



کـردوو و کیفـه دەمانچـەیەك لـه نـاو خورجەکـەی پاشـکۆی بـووەو هێناویەتییـەوە بـۆ مـاڵێ.
فەرمانـدەی سـواران بـه ئەسـپایی گـوتی: مـن دەزانم چ کـارێ بکـەم، بـەڵام ئـەو ئیعتراف ناکـات.
بەدەم ئیشـارەت کردنـەوە بۆ لای منداڵەکە، لەسـەری رۆیـی: باشـەن ئـەوە بێننـه ئێـره، ئێمـه بـه شێوازی خۆمان دەیهێنینه قسان.
منداڵەکـەیان لـه پشـتەوە بـەرەو هەیوانەکـه دەڵەکدا. وەلـێ منداڵەکه زاتـی نـەدەکرد لـه پلـەکان سـەرکەوێ. ئەفسـەرەکە بـه پلەکانـدا داگـەڕا، گرتـی بـه شـانه لاوازەکـانی منداڵەکـەیاو لـه زەوی بەرزی کردەوە. چاوە تیژو ترس وروژێنەکانی بڕییه چاوانی له ترسا ئەبڵەق بووی منداڵەکه.
له کاتێکا رەشێنەی چاوی منداڵەکه چوو بووە سەرەوە، له پڕ قیژاندی: ئا– ئا –خ– خ!
یەکێك له ژنەکان کـه لـه شـپرزەییدا کـۆنترۆڵی خـۆی لـه دەسـت دابـوو هـاواری کـرد: چیتان لـەم منداڵه دەوێ؟
هەر لەو کاتەدا هەیکەلی گورج و چاپوکی زەلامێك له پلەکانەوە توڕ درایه خوارەوە.
حەشاماتەکه بەدەم دەست هەڵبڕینەوە، شەپۆل ئاسا کشایەوە. فەرماندەی سوارەکان به زەبری جەزرەبەیەکی سامناك لەسەر زەوی تەخت بوو.
ئەفسەره خۆش ئەندامەکە، به نائومێدییەوە دەستێکی هـەڵبڕی، لـه پـڕ سـەری لێشێواو ترسـی لێنیشـت، لـه کاتێکـا بـیری چـوو بـوو کـه بـه خوێشـی دەتـوانێ تـەقان بکـات، هـاواری کـرد: بـۆ وەستاون و سەیری دەکەن به گولله لێی بدەن!
چەند قوزاقێکی سـواره هـەڵیان کوتایـه نێـو حەشـاماتەکە، ئەسـپەکان حەشـاماتەکەیان تەرتـەو وەرتـەکرد. متلیسـتا بـه هـەموو قورساییەکییەوە فشـاری لـه دژمـن دەکـردو هـەوڵی دەدا چنـگ بخاته گەرووی، بەڵام ئەوەی ژێرەوە که وەکو شەمشەمه کوێره پەله قاژەی دەکردو جبەکـەی بـه چەشنی دووباڵ بڵاوبوو بۆوە، به هـەوڵ و تەقەلایـەکی تـوڕەوە چنگـی لـه پشـتێنەکەی متلیسـتا گیرکردو دەستی بۆ دەمانچەکەی برد، ئەنجام رێك لەو کاتەدا که متلیستا دەستی گەیاندە ملی، ئەو دەمانچەکەی متلیستای دەرهێناو چەند گوللەیەکی بانەو بان یەکی پێوەنا.
کاتێ قوزاقەکان غاریانـدا پێشـەوەو کەوتنـه راکێشـانی لاقەکانی متلیسـتا، ئـەو هێشـتا چنگـی لەگیاو پووشەکان گیر دەکرد. ددانـەکانی جیڕ دەکـردەوە. هـەوڵی دەدا سـەری راسـت بکاتـەوە. بەڵام نا ئومێدانه دەکەوتەوە سەر زەوی.
ئەفسـەره کەتەکـه فەرمانیـدا: نیچیتائیلو! سـوارەکان لـه گونـد بـەرەدەرێ! ئـەوجا بـه ئەدەبـەوە رووی کرده فەرماندەو پرسـی: ئێوەش تەشریف دێنن پایه بەرز!
– بەڵێ.
– ئەسپەکەی پایه بەرز....
پاش نیو سەعات دەستەی قوزاقان به سواری له گوند دەرچوون، به چارناره بـه هـەمان رێگـادا رۆیشتن که دوێنێ شەو متلیستا پێیداهاتبوو.
بـاکلانۆف کـه لـەوانی دی کـەم خـەم و داخـتر نـەبوو، ئیـدی خـۆی پـێ نـەدەگیرا، رووی کـرده لڤنسون و گوتی: گوێ بگره، با من له پێشەوە بڕۆم، خوا دەزانێ چمان له رێیه!



ئاوزەنگی لە ئەسپەکەیدا، زۆر زوتر لەوەی کە چاوەڕوانی بوو، گەییە قەراخی دارستانەکە، ئەو شوێنەی کوختە پەرپوت و وێرانەکەی لێ بوو. باکلانوف چوونە سەربانی بە پێویست نەزانی: لە دووری نیو قۆناغە رێیەکەوە، پەنجا سوارەی سوپایی دی کە لە گردۆڵکەیەکەوە دادەگەڕان، هەموویان هاو شێوەو یەك جۆرە جلیان لەبەر بوو. تیلماسکی زەرد بە کڵاوو پانتۆڵەکانیانەوە بوو. باکلانوف لە سێ و دووی ئەوەدا بوو کە ئایا دەست بەجێ بگەڕێتەوە بۆ لای هاوڕێکانی وئاگاداریان بکاتەوە یان نا. "لڤنسون لەسەر گەیشتن بوو" خۆی لە نێو دەوەنەکاندا مەڵاسدا تا بزانێ ئەو سوارانە دەستەی تریان لە دواوەیە یان نا. چ هەواڵێك لە دەستەی دیکەوە نەبوو، سوارەکان بەڕیزی تا رادەیەك نا رێك حەرەکەتیان دەکرد. بە خاوی زەلامەکان و بە تەکە تەکی کەللەی ئەسپەکاندا دیار بوو کە مەودایەکی زۆریان بە چارنارە بڕی بوو.

باکلانوف گەڕایەوەو بەرەو پیری لڤنسون چوو، کە تازە لە دارستانەکە دەردەچوو. بەئیشارەتی دەست رایوەشاند.

لڤنسون دوای ئەوەی گوێی لێگرت، گوتی: زۆر زۆرن؟

– نزیکەی پەنجا کەسێك دەبن.

– پیادەن؟

– نا، سوارەن.

لڤنسون بە ئەسپایی فەرمانیدا: کوبراك، دوبوف– دابەزن! کوبراك تۆ لە دەستە راستەوە، دوبوف تۆش لە دەستە چەپەوە، بە خۆم ئیشارەتتان دەدەمێ! کە تەماشای کرد، بینی یەکێك لە پارتیزانەکان، پارتیزانێك کە دەموچاوی بە سارغی پێچرابوو، بە ئەسپایی لە ریزەکە دەرچوو، و بە تەمای فیرار کردن بوو. ژمارەیەکیش لە دەوروبەریا هاتوچۆیان دەکرد. لە ناکاو فیکەیەکی کێشا: بگەڕێوە سەر جێگاکەت! قامچییەکەی لێی راوەشاند.

باکلانوفی لە جێی متلیستا داناو دەستوری دایێ کە لە هەمان جێگای خۆی بوەستێ. پاشان لە ئەسپەکەی دابەزی، دەمانچەکەی بە قەدییەوە جوڵانەی دەکرد، لە پێش لەشکرەکەوە کەوتە لەنگین.

دەستووری دا کە پارتیزانەکان لە نێو دەوەنەکاندا تەدارەکی شەڕ لە خۆ بدەن، بەخۆیشی لەگەڵ پارتیزانێکدا بە سینگە خشکێ بەرەو کوختەکە کشا. سوارەکان تەواو نزیك بوون. لڤنسون، بە تیلماسکی زەردی قەد کڵاوو پانتۆڵەکانیانا، ناسینییەوە کە قوزاقن. بە چاوی خۆی دەیبینی کە فەرماندەکەیان جبەیەکی خوری لەبەر بوو.

بە ئەسپایی و دەنگی نزم دەستووری بە پارتیزانەکەدا: پێیان بڵێ، بە دزەو سینگە خشکێ خۆیان بگەیەننە ئێرەو تا دەستووری ئایندە کەس بۆی نییە لەسەر زەوی هەستێ... باشە. ئەدی ماتەڵی چیت؟ خیرا! ئەوجا بە تورەییەوە پارتیزانەکەی دەڵەکدا. هەر چەندە ژمارەی قوزاقەکان کەم بوو، کەچی لڤنسون لە پڕ وەکو قوناغەکانی سەرەتای شەڕی پارتیزانی هەستی بە شپرزەیی کرد.



لڤنسون لەو دەورەیەی ژیاندا دوو قوناغی دیاری دەکرد کە هیچ هێڵ و سنوورێکی دیاری کراو لە یەکدی جودا نەدەکردنەوە، تەنیا بە هەست، هەستیٚ کە ئەو قۆناغانە لایان دروست کردبوو، ئەو دوو قۆناغەی لێکدی دەناسییەوە.

لە قۆناغی یەکەمدا، کە چ ئەزموون و زانیارییەکی سوپایی نەبوو، نەیدەزانی تفەنگ بتەقێنیٚ و بە ناچاری رێبەری ژمارەیەکی لە عۆدەدا بوو، هەستی دەکرد تێکرای رووداوەکان لە دەرەوەی سنووری تواناو دەسەڵات و ویستی ئەودا روویان دەداو لە راستیا ئەو دەستووری ئەنجامدانی دەرنەدەکردن. هەڵبەتە نەك لەبەر ئەوەی خۆی لە ئەرکەکانی دەدزییەوە، نا, چونکە ئەو بە هەموو ئەو هێزەوە کە لە بەردەستیا بوو، هەوڵی دەدا ئەرکەکانی ئەنجام بدات. هەروەها نەك لەبەر ئەمەش کە چ ئەوساو چ ئێستا باوەڕی وا بووبیٚ، توانایەکی ئەوتۆی نییە دەورێکی باشی لەو رووداوانەدا هەبیٚ کە یەخانگیری جەماوەری خەڵك بوو بوو —چونکە بە لای ئەوەوە ئەم بۆچوونە هەڵقولاوی خراترین دوو روویی بەشەری بوو. پەردەی شاردنەوەی بیٚ توانایی ئەوانە بوو کە بە هۆی تەمەڵی و حەز لە کار نەکردنەوە تەشەبوسیان پیٚ دەکرد. بەڵکو ئەمە بوو کە لەم دەورە کورتەی شەڕکردنیا بەشی هەرە زۆری فیکری خۆی تەرخان کردبوو بۆ زاڵ بوون بەسەر ترسی خۆیداو، شاردنەوەی ئەم ترسە لە خەڵکانی دی، ترسێك کە نەیدەتوانی لە کاتی جەنگدا جڵەوی بگریٚ.

بە هەر حاڵ تا رادەیەك بە زوویی خۆی لە گەڵ هەلومەرجی شەڕدا گونجاند. گەییە ئەو سەرەنجامەی کەترس لە مردن، ئیدی بەرهەڵستی هۆی رزگاربوونی ژیانی خەڵکانی دی نەبوو.

لە قۆناغی دووەمدا، هێزو توانایەکی پەیدا کرد کە دەیتوانی تاسیر لە روداوەکان بکات و بیانخاتە سەر رێگای دروستی خۆیان. قۆناغی دیاری رووداوەکان و پێوەندی هێزەکان و ئەو کەسانەی گیرۆدەی رووداوەکان بوون، بە وردی پێشبینی بکات —ئەم تواناو هێزە بە تەواوی لەودا خەملی بوو.

بەلاٚم لڤنسون، هەنووکە هەستی بە هەمان شپرزەیی جاران دەکرد. لڤنسون ئەو شپرزەییەی بە هەڵقولاوی وەزعی رۆحی خۆی و بۆچوونەکانی لەمەڕ ون بوونی متلیستا دەزانی.

وەختیٚ ریزی پارتیزانەکان بۆ پێشەوە دەکشا، لڤنسون هێشتا هەر لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە بەسەر خۆیدا زاڵ ببیٚ.

جارێکی دی روخساری کەمیٚ هەڵچووی، بە حەرەکاتی وردو دڵنیایی بەخشەوە، پرۆژەی نەخشەیەکی لە هەڵە نەهاتووی دەخستە بەردەم پیاوەکانی، کە بە زەبری عادەت و بە حوکمی پێویستی رۆحییەوە باوەڕیان پیٚی بوو. سوارەکان، ئەوەندە نزیك بوو بوونەوە کە دەنگی سمی ئەسپەکان و گفتوگۆی هێواشی سوارەکان دەبیسترا، تەنانەت روخساریشیان بە ئاشکرا دەبینرا. لڤنسون هەستی بەسۆزو هەستیان دەکرد، بە تایبەتی ئەفسەرە کەتەکە کە پاپیێکی خستبووە نێو ددانەکانی و بەشێوەیەکی تا رادەیەك ناشیانە لەسەر زینەکە دانیشتبوو، و لە پێشەوە حەرەکەی دەکرد.



لڤنسون لەبەر خۆیەوە تێفکری: دەبێ چ جانەوەرێکی دڕندە بێ. نیگای لەسەر ئەفسەرەکە گیرسایەوەو بێ ئەوەی لە دەسەڵاتی خۆیدا بێ هەموو ئەو خەسڵەتە نزمانەی بە عادەت دەیدانە پاڵ دژمن، هەر هەمووی بە لایەوە دروست دەرچوون: دڵم چۆن لێدەدا! ئاه، ئاخۆ کاتی تەقە کردن نییە؟ وەختێتی؟ نا، با بگەنە ئاستی ئەو دار غانە پاك کراوە، بۆ وەکو کیسە لەسەر زینەکە پان بۆتەوە؟ هەر کە سوارەکان گەیشتنە ئاستی دارەکە، دەنگێکی تیژو ڕەوان فەرمانیدا:

هێز– زز– ا تەقە!

ئەفسەرەکە لە دەنگی لڤنسون ڕاپەڕی و سەری هەڵبڕی. بەڵام پاش تۆزێك کڵاوەکە لەسەری پەڕی و نائومێدیو ترسێکی لە وەسف نەهاتوو باڵی بەسەر روخساریا کێشا.

لڤنسون هەمدیس فەرمانیدا: تەقە! بە خۆیشی سێرەی لە ئەفسەرەکە گرت.

سوارەکان دووچاری پەشێویو سەر لێشێوان بوون. ژمارەیەکیان لە ئەسپەکانیان گل بوونەوەو کەوتنە سەر زەوی. بەڵام ئەفسەرەکە هەر لەسەر ئەسپەکەی بوو، ئەسپەکەی بە دەمی داچەقیوەوە ڕەوییەوە دوای چەند دەققەیەك پیاوانی ترس لێنیشتوو ئەسپانی ڕەواوە تێکەڵ بە یەکدی بوون. قوزاقەکان بە دەم هاوارەوە هەندێ شتیان دەگوت کە لەبەر هاڕەی گوللە نەدەبیسترا! پاشان سوارێك بە کڵاوو جبەی ڕەشەوە لە نێو ئەو پاشا گەردانییەوە دەرپەڕی و هاتە پێشی سوارەکانەوە، لە کاتێکدا بەزەحمەت جڵەی ئەسپەکەی بەرهەق دەکرد، شمشێرەکەی بە هەوادا با دەدا، پێ دەچوو، قوزاقەکان گوێیان لە فەرمانەکەی نەگرتبێ، لە ڕاستیا ژمارەکیان لەو دەمەدا بە چوار ناڵە فیراریان دەکردو ئەسپەکانیان بەر قامچییان دەدا، پاش تۆزێك پارتیزانەکان هێرشیان کردە سەریان. دەتگوت لە زەوییەوەهەڵقولان، بەدەم تەقە کردنەوەو بە پەلەو بێ پەرواییەوە دوایان کەوتن.

لڤنسون هاواری کرد: سواربن! باکلانوف –لێرەوە! بە سواری!.

روخساری باکلانوف گۆڕابوو، لەشی لەسەر ئەسپەکەوە بردبووە پێشەوە، بەرەو لای لڤنسون تاوی دا، شمشێرێك بە دەستییەوە بوو وەکو بلور دەدرەوشایەوە. دەستەکەی لڤنسون بە هاوارو زرنگە زرنگی پۆڵاو شمشێرەوە دوای کەوتبوو.

پارتیزانەکان هەر زوو قوزاقەکانیان ڕاونا.

متچیك لەگەڵ ئەم هێزەداو لە نێو شەپۆلی ئەم جەماوەرەوە تاوی دەدایە پێشەوە. ئێستا نەك هەر نەدەترسا. بەڵکو شێوازی بیرکردنەوە تایبەتییەکەی خۆیشی فەرامۆش کرد بوو.

پشتی زەلامێکی لەبەردەم خۆیەوە دەبینی کە قژەکەی بڵاوبوو بووە، دیمەنی زەلامەکەی بەلاوە ئاشنا بوو، دەیزانی دژمن لە هەڵاتندایە، ئەویش وەکو ئەوانی دی چ ئامانجێکی نییە جگە لەوەی لە دژمن نزیك ببێتەوەو لە زەلامە ئاشناکەی بەردەمی جێ نەمێنێ.

دەستە قوزاقەکان لە نێو بێشەیەکی چۆڵ دا وون بوون, پاش تۆزێك بە توندی کەوتنە تەقە کردن، بەڵام پارتیزانەکان کە گەرم بوو بوون، بێ خاو بوونەوە دوویان کەوتن و هەڵیان بڕین.



ئەسپێکی توکن کە لە بەردەم متچیکەوە غاری دەدا، لە پڕ گلاو بەسەرا کەوت، باڵی سوارەکەی سەری، لێك بڵاوبووەوە بەسەر سەرو کەللەی ئەسپەکەدا گل بووەوەو کەوتە سەر زەوی.
متچیك–ش وەکو ئەوانی دی بە تەنیشت جەستە رەشە گەورەکەدا، کە لە سەر زەوی تلی دەدا، پێچی کردەوەو رەت بوو.
متچیك کە چیدی پشتی زەلامە ئاشناکەی بەردەمی خۆی نەدەبینی، چاوی بڕییە دارستانێك کە بە خێرایی بەرەو لای ئەو دەهات. کابرایەکی ئەندام وردیلەی ریشن کە سواری ئەسپێکی رەش بوو بوو، وەکو بروسکە بە تەنیشتیا رەت بوو و بە هاوارەوە شتێکی گوت و بە شمشێرەکەی فەرمانیدا. ئەو سوارانەی کە شان بە شانی ئەو ئەسپیان تاو دەدا. بە خێرایی بە دەستە چەپا پێچیان کردەوە، بەڵام متچیك کە نەیدەزانی بۆ وایان کرد، بە چوار ناڵە تاوی داو بە نێو دارستانەکەدا تێی تەقاند. وەختێ کە خۆی بە قەدی درەختەکاندا دەدا، لقی رووتی درەختەکان دەمو چاویان دەڕوشاند، بە زەحمەت توانی "نیوکا" رابگرێتەوە.
نیوکا زۆر خراپ بریندار بوو بوو، متچیك بە تاقی تەنێ کەوتە نێو بێدەنگی ئاسایی دارستانی غان و چڕی گەڵای زەردو زێڕینی گیاکانەوە.
پاش تۆزێك بۆی دەرکەوت کە دارستانەکە پڕە لە قوزاق, کەئەمەی بینی قیژاندی و پەشۆکا، بێ گوێدان بە تیژی لق و پۆپی دەوەنەکان کە دەمو چاویان دەگەست, بە پەلە بەرەو دوا گەڕایەوە، وەختێ گەییە دەشتاییەکە، پارتیزانەکان رۆیی بوون، لەدووری دوو سەد هەنگاوێکەوە لاشەی ئەسپێکی زین خواری بینی کە لە سەر زەوی کەوتبوو، کابرایەك لە پاڵ ئەسپەکەدا ئەژنۆی خەمی گرتبووە باوەش و بەبێ جووڵە دانیشتبوو، ئەم کابرایە ماروسکا بوو.
متچیك کە لەو ترسەی دوایی خۆی شەرمەزار بوو، لێی چووە پێشەوە.
میشکا بەلادا کەوتبوو، ددانەکانی بە دەرەوە بوون، چاوە درشتەکانی بە جۆرێکی خەمناك ئەبڵەق بوو بوون، دەستەکانی بەسمە تیژەکانییەوە لە ئەژنۆوە نوشتا بوەوە، دەتگوت لە مردنیشا هەر ئامادەی غاردانە. ماروسکا بە نائومێدییەوە سەیرێکی کرد. چاوە لێڵەکانی وشك و سووتێنەر بوو.
متچیك لە بەرانبەری وێستاو بە ئەسپایی گازی کرد: ماروسکا! لە پڕ شەپۆلێکی میهرەبانی و بەزەیی وروژێن سەبارەت بە ماروسکاو ئەسپە تۆپیوەکەی، سەراپای بوونی داگرت.
ماروسکا لەجێی خۆی نەجووڵا، بۆ چەند لەحزەیەك هیچ یەکێکیان نە قسەیەکی کرد نە حەرەکەتێ.
پاشان ماروسکا ئاهێکی هەڵکێشا، بە ئەسپایی ئەژنۆکانی بەرەڵڵا کردو لەسەر هەردوو چۆکان دانیشت، بێ ئەوەی سەیری متچیك بکات، دەستی بە کردنەوەی زینەکە کرد. متچیك دەترسا دەست بە قسان بکاتەوە... بە بێدەنگییەکی تەواو سەیری ماروسکای دەکرد. ماروسکا کەوتە کردنەوەی قایش و قروشی زینەکە، قایشێکیان پچڕابوو. ماروسکا بە وردی چەرمە پچڕاوەکەی تاقیکردەوە، قایشەکە بە خوێنەوە بوو، تۆزێ پەنجەی تێ وەرداو توڕیدا، پاشان



بە دەم بۆڵە بۆڵەوە زینەکەی بە شانیا داو بە کۆمە کۆمو لاقی خوارەوە بەرەو دارستانەکە رۆیی. متچیك لە دواوە هاواری کرد: با من بیهێنم، یان حەز دەکەی ئەسپەکەمت دەدەمیٚ و من بە پێیان دێم.

ماروسکا ئاوڕی نەدایەوە، پتر لە ژێر قورسایی زینەکەدا کۆمایەوە.

متچیك لەبەر هەندیٚ هۆ دەیوست خۆی لە ماروسکا دوور بگریٚ، بۆیە بە دەستە چەپا پێچی کردەوە، وەختیٚ لە دارستانەکە دەرچوو، گوندێکی نزیکی بەدی کرد، بە دەستە راستا، کە دۆڵێکی درێژ تا زنجیرە شاخێك دادەکشاو لە دوور ون دەبوو، دیمەنی دارستانێکی بەرچاو کەوت. ئاسمانی دەمەو بەیان ساف و رۆشن بوو، بە جۆرێکی تاقەت بەر لە نزمییەوە بەسەر سەریانەوە راوەستا بوو. هەتاو بە ئاستەم دەبینرا.

پەنجا هەنگاوێك لەو لایەوە، لاشەی ئەو قوزاقانەی بە زەبری شمشێری پارتیزانەکان کوژرابوون، لەسەر عاردی کەوتبوون، یەکێکیان هێشتا نەمردبوو، پەیتا پەیتاو بە زەحمەتێکی زۆرەوە هەڵدەسایە سەردەستەکانی و دووبارە دەکەوتەوەو دەیناڵاند. متچیك لە دووری کابرای بریندارەوە رەت بوو، هەوڵیدا گوێچکەکانی لە ئاستی ناڵەی ئەو دابخات. ژمارەیەك لە پارتیزانەکان لە گوندەکەوە بە سواری بەرەو رووی ئەو دەهاتن.

متچیك کە گەییە نزیکی پارتیزانەکان، گوتی: ئەسپەکەی ماروسکایان کوشتووە.

چ کەسێك وەڵامی نەدایەوە. یەکێکیان بە گومانەوە سەیری کرد، وەك بڵێی بیەویٚ بپرسێت: کاتیٚ کە ئێمە لێرە شەڕمان دەکرد، جەنابت تەشریفی لە کویٚ بوو؟ روخساری ئەو پیاوە خەمو زەحمەتێکی زۆری پێوە دیار بوو، متچیك بە سواری تێپەڕی و دڵی خەبەری رووداوی شوومی دەدا.

وەختیٚ متچیك گەییە گوندەکە، ژمارەیەکی زۆر لە پارتیزانەکان جێیان خۆش کردبوو و ئەوانی دی لە پاڵ کوختێکی گەورەی پەنجەرە زل وێستا بوون. لڤنسون بە کڵاوە خوارەکەیەوە، کە لە ئارەقەو چڵکنی دا غەرق بوو بوو، لەبەر هەیوانێك وێستا بوو و فەرمانی دەدا، متچیك لە نزیکی پەرژینەکە، لەو شوێنەی کە ئەسپەکانیان لیٚ راگرتبوو، دابەزی.

سەر دەستەبە شێوەیەکی تانە ئامێزەوە لێی پرسی: ئەوە لە کویٚ غەیب بوو بووی؟ خەریکی کارگ کۆکردنەوە بووی یان؟.....

متچیك گوتی: نەخێر، تۆو هاورێکانم گوم کرد. متچیك نەیدەزانی چ بیرێك دەربارەی ئەو دەکەنەوە، تەنیا بە حوکمی عادەت هەوڵی دەدا خۆی تەبریٚ بکات، وەختیٚ من چوومە نێو دارستانەکەوە، وابزانم ئێوە بە دەستە چەپا پێچتان کردەوە.

پارتیزانێکی گەنج، کە قژەکەی جوان رێك خستبوو و رێك دای هێنا بوو و پەرچەمێکی پۆپنە کەڵەشێر ئاسای بەردابۆوە، هاواری کرد: دروستە بە دەستە چەپا... من گازم کردیت بەڵام وابزانم تۆ گوێت لیٚ نەبوو. ئەمجا لە کاتێکدا بە شادییەکی ئاشکراوە وردو درشتی چۆنیەتی راونانی قوزاقەکانی وەبیر خۆی دەهێنایەوە، بە پەلە بۆ لای متچیك گەڕایەوە، متچیك ئەسپەکەی بەستەوەو لە پاڵ ئەودا "کوڕە گەنجەکە"دانیشت. کوبراك بە خۆی و دەستەیەك



پارتیزانـەوە، لـە کۆڵانێکـەوە دەرچـوو، دوو پیـاوی لـە پشـتەوە دەسـت بەسـتراویان بـەرەو کوختەکە دەهێنا. یەکێکان جبەیەکی رەشی لەبەر بوو. سەری تەخت و کرێت بوو. دەتگوت بە شێوەیەکی نا رێك خوێیان پێوە پرژاندووە, کابرا هەڵدەلەرزی و لە زەلامەکانی دووروبەری دەپاڕایەوە.

ئەوی تریان کەشیشێکی لاواز بوو، جبەیەکی شڕی لەبەر بوو، کە لە ژێرییەوە پانتۆڵە چرچ و لۆچەکەی و پێش بەندی رەشی تایبەتی کەشیشان دەبینرا. کە متچیك سەرنجیدا بینی زنجیرێکی زیوین، کە بێگومان لە خاچێك کرابۆوە، بە پشتی کوبراکدا شۆڕ بوو بۆوە.

وەختێ ئەو دوو زەلامەیان بەرەو هەیوانەکە بکێش دەکرد، لڤنسون، بە نیگەرانی و رەنگی پەڕیووەوە ئیشارەتی بۆ لای زەلامە جبە رەشەکە کردو گوتی: ئەمە خۆیەتی؟

جووتیارەکان تێکڕا هاواریان کرد: خۆیەتی، هەمان پیاوە!

ستاشینسکی لەسەر تەیمانەکەو لە تەنیشت لڤنسون-ەوە وێستا بوو لڤنسون پێی گوت: ئەم بودەڵەیە! خۆ تازە متلیستاش زیندوو نابێتەوە. لڤنسون کە خێرا خێرا چاوەکانی دەتروکاند، رووی وەرگێڕا، چەند لە حزەیەك بێدەنگ بوو، هەوڵی دەدا بیر لە متلیستا نەکاتەوە. کابرای زیندانی کە چەشنی سەگ جارێ سەیری لڤنسون-ی دەکردو جارێ سەرنجی جووتیارە هەژارەکانی دەدا، بە گریانەوە دەپاڕایەوە: هاوڕێیان! هاوڕێیانی ئازیز!.... ئێوە لاتان وایە ئەم کارەم بە ئارەزووی خۆم کرد؟ ئاه، خوایە! هاوڕێیانی ئازیز!

جووتیارەکان روویان لێ وەرگێڕاو گوێیان بەگریان و پاڕانەوەکەی نەدا.

یەکێك لە جووتیارەکان بە قێزەوە تەماشای کردو بە رەقی گوتی: ئەوە چ دەڵێی؟ خۆ خەڵکی گوند هەموو بە چاوی خۆیان دیتیان کە منداڵەکەت ناچار دەکرد شایەتی لێ بدات.

جووتیارێکی دی کە لە شەرمەزاریدا سەری داخستبوو، گوتی: خەتای کەس نییە، خەتای خۆت نەبێ!

لڤنسون بە ساردییەوە گوتی: تیربارانی بکەن، بەڵام کەمێ بیبەنە ئەولاترەوە!

کوبراك پرسی: ئەدی کەشیشەکە؟ ئەمیش قەحپەیەکە- میوانداری ئەفسەرەکەی کردووە.

-لێی گەڕێن با بڕوات- ملی خۆی بشکێنێ و بچێ بۆ دۆزەخ!

وەختێ کوبراك کابرای بە تۆبزی بۆ ئیعدام کردن رادەکێشا، کۆمەڵێك لە جووتیارەکان دووی کەوتن. کابرا چەناگەی دەلەرزی و بە شیوەن و گریانەوە پێیەکانی لە عاردی دەچەقاند.

سیسکین بە کلاوە چڵکنەکەیەوە و بە روو خۆشییەوە بەرەو لای متچیك رۆیی و بە شادییەوە گوتی: ئەهای! ئەوە لێرەی! هەموو گیانت بە خوێنەوەیە بڕۆ با بڕۆین خۆراکێ پەیدا بکەین. ئێستا ئیشی یارۆ دەبینن. سیسکین بە ماناوە وشەکانی درکاندو فیکەیەکی کێشا.

ئەو کوختەی کە نانیان لێ خوارد، شوێنێکی پیس و بۆگەن بوو، بۆنی نان و وردە کەلەرمی لێدەهات، دەوروپشتی سوپاکە پڕ بوو لە زڕو زبڵ و سەرە کەلەرم. وەختێ سیسکین نانەکەی بە شۆربای کەلەرمەوە قوت دەدا، یەك وچان باسی ئەو کارە دیارانەی دەکرد کە ئەنجامی داون و بۆ خۆی لاف و گەزافی لێدەداو هەموو دەققەیەکیش لە ژێرەوە تەماشای ئەو کیژەی دەکرد کە



خزمەتی دەکردن، کیژەکە، کیژێکی قشتیلەی خرپن بوو، جووتێ پرچی هۆنراوەی درێژی بەردا بۆوە، بە کەیف و بە دەماخ دیار بوو. متچیك هەوڵی دەدا تەماشای سیسکین نەکات، بەڵام هەمیشە گوێ قوڵاخ بوو، بچووکترین دەنگ و سرتە دەی لەرزاند، سیسکین بە دەم پارو قوتدان و هەناسە سوار بوونەوە گوتی: کاتێکم زانی گەڕایەوەو سێرەی لێ گرتم. بەڵام مۆڵەتم نەداو لەسەر عاردەکە تەختم کرد.

لەم دەمەدا لە دوورەوە دەنگی دەستڕێژی گوللە هات. شوشەی پەنجەرەی کوختەکە لەرییەوە. متچیك راپەڕی، رەنگی زەرد بوو، کەوچکەکە لە دەستی کەوت.

دەمو چاوی خستە نێو دەستی و بە غاردان لە کوختەکە دەرچوو و بە نائومێدییەوە هاواری کرد: ئەم کارانە دواییان نییە!! لە نێو پوشەکاندا درێژ بوو، دەمو چاوی بە یەخەی چاکەتەکەی داپۆشی، بە خۆشی نەیزانی چۆن گەییە ئەوێ، لەبەر خۆیەوە تێفکری: کابرا جبە رەشەکەیان کوشت، بەم زووانە بە هەمان ئاسانی منیش دەکوژن، بەڵام ئاخۆ لە راستیا من زیندووم؟ رەنگە منیش بە هەمان ئاسانی بکوژرێم، ئیدی خۆشەویستان هەرگیز نابینمەوە... ئەو کیژە جوانەی کە وێنەکەیم دڕاند... بە قژە پڕ چین و ئەڵقەکەیەوە... ئەو پیاوە جبە رەشە بەستەزمانە، دەبوایە دادو فریادی بکردایە... ئاه، خوایە، بۆ وێنەکەیم دڕاند؟ ئایا ئیدی قەت نایبینمەوە؟ چەند پەرێشانم!

وەختێ لە نێو پوشەکانەوە دەرچوو، شەو بوو، چاوەکانی مات و نیگای خەمبار بوو. لە شوێنێکەوە، کە پێ دەچوو زۆر نزیك بێ، دەنگی مەستانەی هەندێ ئاوازی بێ سەروبەر دەهات، یەکێك ئۆکردوێنی لێدەدا، لەبەر دەرگاکەدا تووشی کیژێکی باڵا بەرزی پرچ هۆنراوە بوو، کیژەکە جووتێ سەتڵی کرد بوو بەم سەرو ئەو سەری دارێکاو خستبوویە سەر شانی و وەکو لقێکی تاقانە لە ژێر قورسایی سەتڵەکاندا نەوی بوو بۆوە. بە دەم پێکەنین و چاو هەڵبڕینەوە گوتی: ئاه، باشە تۆش بچۆ سەیر بکە، یەکێك لە هاوڕێکانی ئێوە لەگەڵ گەنجانی گوندەکەماندا سەرگەرمی شادییە، گوێ بگرە —دەژنەوی؟ دەست بەجێ بەنازەوە سەرە چکۆڵەو جوانەکەی بەرەو دەنگێکی گۆشەیەکی مەیدانەکە وەرگێڕا! سەتڵەکان جوڵانەیان دەکرد، ئاوەکەی نێو، سەتڵەکان شەپۆلی دەدا، کیژەکە بە شەرمەوەو بە پەلە بەرەو دەرگا چوو.

دەنگێکی مەستانە بە ئاوازەوە شیعرێکی گوت کە متچیك ئەو شیعرەی لەبەر بوو: هەر شایانی ئێمەی دیلە...!

متچیك بە وردی دیقەتی گۆشەی مەیدانەکەیدا، سەیری کرد ماروسکا ئۆکوردێونی لێدەدا، قژە لوولەکەی بەسەر چاویا رژابوو و بە گۆنا ئارەق کردوو سوور هەڵگەڕاوەکانییەوە نووسا بوو.

ماروسکا بەدەم لەتر دانەوە بە ناوەندی کۆڵانەکەدا دەڕۆیی و بە هەموو هێزێکییەوە ئۆکوردێوینی لێدەدا. هەموو ئەو کارانەی بە جۆرێ دەکرد، وەك ئەوەی بە ناشیرینی کارەکانی خۆی بزانێ و لێیان ژێوان بێ، کۆمەڵێك خەڵکی بێ پشتێن و سەرکۆت و مەستی خۆی ئاسا شوێنی کەوتبوون. منداڵانی زیتەڵەو پێ پەتی وەکو مەیمون دەم لاسێکیان دەکردەوەو خۆڵیان



به حەوادا دەکردو خەریکی کەیف و خۆشی و هەڵبەزو دابەز بوون. ماروسکا هەر کە متچیکی بینی بە شادییەکی ریا کارانەوە هاواری کرد: هێی، دۆستی ئازیز! بۆ کوێ دەچی؟ نارەحەت مەبە– عەزێتت نادەم مەی دەخۆیتەوە، نەفرەتت لێ بێ! بە هەر حاڵ هەموومان پێکەوە دەمرین!.

هەموو حەشاماتەکە لە دەوری متچیك خڕبوونەوە، رووی خۆش و مەستانەیان کردە ئەو. هەناسەیان دەکردە دەموچاویا، یەکێکیان نیو قاپ عەرەق و ئارووپەکی خستە دەستییەوە.

متچیك کە هەوڵی دەدا خۆی لە دەستیان دەرباز بکات، گوتی: نا، نا، من مەشروب خۆر نیم، حەز ناکەم کە....

ماروسکا بە کەیفە کەرانەیەکی مەستانەوە هاواری کرد: بخۆ, نەحلەتی خوات لێ بێ... ئەی خوا.... ئەی مەسیح... ئەی دایکی موقەدەس!... ئێمە هەموومان پێکەوە دەکوژرێین!.

متچیك کە چاری نەما، گوتی: کەواتە یەك تۆزێ، تکا دەکەم، خۆتان دەزانن من ناتوانم بخۆمەوە.

چەند مژێکی لە قاپێك خواردەوە. ماروسکا تا توانی ئوکۆردیۆنەکەی کردەوەو بە دەنگێکی ناساز دەستی بە گۆرانی گوتن کرد، ئەوانی تریش لەگەڵیا دەستیان پێکرد.

یەکێکیان باوەشی بە متچیك دا کردو گوتی: لەگەڵ ئێمەدا وەرە. ئەمجا بە منگە منگەوە پارچە شیعرێکی بە گۆرانی گوت: ئێرە جێگای ژیانی منە! ئەوجا دەمو چاوە تووکنەکەی بە گۆنای متچیکەوە نووساند.

بەدەم شۆخی کردن، سەگ ترساندن و جنێودان بە ئاسمان –بەو گومەزە رەشە بێ ئەستێرەیەی کە بەسەر سەیانەوە بوو– بە خۆیان، بەم دنیا فانییەو بە دایکی خۆیان... بە جادەکەدا دەرۆیشتن.







## گوڵاو

ڤاریا لە هێرشەکەدا بەشدار نەبوو، لە دارستانەکەدا، بە دیار بنەو بارگەی لەشکرەکەوە مابۆوە، وەختێ گەییە گوند سەیری کرد هەموو پارتیزانەکان لە ماڵە جووتیارەکاندا جێیان خۆش کردبوو، سەری کرد پارتیزانەکان بەپێی دەستە بەسەر کوختەکاندا دابەش نەبوون، دەستەکان تێکەڵن و کەس ئاگای لە کەس نییەو گوێ بە فەرمانەدەکانیش نادەن —بە راستی هەر هەموو هێزەکە بووە بە دەستەی سەربەخۆ. ڤاریا لە رێگادا کەلاکی ئەسپەکەی ماروسکای بینی بوو، بەڵام کەس هەواڵی ئەسەحی نەدا بوویێ کە ماروسکا چی بەسەر هاتووە، هەندێ دەیانگوت کوژراوە— بە چاوی خۆیان دیتویانە، جونێکی دی دەیانگوت هەر بریندار بووە، جونێکی دی لە چارەنووسی بێ خەبەر بوون. لە پڕ بە دەنگی بەرز باسی بەخت و نێوچەوانی خۆیان دەکرد کە چۆن لە مۆڵەق رزگار بوون. هەموو ئەو بەزم و رەزمە سەرگەردانی ڤاریای زیاتر دەکرد، ئەو سەرگەردانیەی لە دەمی هەوڵدانی بێ هودەیەوە بۆ متچیك، تووشی بوو بوو.

ڤاریا ئەوەندە لە خۆ نواندنی عاشقانەی پیاوان، لە برسێتی و لە بیرە بێزارکەرەکانی خۆی وەڕس و بێ تاقەت بوو، تەنانەت توانای ئەوەی نەما بوو کە بە چاکی خۆی لەسەر زینەکەی رابگرێ، گریان بینی گرتبوو، لەنکاودا تووشی دوبوف بوو. دوبوف یەکەم کەس بوو کە بە راستی ڤاریا بە دیتنی خۆشحاڵ بوو. دوبوف بە پێکەنین و هاوخەمییەوە پێشوازی کرد.

روخساری دوبوف لە جاران پیر تر دەینواند، سمێڵە رەشەکانی توزای بوو بوو، روخساری ئاشناو درشت و خۆشەویستی باقی یارانیش لە هی دوبوف چاکتر نەبوو. ڤاریا کە ئەو دیمەنانەی بینی، چەشنە هەستێك سەراپای داگرت و دڵی گوشی، هەستی دڵسۆزی و خەمباری. هەستی پتر. خۆشەویستی پارتیزانەکان، هەستی بەزەیی بە خۆ هاتنەوە سەراپای داگرت و دڵی گوشی. ڤاریا کە ئەوانی بینی دنیای بیرەوەرییەکان هاتەوە سوێ... بیرەوەری رۆژانی گەنجی، ئەو رۆژانەی کە کیژێکی جوانکیلەو چاپوك بوو، پرچی نەرم و ناسك دەوری شان و ملی دابوو، ئەو رۆژانەی کە عارەبانە دەستییەکانی بە نێو ڕاڕەوە تاریکەکانی مەعدەندا داژۆت، ئەو رۆژانەی کە لە کۆڕی شەواندا سەمای دەکردو بە چاوە درشت و ئارەزوو بزوێنەکانی هەمان ئەم روخسارانەی لە دەوری خۆی خڕ دەکردەوە.

ڤاریا لەو ساوە کە لەگەڵ ماروسکادا بەشەڕ هات، تا رادەیەك لە وان دا بڕابوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانی بە تاقە یارانی نزیکی خۆی دەزانی —ئەو مەعدەنچییانەی کە زەمانێ لەگەڵیا ژیا بوون و عەشقبازیان لەگەڵ کردبوو. بە میهرەبانی و پەشیمانییەوە لەبەر خۆیەوە تێفکری: لەو زەمانەوە کە ئەوانم دیتووە، چ رۆژگارێ تێپەڕیوە! خۆ خەریك بوو لە بیرم دەکردن. ئاه، ئازیزانی من!.... لا جانگەکانی دایانە ژان، فرمێسك زابیە چاوی، بە هەزار حاڵ تا توانی جڵەوی فرمێسکەکانی بگرێ.



دوبوف تەنیا کەسێك بوو، کە ئەندامی دەستەکەی خۆی بە رێك و پێکی و لە چەند کوختێکی نزیکی یەکدا دامەزراند بوو، ئەندامانی دەستەکەی لە دەوروبەری گوندەکەدا حەرەس بوون، هەروەها لە کۆکردنەوەی ئازووقەو پێداویستییەکاندا یارمەتی لڤنسون یان دەدا، ئەو حەقیقەتەی کە جاران کەوتبووە ژێر پەردەی ئەستووری رووداوەکان و کاری ئاسایی رۆژانەوە، گوایە هەموو ئەندامانی هێزەکە رۆڵی یەکسانیان تێدا دەبینی, ئەو رۆژە بە تەواوی ئاشکرا بوو: کە تومەز هەر دەستەکەی دوبوف بووە کە یەکێتی تەواوی هێزەکەی دەپاراست.

ڤاریا لەیارانی سەردەمی مەعدەنی ژنەوت کە ماروسکا لە گوێز ساغ ترەو تەنانەت برینداریش نییە، ئەسپە تازەکەی ماروسکایان، کە لە گاردی سپی گرتبوویان، بە ڤاریا نیشاندا، ئەسپێکی سورخنی لاق درێژ بوو... هەر لە ئێستاوە ناوی ئەسپەکەیان نابوو یەهودا.

ڤاریا بە خەیاڵی پەرێشانەوە روانییە ئەسپەکەو لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: باشە، کەواتە زیندووە... زۆر خۆشحاڵم.

پاش شیو خواردن، خۆی گەیاندە سەر خەرمانە کایەك و لەسەر کایە بۆن خۆشەکە راکشا- بە ترسەوە گوێی هەڵخستبوو کە نەبادا یەکێك لە کۆنە دۆستان لەسەر کایەکەوە بێتە لای، هەمدیس بە هەستی گەرم و شیرین و سوکنایی بەخشەوە ئەوەی بیر خۆی خستەوە کە ماروسکا زیندووە. بەدەم ئەم بیرە سوکنایی بەخشەوە خەوت، لەپڕ بە شپرزەییەکی زۆرەوە لە خەو راپەڕی، دەستەکانی لەسەرما تەزی بوون، تاریکە شەوێکی بێ پایان لە نێو کادێنەکەوە گەمارۆی دابوو، بایەکی سادر لق و پۆپی درەختەکانی را تەکاند، کایەکانی پەرت کردەوە، گەڵای درەختی نێو باخەکەی هێنایە خشەخش، ڤاریا بە ترسەوە بیری کردەوە: خوایە! ماروسکا لە کوێیە؟ ئەوانی دی دیارن؟ هەمدیس دەبێ بە تاقی تەنێ لەم کادێنەدا بمێنمەوە؟

ڤاریا بەدەم هەڵ لەرزینەوە بزمەکانی داخست، جڵەکانی لەبەر کردو بە پەلە بە سەر کایەکدا داگەڕا، وەختێ گەییە نزیکی دەرگای کادینەکە، پاسەوانێ لە تاریکییەکەوە دەرکەوت.

کە نزیك بۆوە ڤارا پرسی: کێ حەرەسە؟ کوستیا، ماروسکا گەڕاوەتەوە؟

کوستیا بە کەسەرێکی زۆرەوە پرسی: ئەوە تۆ لە کادێنەکەدا خەوتبووی! غەدرت کرد، من نەمزانی.... چاوەڕێی ماروسکا مەکە- خەریکی کەیفی خۆیەتی. لەسوێی ئەسپەکەی ئەوەندەی خواردۆتەوە ئاگای لە خۆ نییە. سەمارت نییە؟ شقارتەت پێیە؟

ڤاریا دەستی بە گیرفانەکانیا گێڕاو شقارتەیەکی دایێ. کوستیا تەڵێ شقارتەی داگیرساند، لە نێو هەردوو دەستە لیرەکەیدا رایگرت و بەرەو رووی ڤاریای برد.

بە دەم پێکەنینەوە گوتی: ئێژی حاڵت باش نییە کیژێ! ڤاریا, یەخەی پاڵتۆکەی هەڵدایەوەو بە نێو دەرگاکەدا رەت بوو: شقارەتەکە بۆ خۆت.

- کێوە دەچیت؟
- دەچم ماروسکا دەبینمەوە.
- ماروسکا؟ باشە، باشە! ئەدی نابێ من لەبری ئەو.... ها؟
- نا، پێم وانییە بتوانی.





– هم، نۆبەتی ئەو قەوانەیە!

ڤاریا وەڵامی نەدایەوە. پاسەوانەکە لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەمە یەکێکە لە ئێمە... چەند کیژێکی ڕەندە!

دنیا ئەوەندە تاریك بوو، ڤاریا بە زەحمەت ڕێی دەکرد، بارانێکی ورد دەستی پێکرد، خشە خشی باخان مرۆڤیان پەرێشان و بێ تاقەت دەکرد، توتەڵە سەگێك لە سووچێکا و لەبن پەرژینێکا دەیویقاند. ڤاریا لەو تاریکییەدا بۆی دەگەڕا، دۆزییەوە، خستییە باوەشی و پاڵتۆکەی بە سەریادا. ئەو حەیوانە بەستەزمانە لەسەرماندا هەڵدەلەرزی و قەپۆزی لە سنیگی ڤاریا هەڵدەسوو، ڤاریا، لە نزیکی کوختێکا تووشی پاسەوانێکی دەستەکەی دوبوف بوو– پرسیاری شوێنی ماروسکای لێکرد، پاسەوانەکە، ڤاریای بەرەو لای کڵێساکە نارد، ڤاریا بە سەرگەردانی نیوەی گوندەکەی دایە ژێر پێوەو بێ ئەوەی ماروسکا بدۆزێتەوە، بە نائومێدی گەڕایەوە.

ئەوەندەی ئەم کۆڵان و ئەو کۆڵان کرد، ڕێگاکەی گوم کرد، سەرگەردان و بێ مەبەست خۆی دایە دەم هەنگاوەوەو بە توندی توتەڵە سەگەکەی– کە هەنووکە گەرمی بوو بۆوە– بە سینگی خۆیەوە دەگوشی، پاش یەك سەعات سەرگەردانی گەیشتە ڕێیەك بۆ ئەو کوختانە دەچوو کە دەستەکەی دوبوڤ لێ بوون. ئیدی لەوێوە کەوتە ڕێ. بۆ ئەوەی نەخزێ دەستەئازادەکەی بە پەرژینەکەوە دەگرت، هێشتا چەند هەنگاوێ نەڕۆیی بوو کە لە دوورەوە ماروسکای بەدی کرد.

ماروسکا بە دەما کەوتبوو، سەری خستبووە نێو هەردوو دەستی و لە پاڵ پەرژینەکەدا دەینالاند، تازە ڕشابۆوە. ڤاریا هێشتا بە دروستی ماروسکای نەناسیبۆوە، کە بە هەست زانی خۆیەتی، چونکە ئەمە یەکەمجاری نەبوو، کە ماروسکای بەو حاڵەوە دەبینی.

ڤاریا بە سەریا دانەوییەوە، دەستە نەرمو میهرەبانەکانی خستە سەر شانی و بەناوی خۆیەوە گازی کرد: ڤانیا! بۆ لێرە خەوتووی؟ زۆر ناڕەحەتی،ها؟

ماروسکا سەری هەڵبڕی. ڤاریا کە چاوی بە ڕەنگ و ڕوخساری هەڵپەنماوو بێ گیانی کەوت، دڵی پێی سوتا –ماروسکا زۆر لاوازو کەم جورم دەینواند، کە ڤاریای ناسییەوە لە قاقای پێکەنینیدا، زوو بەسەر خۆیدا زاڵ بوو، هەستاو دانیشت، لاقەکانی ڕاکێشاو پشتی بە پەرژینەکەوە دا.

بە دەنگێکی کزو بڕێ وشەی نامەفهومو مەستانەوە گوتی: ئەها تۆیت، ئیحتراماتت عەرز دەکەم!....

ڤاریا بە هەمان ڕیتمی دەنگی ماروسکاوە گوتی: سڵاوی من لە تۆ، هاوڕێ ماروسکا!.....

ڤاریا دەستی گرت و گوتی: هەستە با بڕۆین ڤانیا! ڕەنگە نەتوانی ڕێ بکەیت؟ کەمێ سەبر بکە، ئێستا بە دەقیقەیەك هەموو شتێك تەگبیر دەکەم، هەنووکە یەکێك خەبەر دەکەمەوە... ڤاریا پشتی ڕاست کردەوە، دەیویست ماروسکا بەرێ بکات بۆ یەکێك لەو کوختە نزیکانە، بەڵام دوو دڵ بوو لەوەی کە ئاخۆ خەبەر کردنەوەی پیاوانی غەریبە لەم تاریکە شەوەدا کارێکی دروستە



یان نا! باشە وەختێ ئەو لەگەڵ پیاوێکی مەستا ببینن کە دەچێتە کوخێکەوە، چی دەڵێن! ڤاریا قەت دەربارەی چ مەسەلەیك بەم چەشنە بیری نەکردبۆوە.

بەڵام ماروسکا لە نکاودا بەترسەوە سەری باداو بە تووڕەییەوە نەڕاندنی: نا، نا، نا!... نەخەڵەتابی ئەوانە بێدار بکەیتەوە، ئەگینا منیش پێت نیشاندەدەم! بێدەنگ بە!... ئەمجا مشتەکانی بەسەر سەریا را وەشاند، ڤاریا وای دەزانی کە ماروسکا لە ترساندا بە هۆش هاتەوە:

– گونجارنکو لەوێیە. نازانی؟ .... چ دەکەی؟

– باشە چی لیّ بکەم؟ ئەو چ پێوەندی بە کاری ئێمەوەیە...

ماروسکا نێو چەوانی بە یەکا داو چنگی خستە قژی: تۆ نازانی... ئەو وا دەزانیّ من زۆر پیاوم... ئاخر ئیدی بە چ روویەکەوە... چۆن دەتوانم.... نا، نابیّ ئەم کارە بکەیت....

ڤاریا هەمدیس بەسەریا دانەوییەوەو گوتی: چ گەوجانە قسان دەکەی، عەزیزم تۆ سەیرکە، خەریکە باران دەباریّ، ئێرە شێدارە، ئاخر سبەی حەرەکت دەکەین و دەڕۆین– لەگەڵما وەرە عەزیزم!

ماروسکا بە هێمنییەکی خەم ئامێزەوە گوتی: من پیاوێکی بیّ کەڵکم! بە کەڵکی چی دێم، من کێم، چ کارەم، بۆ دەژیم؟ هاوڕێیان باش بیری لیّ بکەنەوە!....

بە چاوانی تەژی فرمێسك و ئاوساوەوە نیگایەکی بەزەیی وروژێنی بەدەوروبەری خۆیدا گێڕا. پاشان ڤاریا لەبەر دەمیا دانیشت، بە دەستە ئازادەکەی بە جۆریّ لە ئامێزی گرت، خەریك بوو برژانگەکانی بەر لێوی ماروسکا بکەویّ، بە دڵسۆزی و میهرەبانییەکی ئەوتۆوە، وەك بڵێی منداڵێك بلاوێنیّ، کەوتە لاواندنەوەی.

– بۆ ئەوەندە خەفەت دەخۆی؟ نیگەرانی ئەسپەکەتی، ئا؟

خۆ ئەسپێکی تریان داویتیّ –ئەو ئەسپە چاکەش! خەم مەخۆ ئازیزم، مەگری! تۆ سەیر سەیر، سەیری ئەم توتەڵە چکۆڵەیە بکە، دۆزیمەوە، تەماشای ئەم توتەڵە چکۆڵە جوانەبکە! ئەوجا یەخەی پاڵتۆکەی لاداو توتەڵە خەواڵوکەی پیّ نیشاندا. ڤاریا بە جۆریّ ئاڵۆوشی تیّ کەتبوو، دەتگوت گشت زەڕەیەکی لەشی تامەزرۆو شەیدای دەست لەملانیّ بوو بوو.

ماروسکا گوێچکەی توتکەکەی گرت و بە خۆشەویستییەکی مەستانەوە گوتی: ئاه، ئاه، کە چکۆڵەیە! لە کویّ دۆزیتەوە؟ گاز دەگریّ،هەی سەگ بابی چکۆڵە!

– یاللا عەزیزم، هەستە با بڕۆین!

ماروسکای هەستاندە سەر پیّ، بەدەم لاواندنەوەو ناز هەڵگرتنییەوە، هەوڵی دەدا بیرە نا رەحەتەکانی لیّ بتارێنیّ، بەرەو ماڵەکە بردی. ماروسکا لە عینادی کەوت و گویّ رایەڵانە خۆی بە ڤاریا سپارد.

ماروسکا بە درێژایی ڕێگا، کەم و زۆر نێوی متچیکی نەهێنا، ڤاریاش کەمو زۆر باسی نەکرد، دەتگوت هەرگیز متچیك ناوێك لە نێوانیاندا نەبووە، بەڵام هەر زوو ماروسکا خیشی کردو کپ بوو، بە پەلە دەهاتەوە سەرخۆ.



وەختێ گەیشتنە ئەو خانووەی دوبوڤ تێدا بوو. ماروسکا دەستی بە موحەجەرەکەوە گرت و هەوڵیدا سەر بکەوێ و بچێتە کادێنەکەوە، بەڵام لاقەکانی لە دووی نەدەچوون.

ڤاریا پرسی: یارمەتیت بدەم؟

ماروسکا لە کاتێکدا دەیویست پەرێشانی خۆی وەشێرێ بە تووڕەیی وەڵامی دایەوە: نە، قەحپە! بەخۆم دەڕۆم!

– کەواتە زۆر چاکە خوا حافیز!

دەستەکانی ماروسکا خاو بوونەوە، بە ترسەوە سەیری ڤاریای کرد: یانی چی– خوا حافیز؟

ڤاریا بە خەمباری و بە پێکەنینێکی ناچارییەوە گوتی: یانی خوا حافیز!.

کوت وپڕ دوای ڤاریا کەوت، باوەشی پێدا کردو گۆنای بە گۆنایەوە گوشی، ڤاریا هەستی کرد، ماروسکا دەیەوێ ماچی بکات. ماروسکا هەر چەندە شەرمی دەکرد لەم کارە، بەڵام هەر ئەنجامیدا، مەعدەنچیان بە دەگمەن کچانیان رادەموسی، تەنیا لەگەڵیاندا دەخەوتن. ماروسکا لە هەموو ژیانی خێزاندارییاندا تەنیا جارێك ڤاریای ماچ کردبوو، ئەویش لە ئاهەنگی زەماندەکەیاندا بوو، ماروسکا مەست بوو و خەڵکەکەی دەوروبەر هاواریان لێدەکرد: ماچی کە، بووکێ ماچ بکە!

ماروسکا کە کەمێك دامرکایەوە، سەری خستە سەر شانی ڤاریاو ئەنجام خەوی لێکەوت ڤاریا بە خەم و کەسەرەوە بیری کردەوە: هەمان تاسو هەمان حەمام. ئێژی چ شتێك رووی نەداوە، دیسان هەمان رێگا، هەمان مەیدان، هەمدیس بەرەو هەمان ئامانج... بەڵام خوایە گیان چ لەزەتێك لەمەدا هەیە!

ڤاریا پشتی کردە ماروسکا، چاوەکانی لێك ناو لاقەکانی راکێشا، بەڵام ئەو شەوە خەو نەچووە چاوانی. پاسەوانەکان لە پشتی گوندەوە لەسەر شاڕێی ناوچەی خوانیخدزاوە حەرەسیاتیان دەگرت، سێ تەقە، وەکو نیشانەی خەتەر، کران.

ڤاریا مارۆزکای خەبەر کردەوە. هێشتا ماروسکا سەرە گڤنەکەی بەرز نەکردبۆوە کە دەنگی تازەی تەقەکردنی حەرەسەکان هات, دوا بە دوای ئەم تەقەیەو لە پڕ هاڕەی رەشاشێك گورگ ئاسا لوراندی و بێدەنگی و تاریکییەکەی لێك ترازاند و وەڵامی یەکەم تەقەکردنی دایەوە.

ماروسکا بە ئازارو سەربادانەوە دوای ڤاریا کەوت و بەقاڵدرمەکانا دابەزی. باران وەستابوو. بەڵام بایەکە توندی کردبوو. دەرگایەك بەتوندی داخرا, گەڵای زەردو تەڕ بە ئاسمانی تاریکدا پەرت بوونەوە. هەندێ تیشك لەنێو تاریکییەکەوە دەبریسکایەوە پاسەوانەکانی دوبوف بە کۆڵانەکانا غاریان دەداو لە پەنجەرەی کوختەکانیان دەدا.

لەو دەمەدا کە ماروسکا بەرەو تەویلەکە دەچوو تا یەهودا دەربێینێ، سەرجەمی رووداوەکانی دوێنێی بیر کەوتەوە، وەختێ کەلاکی میشکای هاتەوە بەر چاو، دڵی گوشرا، لەپڕ بە بێزارییەوە رەفتارە جەنجاڵەکانی دوێنێ شەوی خۆی بیرکەوتەوە؟ کە چۆن بەمەستی بەسەر شەقامەکەدا لەتری دابوو و هەموو کەس بە چاوی –پارتیزانێکی– مەستەوە سەیریان کردبوو. دەنگی ئاوازو شیعرە بێ تامەکانیان لەم پەڕو لەو پەڕی گوندەوە ژنەوتبوو، لەگەڵ متچیکی



رەقیبیدا چوو بووە بادەنۆشی، وەکو دۆستێکی دڵسۆز قەولی دابوییَ کە خۆشی بویَ، داوای لێبوردنی لیَ کردبوو بۆ؟ لەبەرچی... ئێستاکیَ بە چاوانی خۆی ریاو درۆی رەفتارەکانی خۆی دەبینی. لڤنسون چ دەڵیَ؟ پاش ئەو هەموو بەزمو رەزمە چۆن رووی بیَ تەماشای گونچارنکو بکات؟ زۆربەی هاوڕێکانی خەرکی ئەسپ زین کردن بوون. هەندێکیان ئەسپەکانیان زین کردبوو، و لە تەویلەکە دەیانهێنانە دەریَ. بەڵام ماروسکا هەموو کارەکانی ناتەواو و خوار بوو. زینەکە تەنگو پێچی پێوە نەبوو، تفەنگەکەی لە کوختەکەی گونچارنکو دانابوو، کە دوبوڤ بینی لە نێو حەسارەکەدا غار دەداو خەریکە پارتیزانەکان کۆ دەکاتەوەو ئامادەیان دەکات، قەلەندەرانە لەتیموڤ پاڕایەوەو گوتی: ئیموڤ، هاوڕیَ یارمەتیم بدە! تەنگو پێچێکی یەدەکم بدەیە— دەزانم! تۆ دانەیەکت هەیە.

دوبوف نەڕاندی: چی؟ ئەدی تا ئێستا چیت دەکرد؟ دوبوف بەدەم جنێودانو تووڕە بوونەوە ئەسپەکانی دەڵەك دەدا، بەرەو ئەسپەکەی تاوی داو قامچییەکی هەڵگرتو بە تووڕەییەوە لەسەری رۆیی: هەنووکە پێت نیشان دەدەم. گەڕایەوە بۆ لای ماروسکاو تا هێزی تیا بوو قامچییەکی بە پشتی ماروسکادا کێشا.

ماروسکا لەبەر خۆیەوە تێفکری: دیارە حەقی خۆمە، ئێستاکیَ بۆی هەیە لێم بدات— مستەحەقم، ماروسکا بە ئاستەم نارەزایی دەرنەبڕی، تەنانەت هەستی بە ئازاری قامچییەکەش نەکرد، بەڵام دنیا لە پێش چاوی تاریکتر بوو. دەنگدانەوەی ئەو گوللانەی تاریکی شەویان شەقار دەکرد، تاریکی شەوو ئەو چارەنوسەی لە مەیدانی گوندەکەدا بۆسەی بۆ نابۆوە— پیَ دەچوون سزایەکی رەوا بیَ بەرانبەر بە خراپییەکانی سەرانسەری ژیانی.

وەختیَ کۆبوونەوە، مەیدانی تەقە تا نزیکی چۆمەکە پەڕەی سەند، گوللەی گڕدار وەکو مار بە ئاسماندا دەیفیشکاندو لە ناوەندەی گوندەکەدا دەتەقییەوە.

باکلانۆف پشتێنەکەی بە مەحکەمی لەسەر پاڵتۆکەیەوە بەستو بەدەمانچەی رووتەوە، بەغاردان بەرەو دەرگاکە چوو و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: بەپیَ. بەڕێز! ئەوجا رووی کردە دوبوف: بیست کەس بۆ ئاگاداری ئەسپەکان بهێڵنەوە. ئەمجا فەرمانیدا: لە دوای منەوە: بە غار! لە نێو تاریکییەکەدا ون بوو. پارتیزانەکان بەدەم داخستنی یەخەی پاڵتۆکانیانو کردنەوەی سەری فیشەکدانەکانیانەوە بە غار دوی کەوتن.

لەڕیَ، تووشی هەندیَ پاسەوان بوون کە خەریکی هەڵاتن بوون.

پاسەوانەکان بەدەم هەناسە برکیَو دەست بزواندنو ترسەوە هەواڵیان راگەیاند کە: سوپایەکی گەورەیان لەوێیە!

تۆپە مەیدانیەکان کەوتنە گرمە، گوللە تۆپەکان لە ناوەندی گوندەکەدا تەقینەوەو بۆ لەحزەیەك ئاسمانو گومەزی کڵێساکەی، کە لە حاڵەتی داتەپیندابوو و باخی کەشیشەکەی کە لە بەر تیشکی ئاو نگا دەبریقایەوە روناك کردەوە، دوای تۆزێك ئاسمان لە جاران تاریکتر بوو، گوللەکان دوا بە دوای یەك و لە ماوەی کەمدا دەتەقینەوە، شوێنێك لە ئاخرو ئۆخری گوندەکەوە لە نێو بڵێسەی ئاگردا گڕی دەسەند: رەنگە خەرمانێك یان کوختێك بوو بیَ.



باکلانۆف بۆ ئەوە دانرا بوو کە بەردەمی دژمن بگرێ. لڤنسون بۆ ئەوە دانرا بوو کە فریای ڕێکخستنی هێزەکەو کۆکردنەوەی پارتیزانە پەراگەندەکانی نێو گوندەکە بکەوێ، بەڵام تازە درەنگ بوو: بەر لەوەی باکلانوف بتوانێ زەلامەکانی ڕێك بخات، بە بڵاچەی تۆپەکاندا بۆی دەرکەوت کە دژمن لەلای دەستە چەپی چۆمەکەوە گەمارۆی داون، ڕەنگە لە دەققەو سەعاتا بگەنە ناو گوندەکە.

پارتیزانەکان بەریان لێگرتن و بە دەم تەقەکردنەوە، لە سووچێکەوەو بە دەستە ڕاستا کەتنە پاشەکشە، پارتیزانەکان بە زیگزاگ بە نێو کۆڵان و خانوو باخەکاندا بە پەلە پاشەکشەیان کرد. کە گەیشتنە دەوروبەری چۆمەکە، باکلانۆف بۆی دەرکەوت کە سەنتی گوللەکانی دژمن بەرەو ناوەندی گوندە، بۆیە گومانی تێدا نییە کەزۆری پێ ناچێت، هەموو گوندەکە دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

لە پڕو بە هاواری سامناکەوە، سوارەی دژمن لە شا ڕێگاکەوە دەستی بەهێرش کرد، لافاوی هەڵچوو، و تاریکی کەللەی ئەسپان و مرۆڤ لە جادەکەوە کەوتە حەرەکە.

باکلانوف چیدی هەوڵی بەگری نەدا، لەگەڵ دەستەکەی خۆیدا کە (دە) کەسیان کوژرا بوون، بە پەلە بەرەو بەشی داگیر نەکراوی گوندەکەو لەوێوە بەرەو دارستانەکە پاشەکشەی کرد. لە پاڵ دوا ماڵەکانی گوندا. گەییە باقی پارتیزانەکان، ئەو پارتیزانانەی کە لڤنسون سەرپەرشتی دەکردن و لەسەر باکلانوف وەستا بوون. ڕیزی پارتیزانەکان بە پەلە هەڵدەوەشایەوە.

لڤنسون هەناسەیەکی هەڵکێشاو فەرمانیدا: خێرا سواربن! یاڵڵا!

هەموو سوار بوون، بە پەلە بەرەو دارستانێك کە لە قوڵایی دۆڵێکا ڕەش دەچۆوە، شۆڕ بوونەوە. هەموویان لە دژمنەوە دیار بوون. دەست ڕێژی ڕەشاش حەشری پێدەکردن، موشەك وەکو مار لە قوڵایی ئاسمانەوە دا دەکشان و ئاسمانی دەکرد بە ڕۆژی ڕوناك، موشەك لەبەرزییەوە بە توندی دادەکشاو پاشکۆ گڕاوییەکەی بە عاردی دادەخشاند و لە ژێر دەست و پێی ئەسپەکانەوە دەچوو بە عاردیدا، ئەسپەکان بەدەم ڕاپەڕین و دەموقەپۆزی گەرم و داچەقیوی خوێناوییەوە وەکو ژنان فیزاحیان دەکرد. هێزەکە بەیەکا دەچوون و ئەو جەستانەیان بەجێ دەهێشت کە بە بریندار لەسەر عاردەکە دەتلانەوە.

لڤنسون ئاوڕی دایەوە، گڕێکی زۆری بە سەر دۆڵەکەوە بینی – کوختێکی زۆر لە سووتانا بوو، لەبەر تیشکی ئەم ڕووناکییەوە ڕوخساری تاریك و تووڕەی تاقە جووتیارێك یان کۆمەڵە جووتیارێك کە بە پەلە لە هاتوچۆدا بوون دەبینرا.

ستاشینسکی لە تەنیشت لڤنسونەوە ئەسپەکەی تاو دەدا. لە پڕ لەسەر زینەکە گلا، پێیەکی لە ئاوزەنگییەکە گیر بوو. ماوەیەك بەدووی ئەسپەکەوە، بە عاردیدا خشا, پاشان پێی لە ئاوزنگییەکە ترازا، ئەسپەکە بە تەنێ و بە چوار ناڵە بۆی دەرچوو. پارتیزانەکان خۆیان لەم پەڵە ڕەشەی سەر عاردەکە لا دەدا، تا نەبادا جەستە مردووەکەی بکەنە ژێر پێوە.

باکلانوف بە پەرێشانیەوە هاواری کردو ئیشارەتی بۆ لای ڕاست کرد: لڤنسون تەماشا! پارتیزانەکان گەیبوونە قوڵایی دۆڵەکەو دەققە بە دەققە لە دارستانەکە نزیکتر دەبوونەوە،



لەسەر دۆڵەکەوەو لەو شوێنەوە کە کێڵگەیەکی رەش باوەشی بە ئاسماندا کردبوو، سوارەی دژمن بە غاردان دوایان کەوتبوون. ئەسپی سوارەکان لەم لاترەوە بە گەردنی کشاوو بەو سوارانەوە کە بەسەر پشتی ئەسپەکانەوە چەمی بوونەوە، دەرکەوتن، ئا لەم کاتەدا بەنشێوی دۆڵەکەدا داگەڕان و لە ناو جەرگەی تاریکییەکەدا ون بوون.

لڤنسون پەتیا پەتیا ئاوڕی دەدایەوەو ئاوزەنگی لە ئەسپەکەی دەداو هاواری دەکرد: خێراتر! خێراتر! ئەنجام گەیشتنە قەراخ دارستانەکەو دابەزین. باکلانوف لەگەڵ دەستەکەی دوبوف دا لە پاشەوە مانەوەو رێگای لە دژمن گرت. باقی پارتیزانەکان ئەسپەکانیان راکێشاو لە قووڵایی دارستانەکەدا ون بوون.

نێو دارستانەکە کپ و بێدەنگ بوو، لە هاڕەی دەستڕێژی رەشاش و گیزو هوڕی گوللەی تفەنگ و گرمەی تۆپ دوور کەوتنەوە، پێ دەچوو ئەو دەنگە بێگانانە توانای ئەوەیان نەما کە چیدی کپی دارستانەکە بشڵەقێنن.

هەندێ جار دەنگی تەقینەوەیەکی گەورە دەبیسترا، درەختی گەورەی لەناو جەرگەی دارستانەکەدا تەخت دەکرد.

ناو بە ناو، لێرەو لەوێ ئاگری گەورە لە نێو دارستانەکە دەکەوتەوە، شەوقی دەخستە سەر زەوی و قەدی درەختەکان و شۆکەی شیلەداری قەد درەختەکانی خڵتانی خوێن دەکردو لە کەناری دارستانەکەدا ون دەبوو.

لڤنسون ئەسپەکەی خۆی بە یفیمکا سپارد، رێبەرایەتی دایە دەست کوبراك و ئەو رێیەی پێ نیشان دان کە دەبوو بیگرنە بەر "هەڵبژاردنی رێگا بەپێی فرمانێکی دیاریکراو تەنیا لە ئەستۆی لڤنسوندا بوو". خۆی لە لایەکەوە وێستا تا پارتیزانەکان سەرژمێر بکات و بزانێ چەندیان لە مەرگ رزگار بوون.

پارتیزانەکان بە بەردەمیا رەت دەبوون،هەموو رق هەستاوو تەڕو ماندوو، بە زەحمەت لاقیان هەڵدەهاتەوە. هەموو چاویان بڕی بووە قوڵایی تاریکی دارستانەکە، ئاو لە ژێر پێیانەوە شڵپەی دەکردو بە دەوروبەریان دا هەڵدەپرژا. ئەسپەکان تا بەر سینگیان دەچووە زەلکاوی ناو دارستانەکەوە.

چوونە پێشەوە، بە تایبەتی بۆ دەستەکەی دوبوف، کە دەستەی پێشەوە بوون، زەحمەت بوو. هەر پارتیزانێك سێ ئەسپی پێ بوو، تەنیا ڤاریا نەبێ کە دوو ئەسپی پێ بوو، یەکێکیان ئەوەی خۆی بوو و ئەوی دیکەشیان هی ماروسکا بوو. شوێن پێی قوڕاوی و بەد بۆن و خوارو خێچ لە پاش پارتیزانەکانەوە جێ دەما، دەتگوت تمساحێکی لنج و بۆگەن بە نێو کەوتبوو.

لڤنسون هەر جارەی خۆی دەدایە سەر لاقێکیا، تارەت بوونی دوا زەلام ئەم کارەی دووبارە کردەوە، لە پڕ ریزەکە لە حەرەکەت کەوت.

لڤنسون پرسی: چییە بۆ ناچنە پێشەوە؟

یەکێك لە پارتیزانەکان کە بە بەردەمیا رەت دەبوو، وەڵامی دایەوە: نازانم. ئەو پارتیزانە متچیك بوو.



- به ریز لەوانەی پێش خۆتانەوە بپرسن.

پاشان وەڵام هاتەوە، ژمارەیەك لێوی لەرزۆك و بێ ڕەنگ ئەم وشانەیان دووبارە دەکردەوە: گۆماوێك لە ڕێگامانەو چ ڕێیەکی دیکەش نییە.

لڤنسون کە لەگەڵ لەرزینی کت و پڕی ئەژنۆکانیا دەجەنگی، بەپەلە بەرەو لای کوبراك چوو، تازە لە نێو چڕی درەختەکان ون دەبوو، کە سەیری کرد، بینی پارتیزانەکان چەشنی شەپۆلێکی گەورە پەنگیان خواردۆتەوە، بەملاو بەولادا بڵاوبوونەوە. گۆماوە تاریك و عاسییەکە لە هەموو لایەکەوە ڕێگای لێ گرتبوون، هەر ئەو ڕێگایە هەبوو کە لێوەی هاتبوون ئەو ڕێگایەی تاکو ئێستاش دەستەکەی دوبوف قارەمانانە بەرگری لێ دەکرد، هەنووکە تەقوتۆقی قەراخ دارستانەکەیان بەلاوە غەریب نەبوو. ئەو پیاوانەی لە نێو گڕی ڕق و شێتیدا دەسووتان، لە کن و کۆی ئەو کەسەدا بوون کەمەسئولیەتی ڕۆژ ڕەشیانی لە ئەستۆ بوو: چ پێویست بە ناوهێنانی لڤنسون- ش نەبوو, هەر ئەوەندە بەس بوو لەم کاتەدا تووشی ببن، تا بە هەموو هێزی ترسیانەوە بەسەریا دابارن. چونکە ئەو کێشا بوونیە ئێرەو داوایان لێدەکرد ڕزگاریان بکات.

لە پڕ بە مەشخەڵێکی داگیرساوەوە کە گۆنا توکنەکەی ڕەنگە مات و مردووەکەی، ددانە بەچیڕا چووەکانی، چاوە درشت و ئەبڵەق بووەکانی کە چەشنی پشکۆیەکی گەش لەسەر دەمو چاوی هەر یەکێکیان دەگیرسایەوەو خێرا تێدەپەڕی -ڕووناك دەکردەوە، لە نێو ئەم پیاوە ترس لێنیشتوانەوە دەرکەوت. دەنگی لە نێو بێدەنگییەکی کورت خایەندا، بە شێوەیەکی تووڕەو ناسك و گیراوەوە- بەجۆرێ کە هەموویان دەیان ژنەوت دەنگی دایەوە.

- کێ ڕیزەکانی تێك داوە؟ بگەڕێنەوە! تەنیا کیژان دەترسن! بێدەنگ! لڤنسون کە وەکو گورگ ددانەکانی لێکدی دەسوو، دەمانچەکەی دەرهێناو بە دەنگێك کە کوت و پڕ دەنگی ناڕەزایی خستە سەر لێوان هاواری کرد: گوێ لە فەرمانی من بگرن! چ ڕێگایەکمان نییە. لەسەر گۆماوەکە وە ڕێ دەکەوینەوە. ئەمجا دەستووری بە فەرماندەی تازەی دەستەی سێیەمدا: بوریسون! بە پەلە بچۆ هیمدادی باکلانوف، پێی بڵێ تا من دەستووری پاشەکشە نەدەم، هەر بەرگری بکات. کوبراك سێ کەس هەڵبژێرە بۆ پاراستنی پێوەندی نێوان ئێمەو باکلانوف. پارتیزانەکان گوێ بگرن. ئەسپەکانتان ببەستنەوە! دوو دەستەتان خەریکی دار بڕینەوە بن. ئاگاتان لە شمشێرەکانتان بێ خراپیان نەکەن! پارتیزانەکانی دی لە ژێر فەرمانی کوبراکدا دەبن و بێ چەند و چون دەستوورەکانی ئەنجام دەدەن لە سەرتانە گوێ رایەڵی ئەو بن! کوبراك دوای من بکەوە! لڤنسون پشتی کردە زەلامەکان, مەشخەڵەکەی بەسەر سەرییەوە گرت و بە ماتە مات بەرەو گۆماوەکە هەنگاوی نا.

گرووپی پیاوانی ڕوخاو و پێکا چوو کە هەموو تۆزێ لەمەوبەر بەو پەڕی نائومێدی یەوە دەستیان هەڵبڕی بوو و فرمێسکیان دەڕشت و ئامادەی تاوانکردن و پیاو کوشتن بوون, لەپڕو بە پەلەیەکی سەیرو شێت ئاسایانەوە گوێ ڕایەلانە کەوتنە ناو گێژەنگی کار کردن و



زەحمەتکێشانەوە, لە چاوتروکانێکا ئەسپەکان بەسترانەوە, شمشێرەکان بە سەرو پۆتەڵاکی درەختی غاندا داهاتنەوەو دارستانەکە لە ژێر جەزرەبەی شمشێردا کەوتە ناڵە ناڵە.

دەستەکەی بوریسوف بە تەقە تەقی شمشێرو لە نێو شڵپە شڵپی ئاودا خۆی کرد بەناو تاریکییەکەدا و بەتەنیشت ئەو پیاوانەدا ڕەت بوون کە هەنووکە یەکەمین باوەشی لقی تەڕیان هەڵدەکرت. گوێیان لە قرچەی دارێك بوو کە لە کەوتن دابوو, کۆمەڵە لقێکی چڕو گەورە بە خشە خش کەوتە سەر زەوییە نەرمەکە. پارتیزانەکان لەبەر تیشکی مەشخەڵێکی داگیرساودا. سەرەوەی لینج و سەوزو تاریك و قەوزە گرتوو و پڕ شەپۆلی مار ئاسای گۆماوەکە یان لە بەرپێی خۆیاندا بینی.

پارتیزانەکان بە لقە درەختەکانەوە هێرشیان بردە نێو زەلکاوەکە.

لە نێو تاریکییەکەوە, سیمای ڕەنجاو و پشتی چەماو لق و پۆپی چڕو تێك ئاڵاو, لەبەر ڕۆشنایی مەشخەڵێکی دووکەڵاوی دا بە ئاشکرا... دیار بوو. پارتیزانەکان پاڵتۆکانیان لە کەنارێکەوە دانا, بەدەنی بریندارو خوێناوی و ماسولکەی گرژ بوو و ئارەق کردوویان لەنێو پانتۆڵ و کراسە دڕاوەکانیانەوە دەبریقایەوە. هەموو شتێکیان: زەمان و شوێن, لەش, شەرم و ئازارو داماوی خۆیان نابووە لاوە. پاش هەڵوەستەیەك کلاوەکانیان لە ئاوی پیسی زلکاوەکە, کە بۆنی بۆگەنی هێلکە قورباقەی لێدەهات, پڕ کردو چەشنی جانەوەرێکی بریندار بە تاسەوە بینیان پێوە نا.

دەنگی تەقە سات بە سات نزیك و نزیکترو بەرزترو ترسناك تر دەبوو. باکلانوف پەیتا پەیتا زەلامی دەنارد کە: ئاخۆ دەتوانن زوو کارەکە راپەڕێنن؟ بەم زووانە ؟...

باکلانوف نزیکەی نیوەی پیاوەکانی لە دەست دابوو. دوبوف لەئەنجامی بریندار بوون و خوێن لەبەر ڕۆیشتن مرد بوو. باکلانوف هێواش و ئینج ئینج پاشەکشەی دەکرد. ئەنجام گەییە ئەو شوێنەی دەوەنەکانیان بۆ سەر گۆماوەکە لێ بڕی بۆوە. باکلانوف نەیدەتوانی لەوە پتر بەرگری بکات و پاشەکشێ نەکات. گوللەی دژمن بەسەر زەلکاوەکەدا گیزەی دەکرد. ژمارەیەك لەو پارتیزانانەی کە مژوڵی کارکردن بوون, بریندار بوون. ڤاریا زامەکانی تیمار دەکردن. ئەسپەکان لەترسی دەنگی تەقە, شێت ئاسا دەیانحیلاندو دەڕەوینەوە. هەندێکیان هەوساریان دەپچڕی و کوێرانە خۆیان دەکوتایە نێو دارستانەکەوەو دەکەوتنە گۆماوەکەوەو بە ناڵەی بەزەیی ورۆژێنەوە داوای کۆمەکیان دەکرد.

وەختێ دەستەی دواوە هەواڵی تەواو بوونی ڕێگاکەیان زانی، ئەوانیش تێیان تەقاند. باکلانوف بە روومەتی قوپاو چاوانی ماتوچارەی لە دوو کەڵ و باروتا ڕەش هەڵگەڕاوەوە، بە دەمانچەی رووتەوە هەڕەشەی لە زەلامەکانی دەکردو لە رقانا دەگریاو بە دوایانا غاری دەدا. ئەندامانی هێزەکە بەغەڵبە غەڵب و بەچەك و تەدارەك و مەشخەڵەوە ئەسپەکانیان بەدووی خۆیاندا بکێش کردو هێرشیان لۆ سەر ڕێگاکە برد. ئەسپانی تورە جەنەیان دەبەست و بەترسەوە هەڵدەستانە سەر پاشوو و خۆیان هەڵدەدایە سەر ئەسپەکانی پێش خۆیانەوە. ڕێگا بە دارو دەوەن دروست کراوەکە لە ژێر پێیاندا دەشکاو دەخزی. لە ئاخرو ئۆخری ڕێگاکەدا



ئەسپەکەی متچیك کەوتە زەلکاوەکەوە. پارتیزانەکان بە گوریس و بە دەم هات و هاوارو جنێو دانەوە ئەسپەکەی متچیك یان دەرهێنایەوە. متچیك بە تووڕەیی چنگی لە گوریسەکە گیر کرد، ئەو گوریسەی لەگەڵ تەقەللای شێتانەی ئەسپەکەدا دەجوولا. هەر چەندە لقە خزەکانی ژێر پێی دەترازان، بەلام ئەو هەر دەست بەرداری گوریسەکە نەبوو. وەختێ ئەسپەکەیان دەرهێنایەوە، هەوڵیدا ئەو گرێیانە بکاتەوە کە لە دەست و پاشووی ئەسپەکە گیر بوو بوون، بە شەوقێکی لە رادەبەدەرەوە ددانەکانی لە گرێ قوڕاوی بۆگەنەکان گیر دەکرد.

لڤنسون و گونجارنکو دەبوا لە پاش هەموو بپەڕنەوە. مینەرەکە، مینێکی لە ناوەندی رێگا دەستکردەکە نایەوە تا ئەگەر دژمن بگاتە سەر رێگاکە، لە ژێریان بتەقێتەوەو رێگاکە هەڵتەکێنێ و خراپی بکات.

شەو تەواوێ راکشا بوو، وەختێ پارتیزانەکان هاتنەوە سەرخۆ، سەیرایان کرد بەیانی دابوو, دارستانەکە لەبەردەمیانداو لە ژێر پەردەی ئاونگی مەیووی زەرد باوا دەبریسکایەوە. گۆشەیەکی سپی واژی ئاسمان لە نێو لق و پۆپی درەختەکانەوە دەبریقایەوە، هەتاو لە پشت دارستانەکەوە بەرز دەبۆوە.

پارتیزانەکان مەشخەڵەکانیان، کە لەبەر هۆیەك هێشتا هەر بە سەر سەریانەوە هەڵیان گرتبوو تورِدا. سەیری دەستە سوور هەڵگەڕاوو تلۆق کردۆکانی خۆیان کرد، تەماشایەکی ئەسپە هیلاك و تەڕەکانیان کرد، کە هێشتا تەنکە بوخارێکیان لێ هەڵدەستا. ئاوڕیان دەدایەوەو بەچاوی شانازییەوە سەیری ئەو کارەیان دەکرد کە لەو تاریکە شەوەدا ئەنجامیان دابوو.






**نۆزده کەس**

له دووری پێنج قۆناغه رێ، لەو رێیەی کە پارتیزانەکان لەسەر گۆماوەك دروستیان کردبوو، شان بە شانی رێگای ناوچەی تودو– ڤاکو، پردێك هەبوو، دژمن شەوی پێشووتر، له ترسی ئەوەی کە نەبادا لڤنسون لە گوندەکە دەربچێ. لە دووری هەژدە قۆناغی ئەو پردەوەو لەسەر جادەکە بۆسەیەکیان بۆ نابۆوه.

دژمن بە درێژایی شەوەکە حازرو ئامادە لە بۆسەدا بوو. شریخەی تۆکانیان لە دوورەوه دەبیسترا. لەگەڵ گەردی بەیاندا سوارێك بەم فرمانەوه خۆی گەیاندنێ کە: لە جێی خۆیان بوەستن، چونکە دژمن "پارتیزانەکان" رێگای گۆماوەکەی بریوەو بەرەو رووی ئەوان دێت. تەنیا دە دەقیقەیەك پاش ئەوەی تەتەرەکە لێیان تێپەری بوو، پارتیزانەکان بێ خەبەر لەو داوەی بۆیان نرابووه, بێ خەبەر لەو هەواڵەی کە تەتەری دژمن گەیاندبوویە زەلامەکانی خۆیان، گەیشتنە سەر شا رێگای تودو –ڤاکو.

لڤنسون چاوێکی بە جوانی سروشتدا گێرا، بەڵام هیچی لێ حاڵی نەدەبوو. لڤنسون سەیری ئەو هێزه شەکەتو ماندووەی دەکرد کە دوو سێیەکی لە دەست دابوو و بە پەرێشانییەوه رێگای دەکرد. لڤنسون چاك دەیزانی چەند دەستەوەستانو بێ توانایە لە ئەنجامدانی کارێکی بەسوود، بۆ ئەو هێزەی کە بەدبەختانە بە دوای ئەودا رێیان دەکرد. پارتیزانەکان نزیکترین ئازیزانێ بوون لە دنیادا کە بە دوورییەوه مابوون–ئەم پیاوە شەکەتو ئەمەکدارانە لە هەموو شتێك بۆ ئەو نزیکترو ئازیزتر بوو، بۆیە بە نیونەخت خۆی لەو مەسئولیەتە غافڵ نەدەکرد کە دەرهەق بە وان لە ئەستۆی بوو، بەڵام هەنووکە بە ئاشکرا دەیبینی کە ئیدی ناتوانێ چ کارێکیان بۆ ئەنجام بدات. ئەو ئیدی رێبەری نەدەکردن، تەنیا خۆیان بێ ئاگا لەم وەزعانەو وەکو رانە مەرێك کە چۆن بە پێی عادەت دوای شوانەکەی دەکەوێ، دووی ئەو دەکەوتن. ئەمە ئەو شتە بوو، کە سپێدەی دوێنێ, وەختێ لە مەرگی متلیستا راما، زیاد لە هەموو شتێ لێی ترسا.

لڤنسون هەوڵی دەدا بەسەر خۆیا زاڵ بێو هۆشو گۆشی بۆ شتە پێویستەکان تەرخان بکات. بەڵام فیکری پەشێو بوو، سات بە ساتیش شێواوتر دەبوو، پێڵوەکانی دەهاتنەوە یەکو خەیاڵی سەیرو تازەو بیرەوەری ئاڵۆزو ناکۆكو نا سازگار لە مێشکیدا شەپۆلی دەداو بە شێوەی قەرەباڵغییەکی هەست پێ نەکراو، هێدیو بەردەوام دەگۆرا: بۆ ئەم رێگا دوورو درێژه، بۆ ئەم گەڵا زەردانەو ئەم ئاسمانە مردووه، ئەرێ بۆ هەنووکە ئەوەندە بێ کەڵكو بێ باشارم؟ بەڵێ, دەبێ بگەمە دۆڵی تودو –ڤاکو، چ ناوێکی سەیرو سەمەریە! ئەدی بۆ هێندە ماندووم چەند حەزم لە خەوە! منێ ئەوەندە حەزم لە خەو بێ، ئیدی ئەو زەلامانە دەتوانن چاوەرێی چیم لێ بکەن؟ ئەو باسی دووریێ دەکات. بەڵێ دووریێ... تۆ سەیری کەللە خرەکەی!.... عەینی



کەللـەی کوڕەکەمـە... هەڵبەتـە پێویسـتـە دەوریێکانمـان بنێـرەمو پاشـان... بخـەوم، بخـەوم... تەنانەت وەکو کەللەی کوڕەکەشم نا، بەڵام....

لە پڕ سەری هەڵبڕی و پرسی: دەڵێی چی؟ چییە؟ باکلانوف کە لە تەنیشتییەوە ئەسپی داژۆ: دەڵێم ئەگەر چەند دەورییەك بنێرینە پێشەوە باشترە.

– دروستە، ئەم کارە بکەین چاکە، تکا دەکەم دەستووری پێویست دەر بکە.

دوای تۆزێك، سواریێ بە لۆقەو بە بێزارییەوە بە تەنیشت لڤنسوندا ڕەت بوو. لڤنسون لە دواوە تەماشای پشتە کۆماوەکەی کرد، متچیك–ی ناسییەوە، وای بە خەیاڵدا هات کە ناردنی متچیك کارێکی دروست نەبوو. بەڵام ئەو زەحمەتەی نەدایە بەر خۆی کە ڕوونی بکاتەوە بۆچی و لە چ ڕوویەکەوە دروست نەبوو، پاش تۆزێکی دی ئەمەی هەر بە جاریێ فەرامۆش کرد، پاشان سوارێکی دی بە تەنیشتیا ڕەت بوو.

باکلانوف دەوریێی دووەمی گاز کرد: ماروسکا ئاگاتان لە یەکدی بیێ.

لڤنسون لەبەر خۆیەوە تێفکری: دە بڕوانە، ئەمە دەمێنێ و دوبوف دەمرێ، دوبوڤ –بێ چارە! ئەرێ ماروسکا چی کردووە؟ ئاه، بەڵێ ئەوە شەوی پێشوو بوو، خۆی و بەختی کە نەمبینی.

متچیك ماوەیەکی زۆری بە غار بڕی بوو، ئاوڕی دایەوە. ماروسکا، پەنجا هەنگاوێك لە دوایەوە بوو. هێشتا پارتیزانەکانی لێوە دیار بوون. پاشان هەم پارتیزانەکان و هەم ماروسکا لە پێچی جادەکەدا لە چاوی ون بوون. نیوکا حەزی بە لۆقە نەبوو بەڵام متچیك لا ارادی ئاوزەنگی لێدەدا. متچیك بە تەواوی نەیدەزانی کە بۆ ئەویان ناردۆتە پێشەوە، بەڵام چونکە فەرمانی پیێ درا بوو کە بە غار بڕوات، ئەویش بە گوێی دەکردن.

جادەکە بە بنارێکی شێدارا کە یەك پارچە درەختی ئەفراو بەڕوو بوو و هێشتا گەڵای سوور هەڵگەڕاو بە لقەکانیانەوە بوو، پێچی دەکردەوە. نیوکا بە تووڕەیی دەلەرزی و ڕێك بە تەنیشت دەوەنەکاندا دەڕۆی. نیوکا بە ڕەوتی ئاسایی ئاسوگەکەی بڕی. متچیك بە سەر زینەکەوە وەنەوزی دەدا، ئیدی ئاوزەنگی لە ئەسپەکە نەدەدا، وەختیێ هاتەوە سەرخۆ، هەستی کرد بە سەرسامی دەڕوانێتە دارستانەکە، ئەو دارستانەی کەدەقاو دەق وەکو خەوەکەی، وەکو پەشێوییەکەی،وەکو هەست نەکردنەکەی بەخۆ، سەرەتاو کۆتایی نەبوو.

لە پڕ نیوکا پڕماندی و ڕەوییەوە نێو دەوەنەکان. متچیکی بە لق و پۆپە نەرمەکانەوە گوشی. ترسێکی لە ڕادەبەدەر خەوی لە چاوانی متچیك تاراند: قوزاقەکان، چەند هەنگاویێ لەو لایەوەو لەسەر جادەکە وێستا بوون.

یەکێك لە قوزاقەکان بە دەنگی نزم و تورە تێی خوڕی:

– وەرە خوارەوە! قوزاقێکی دی هەوسارەکەی نیوکای گرتبوو. متچیك نیمچە هاوارێکی کرد، خۆی گرمۆڵە کرد، لەسەر زینەکەوە خۆی هەڵداو بروسکە ئاسا خۆی بەرەو بنارەکە خل کردەوە، بۆ چەند دەقەیەك لە ترسانا زمانی شکا بە هەر چوار پەل هەوڵی دەدا، پاشان بیێ ئاگایانە کەوتە بازدان، دەستی بگەیشتبا هەر شتێك خۆی لیێ گیر دەکرد، سەرنجام قەڵەمبازێکیداو بە دۆڵەکەدا تێی تەقاند. قوزاقەکان ڕاویان دەناو دەونەکان لە



پشتییەوە کەوتبوونە خشەخش. قوزاقێك شێت ئاساو بە هەناسە بڕکێوو جنێودانەوە راوی دەنا.

ماروسکا چونکە دڵنیا بوو دەورێیەکی تری لەپێشەوەیە، بۆیە گوێی بەو شتانە نەدا کە لە دەوریا روویان دەدا، هەر تێدەپەڕی. ماروسکا ئەوەندە شەکەت بوو، هیچ شتێکی لە بیر نەمابوو تەنیا ئیسراحەت نەبێ- ئیسراحەت بە هەر نرخێ بێ- ماروسکا ئیدی بیری لە ژیانی خۆیو لە ژیانی ڤاریاو یان لەوەی کە گونجارنکو چی دەربارە دەڵێ، نەدەکردەوە. تەنانەت تاقەتی ئەوەشی نەمابوو کە خەفەت لە مەرگی دوبوف بخوات. گەرچی دوبوف وەکو ئەوانی دی لەویش نزیك بوو.

ماروسکا تەنیا بیری لەوە دەکردەوە کە جارێکی دی زێدی خۆی ببینێتەوەو سەری ماندوو و پەرێشانی بحەسێنێتەوە، ئەم زێدە، لە خەیاڵیا گوندێکی گەورەی ئارام بەخش بوو، لە باوەشی تیشکی هەتاودا مات بوو بوو. پڕ بوو لە خەڵکانی چاك، پڕ بوو لە مانگای تێرو بۆنی پاوانو گیاو رانە مەڕ، لەو دەمەدا کە پانتۆڵەکەی لە ژێریا گرمۆڵە بوو بوو و سەری بەسەر شانیا خوار بوو بوو، بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن ئەسپەکەی دەبەستێتەوەو پاشان جامێ شیر بە کولێرەیەکی گەورەی بۆن خۆشەوە دەخوات، چۆن دەچێتە کادێنێکەوەو بە دڵنیاییەوە لێی دەخەوێ.

وەختێ لە پڕا چاوی بە تیلماسکی زەردی کڵاوی قوزاقەکان کەوتو یەهودا رەوییەوەو دایە ناو دارستانەکە، ئەو دارستانەی کە گەڵا سوور باوەکانی لەبەر چاویا وەکو دڵۆپە خوێن دەلەرزین، ئیدی خەونی شیرینی گوندە گەورەو هەتاو گیرەکەی، دەرك کردنی خیانەتی بێ وێنەی ئێستای هاوڕێکەی لەسەر شاشەی خەیاڵی ون بوو.

ماروسکا لە کاتێکدا زۆر بە وردی چاوانی رۆشنو نەفرەت وروژێنی متچیکی بەرجەستە دەکرد، بە خۆی گوت: هەی نامەرد! رای کرد، دەست بەجێ هەستێکی ئازار وروژێن دڵی گوشی، هەستێك سەبارەت بە خۆیو بەو پیاوانەی لە دوایەوە بە سواری ئەسپ دەهاتن.

ماروسکا چ باکی بەوە نەبوو کە هەر ئێستا بمرێ و لەم هەستە تالو رەنجە بێ بەرە رزگار ببێ. لە هەموو ژیانیا، لەو رۆژەوە کە لە دایك بوو بوو، گەورە بوو بوو، لەگەڵ رەنجا هەڵی کرد بوو، هەرگیز ئەم وەزعە سەیرو باوەڕنەکراوەی بە خەیاڵا نەهاتبوو. بەڵام لای روون بوو کە جارێکی دی هەرگیز گوندە گەورەو هەتاوگیرەکەی خەیاڵی، ئەو هاوڕێ ئازیزانە، ئەو برایانەی کە لە دوایەوە بە سواری دەهاتن، نابینێتەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشا ئەو پیاوە ماندوو ئاسوودانەی کە خۆیان بەو سپارد بوو، ئەوەندە خۆش دەویست و بە نزیکی خۆی دەزانین، توانای نەما بوو بیر لە خۆی بکاتەوە، هەر ئەوەندەی لە دەست دەهات بیر لەمە بکاتەوە کە تا ئەو دەمەی زیندووە لە خەتەریان بپارێزێو ئاگاداریان بکاتەوە... دەمانچەکەی دەرهێنا، بەجۆرێ بەرزی کردەوە کە دەنگی باشتر ببسترێ، بە پێی ئەو قەرارەی کە پێشتر لە بەینیانا بوو، سێ گوللەی لەسەر یەك بە حەوادا تەقاند.



دەست بەجێ بلاَچەیەك لە ئاسمان هەستا، پاشان گرمەیەكی بێ ڕەزا هات، دەتگوت جیهان لەبەر چاوی بوو بە دوو لەتەوە. ماروسكاو یەهودا پەرت بوونە نێو دەوەنەكان و سەری بە پشتا شكایەوە.

وەختێ لڤنسون دەنگی تەقەكانی بیست– كە بە وەزعی ئێستایەوە گەلەك چاوەڕوان نەكراوو باوەڕ نەكراو دەهاتە بەرچاو –هەوەڵ جار لە مانای تەقەكان تێ نەگەیشت، وەختی حاڵی بوو كە دەنگی دەستڕێژی دواتری بیست، ئەو دەستڕێژەی كە لە ماروسكا كرا. ئەسپەكان بە دەم سەرقوت كردنەوەو گوێ قوڵاخ كردنەوە لە جێی خۆیان چەقین.

لڤنسون بە نائومێدییەوە تەماشایەكی دواوەی كرد، بۆ یەكەم جار داوای كۆمەكی لە پارتیزانەكان دەكرد. بەڵام ترس و نا ئومێدی خۆی لە ڕوخساری لاوازو بێ دەنگی پارتیزانەكاندا خوێندەوە. دەتگوت هەموو ڕوخسارەكان بووە بە یەك ڕوخساری لاڵ و پرسیار ئامێزو ترساو. لڤنسون بە دەست حەرەكەتێكی دەكرد كە دەتگوت شتێكی تێدا شاردۆتەوەو بۆی دەگەڕێ و نایدۆزێتەوە. لەبەر خۆیەوە بیری كردەوە: بۆ، ئەوەندە دەترسم؟

لە پڕ سیمای سادەو منداڵانەی باكلانوڤ بەرچاو كەوت. ئەو سیما سادەیەی كە لە دوو كەڵی باروت و گەردو تۆزا ڕەش و شپرزە بوو بوو. باكلانوف دەمانچەكەی بە دەستێكییەوە بوو، بە دەستەكەی تری توند یاڵی ئەسپەكەی گرتبوو، شوێن پەنجە قەڵەوەكانی لەسەر لا ملی ئەسپەكە نەخشا بوون. بە هەڵچوونەوە چاوی بڕی بووە ئەو شوێنەی كە دەنگی تەقەكانی لێوە دەهات، دەموچاوە سادەو بێ ڕیاكەی و گۆنا لاوازو ڕەقەكانی بە هەڵچونێكی بێ ئەندازەوە بۆ ئەو ئامانجە دەسووتا كە باشترین دۆستەكانی لە پێناویا مردبوون، خۆی بە پێشا بردبوو و بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێی فەرمانی: "بۆ پێشەوە" بوو.

لڤنسون ڕاپەڕی، خۆی لەسەر زینەكە بەرز كردەوە، هەستی بەزەیی و دڵسۆزی لە ناخیا هاتە جۆش، لە پڕ شمشێرەكەی هەڵكێشا، چاوەكانی بریقانەوەو خۆی بە پێشا برد.

بە ئەسپایی لە باكلانوف–ی پرسی: دەتوانین بازنەی گەمارۆكە بشكێنین؟ ئەوجا بە جۆرێكی چاوەڕوان نەكراو شمشێرەكەی بەرز كردەوەو لەبەر تیشكی خۆرەكەدا بریقایەوە. بەم جۆرە پارتیزانەكان ڕاپەڕین و لەسەر ئاوزەنگییەكانەوە هەستانە سەر پێ.

باكلانوف تەماشایەكی شمشێرەكەی كردو گەڕایەوە بۆلای پارتیزانەكان, بە دەنگی بەرز شتێكی گوت كە لڤنسون لێی حاڵی نەبوو, چونكە لڤنسون لەو كاتەدا بەزیوی دەستی هەمان هێزی دەروونی بوو كە باكلانوفی ناچار كرد بوو شمشێرەكی هەڵكێشێت.

بەسەر جادەكەدا تێی تەقاند و باوەڕی وا بوو كە تەواوی هێزەكە دەست بەجێ بەرەو پێش تاو دەدەن.

دوای تۆزێ كە ئاوڕی دایەوە, سەیری كرد هەموو پارتیزانەكان بەسەر ئەسپەكانەوە خۆیان گرمۆڵە كرد بوو و بەچارنارە تاویان دەدا. هەمان ڕقی ئەستور كە لە چاوانی باكلانوف دا پەنگی خواردبۆوە لە نیگایاندا گڕی دەسەند. ئەمە دوا بیرەوەری ڕۆشنی باكلانوف بوو. چونكە هەر دوای تۆزێك شتێك بە سەر سەریەوە تەقییەوە, كەڕو كاسی كرد و بەر چاوی تاریك كرد و



لەعاردەکەدا لوولی داو هەر فریای ئەوە کەوت کە بە ئاستەم هەست بکات هێشتا زیندووە. پاشان پەرت بووە ناو کەندێکی سوورکەڵانەوە.

متچیك بە هیچ جۆرێ ئاوڕی نەدەدایەوە, هەرچەندە چ ئاسەوارێك لەوانەوە نەبوو کە راویان دەنا, بەڵام وای بیردەکردەوە کە هێشتا بە دوایەوەن. وەختێ سێ گوللە بە سەر یەکەوە تەقێنراو دوا بە دوای ئەوە دەسرێژێك کرا, ئیدی دڵنیا بوو کە هەر هەموویان ئەویان کردووە– بە هەدەف, بۆیە خێراتر رای دەکرد. لەپڕ دۆڵەکە چووە سەر شیوێکی چکۆڵەی پڕ دارو درەخت. متچیك ئەوەندەی راستو چەپ کرد تا هەمدیس لە شیوەکەوە غل بۆوە. لەم دەمەدا قرمژنی دەسترێژێکی دی کە لە یەکەم دەسترێژ خەست ترو بەرز تر بوو، پاشان یەکێکی دیو دوا بە دوای ئەمە دەست رێژێکی دی دەنگی دایەوە.

متچیك بەردەوام خۆی دەلاواند: ئاه، خوایە!... لەگەڵ بیستنی هەر هاڕەو هەر گرمەیەکی تازەی تۆپدا، ناڵەیەکی دەکردو دەموچاوی بە جۆرێکی بەزەیی وروژێن وەکو منداڵانێ کە دەیانەوێ بگرین، دەدا بە یەکا. چاوەکانی بە جۆرێکی نەفرەت وروژێن و ئابڕو بەرانە وشك بوون، بەردەوام و تا تینی تێدا بوو هەڵدەهات.

متچیك چەند جارێك ئاوڕی دایەوەو کەسی بە دواوە نەبوو، چ شتێك نەدەبووە مایەی شڵەقاندنی ئەو بێدەنگییەی کە ئێستا باڵی بەسەرا کێشا بوو، بە دەم هەناسە بڕکێوە خۆی دایە پەنای نزیکترین دەوەن، دڵی بە توندی لێی دەدا. دەستی خستە ژێر چەنەگەی و چاوی بڕییە ئاسمانەکەی بەرانبەری، چەند لەحزەیەك بە ماتی و بێدەنگی لە جێی خۆی وێستا.

دە هەنگاوێك لەو لای متچیکەوە، درەختێکی باریکی بەرز، قەدی بەرەو زەوی شۆڕ بوو بووەو لە باوەشی تیشکی هەتاودا وەنەوزی دەدا. کە دیقەتی دا، سەیری کرد سمۆرەیەکی بچووکی بەسەرەوەیەو چاوە زەردو سادەکانی بڕیوەتە ئەو. متچیك لەپڕ لە جێی خۆی هەستا. سەری خستە نێو هەردوو دەستی و بە دەنگی بەرز ناڵاندی. سمۆرەکە لە ترساندا زیقاندیو لە نێو پوشەکاندا ون بوو، بروسکەیەکی شێتانە لە چاوی متچیك هەستا. پەنجەکانی خستە نێو قژەکەیو لە داخو کەسەردا ناڵەیەکی کردو کەوتە سەر زەوی. پەیتا پەیتا دووبارەی دەکردەوە: چ کارێکم کرد؟ ئاه، چیم کرد؟ لە کاتێکا خۆی دەخستە سەردەمو سەر ئانیشکەکانی بە شێوەیەکی ئاشکراترو بە شەرمەزارییەکی قوڵترەوە مانای هەڵاتنەکەی ئەو سێ گوللەیەی بانو بان یەك تەقێنران، و گوللە بارانەکەی دوایی تری دەرك دەکرد: من چیم کرد؟ چۆن توانیم ئەم کارە بکەم! من! ئەو پیاوە باشو ئابڕومەندەی کە نیازی ئازاردانی چ کەسێکی لەدڵدا نەبوو–ئاه، ئاه، چۆن توانیم من؟.....

رەفتارەکانی گەلەك نەفرەت وروژێنو حەیا بەرە بوو. هەستی دەکرد بەر لە ئەنجامدانی ئەم کارە، بە ئابڕوترو چاکترو لەبارتر بوو. ئەم بیرە ئازاری دەدا، هەڵبەتە نەك لەبەر ئەمەی ئەو پیاوانەی خۆیان بەو سپارد بوو، لە ئەنجامی کارەکەی ئەودا مردبوون، بەڵکو پتر لەبەر ئەمە بوو کە ئەم عەیبە نەنگو کرێتو نەفرەت وروژێنەی کە هەرگیز پاك نەدەبۆوە، هەموو ئەو چاکی و پاکیانەی دەخستە درۆوە کە متچیك دەیدانە پاڵ خۆی.



هەر لە خۆوەو بێ مەبەستێکی دیاریکراو دەمانچەکەی دەرهێنا، بە ترسەوە لێی راما، بەڵام دڵنیا بوو کە هەرگیز خۆی ناکوژێت، توانای خۆ کوشتنی نەبوو، چونکە لە دنیادا چ شتێکی لە خۆی —لە دەستە سپی و بێ هێزەکانی، لە دەنگدانەوەی ناڵەکانی، لە رەنج و کردارەکانی و تەنانەت لە نزمترین کاری خۆی، پتر خۆش نەدەویست. تەنانەت دەترسا بە دزیشەوە دەست بە سەر زەیتی دەمانچەکەیا بێنێ، هەوڵی دەدا وا بنوێنێ کە نازانێ بۆ لێرەیە، بە پەلە دەمانچەکەی خستە گیرفانەکەی پشتەوەی.

هەنووکە نە دەگریاو نە دەکوڕزایەوە، دەموچاوی خستبووە نێو هەردوو دەستی و بە دەما راکشا بوو، هەموو ئەو رووداوانەی کە لەم چەند مانگەی دواییەدا، لە دەمی بەجێهێشتنی شارەوە بە سەریا بوری بوون، بە یەکجارو بە شێوەیەکی خەمناك و بێزارکەر هێنایە بەرچاوی خۆی: خەیاڵە منداڵانەکانی کە هەنووکە شەرمی لێ دەکردن، خەمی یەکەمین تەعامولی و بریندار بوونی، ماروسکا، نەخۆشخانە، پیکای پیر بەو چەپکە قژە زیوینەیەوە، فرولوڤ مردوو، ڤاریا بە چاوە درشت و خەم لێ نیشتووەکانییەوە کە لە گەڵ هەموو ئەو چاوانەی تا ئێستا دیبوونی و یان دوایی دەیانبینێ فەرقی هەبوو، ئەنجام دوا پەڕینەوەی سامناك لە رێبازەکەی گۆماوەکە —کە هەموو شتێك بە بەراوورد لەگەڵیا، کەم بایەخ و هیچ دەهاتە بەرچاو.

متچیك لە کاتێکدا بەزیوی دەستی بەزەیی بە خۆ هاتنەوە بوو، بە راشکاوی و هێمنییەکی پترەوە بیری کردەوە: من چیدی بەم جۆرە هەڵناکەم، ناتوانم بەم جۆرە نزم و نا ئینسانییە و بەم ترسەوە بژیم.

هەمدیس درێژەی بەسەرزەنشت کردنی خۆیداو خەمباری ئەو کارە بوو کە کردبووی، بەڵام ئیدی توانیا ئەوەی لە دەست دا بوو کە جڵەوی ئەو ئارەزووە شەخسی و خۆ خۆشویستنە لە رادەبەدەرە بگرێ کە هێنابوویانە جۆش، ئەم ئارەزووە لەم بیرانەدا خەست دەبۆوە کە: ئەو ئێستا ئازادەو دەتوانێ روو بکاتە هەر شوێنێ کە ژیان تێیدا بێ ترسەو چ کەسێك لە چۆنیەتی کارەکانی ناپرسێتەوە، بڕیاریدا: من ئێستا دەگەڕێمەوەو دەچم بۆ شار، لەوێش ئیدی کارێ نەماوە کە من ئەنجامی بدەم.... متچیك لە کاتێکا هەوڵی دەدا تاکید لەسەر نیازەکەی بکات، بەڵام بە زەحمەت توانای ئەوەی هەبوو کە گڕی ئەو هەستە ئاڵۆزەی، ئەو هەستەی لە ناخی ئایندەوە لە وەدی نەهاتنی خەونە زێڕینەکانی رابردوویەوە هەڵدەقوڵا، لە خۆیدا دابمرکێنێتەوە.

هەتاو سوڕا بۆوە ئەو بەری دارغانە لق و پۆپ شۆڕەو بووەکان و ئێستا بە تەواوی کەوتبووە بەر سێبەر. متچیك دەمانچەکەی لە گیرفانی دەرهێناو فڕێی دایە نێو دەوەنەکانەوە. پاشان لە کانییەکی چکۆلەی ئەو ناوەدا خۆی شۆردو لە پاڵیا دانیشت، هێشتا دەترسا بچێتە سەر جادەکە، بە ترسەوە بیری دەکردەوە: ئەگەر گاردی سپی لەوێ بێ چ بکەم؟ گوێی بۆ شووڕە شوڕی ئاوی کانییەکە رادێرا کە بە نێو گیاو پوشەکاندا دەڕۆیی لە پڕ بیری کردەوە: زۆر چاکە، چ فەرقێ دەکات؟ هەنووکە بەوپەڕی راشکاوی و هێورییەوە دەیزانی چۆن لە ژێر پەردەی ئەستووری هەست و بیری پەشێودا، بە چاکی و بە ویستی خۆی ئەو رێگایە هەڵبژێرێ.



لە ناخی دڵەوە ئاهێکی هەڵکێشا، دوگمەی کراسەکەی داخستو یاپشە یاپشە بەرەو شا ڕێگای ناوچەی تودو ڤاکو، کەوتە ڕێ.

لڤنسون نەیدەزانی کە ئەم حاڵەتی نیوە ئاگاییەی چەندی خایاند گەرچی لە دەققەیەك پتری نەخایاند، بەڵام بەلای خۆیەوە زۆر درێژ بوو، کە هاتەوە سەرخۆو خۆی بە زیندویێتی بەسەر زینەکەوە بینییەوە سەرسام بوو، بەڵام چ شمشێرێکی بە دەستەوە نەما بوو، کەللەی ئەسپەکەی بە یاڵە ڕەشەکەیەوە لە کاتێکا گوێیەکی خڵتانی خوێن بوو، لەبەردەمیا دەجولا.

تەنیا لەم کاتەدا زانی تومەز هەموو گوللەکان لەو دەگیران. گوللەکان بە خەستی بەسەر سەریانەوە گیزەی دەکرد. بەڵام بۆی دەرکەوت کە گوللەکان لەپشتیانەوە دەهاتن. هەروەها دڵنیا بوو کە خەتەرترین ساتیان بەڕێ کردووە، پاشان دوو سوار لەتەنیشتییەوە گیرسانەوە — ڤاریاو گونجارنکو بوون— ڕوومەتەکانی گونجارنکو خڵتانی خوێن بوون. لڤنسون هەموو هێزەکەی بیرکەوتەوەو ئاوڕێکی دایەوە. چ هەواڵێك لە هێزەکەوە نەبوو، هەموو جادەکە یەك پارچە جەستەی پیاوان و کەلاکی ئەسپان بوو. چەند سوارێك بە سەرکردایەتی کوبراك نا ئومێدانە هەوڵیان دەدا خۆیان بگەیەننە ئەو، لە دوورتر دەستەیەکی بچووك لە حەرەکەتا بوو و سات بە سات کەمتر دەبۆوە، زەلامێك بە سواری ئەسپێکی لەنگو بە دەم دەست هەڵتەکاندن و هاوار کردنەوە بە دوایا دەهات. زەلامەکە لەلایەن کۆمەڵێك زەلامی کڵاو زەردەوە گەمارۆ درا بوو ، و بە قۆناغە تفەنگ لێیان دەدا، زەلامەکە لە ئەسپەکەی گل بۆوەو کەوتە سەر زەوی. لڤنسون بە نیگەرانییەوە چارەی بە یەکا داو ڕووی وەرگێڕا.

لەم کاتەدا لڤنسون و ڤاریاو گونجارنکو گەیشتنە سەر پێچی جادەکە، دەنگی تەقە کەم بۆوە. گیزەی ئەو گوللانەی بە بنا گوێیاندا ڕەت دەبوو، کز بوو. لڤنسون هەر لە خۆوە جڵەوی ئەسپەکەی ڕاکێشا، ئەو پارتیزانانەی کە بازنەی گەمارۆکەیان شکاند بوو یەك لە دوای یەك دەگەیشتنەوە ئەوان. گونجارنکو ژماردنی. بە خۆی و لڤنسونەوە نۆزدە کەس بوون. لە نێو بێدەنگییەکی تەواو داو بە چاوی هێشتا تەژی ترسەوە کە وردە وردە دەڕەوەییەوە چاویان بڕی بووە تولە ڕێگایەکی زەرد باوی کپ، کە تانجی ئاسا هەر دەڕۆیی. ماوەیەکی زۆر بە چوار ناڵە بە بنارەکەدا داگەڕان. ئەسپەکان وردە وردە کەوتنە لۆقە. ئێستا دەیانتوانی کۆتەرە دارە سوتاوەکان، دەوەنەکان، کیلۆمەتر ژمێرەکان و ئەو ئاسمانە روناکەی کە بەسەر ئەو دارستانە دوورەوە بوو، ببینن. پاشان ئەسپەکان هێدی هێدی ملی ڕێگایان گرتە بەر.

لڤنسون سەری داخستبوو، لە دەریای بیرکردنەوەدا نقووم بوو، تۆزێ لە پێش ئەوانی ترەوە بە سواری ئەسپەکەی دەڕۆیی، هەندێ جار ئاوڕێکی دەدایەوەو سەیری دواوەی دەکرد. نیگای غەریب و خەمناك بوو، لە پڕ جڵەوی ئەسپەکەی ڕاکێشاو گەڕایەوە بۆ لای پارتیزانەکان، بۆ یەکەمین جار نیگایەکی هۆشیارانە لە چاوە درشت و قوڵ و سپی واژەکانییەوە دەرکەوت. هەژدە پارتیزان وەکو یەك جەستە لەبەردەمیا چەقین. بێدەنگییەکی تەواو باڵی بەسەرا کێشابوون.

لڤنسون پرسی: باکلانۆف لە کوێیە؟



هەژدە نەفەر بە بێدەنگی و سەرسامی تەماشایان دەکرد. سەرەنجام گونجارنکو گوتی: باکلانوف–یان کوشت، ئەمجا بە روخساری پەستەوە چاوی بڕییە دەستە لیرو زبرەکانی کە جڵەوی ئەسپەکەی گرتبوو.

ڤاریا کە بە پشتی چەماوەوە لە سەر زینەکە دانیشت بوو و لە تەنیشت لڤنسونەوە ئەسپەکەی لێ دەخوڕی، لەپڕ بەسەر ملی ئەسپەکەدا کەوت و بە دەنگی تووڕەو بەرز کەوتە گریان و شین، پرچە لوولەکەی دەگەییە نزیکی زەوی و دەتگوت لە ئاسماندا لوول دەخوا. ئەسپەکەی لە پڕ بە تەمەڵییەوە گوێیەکانی بۆ دواوە بردو لمۆزی گرژ کردەوە. سیسکین لە ژێرەوە تەماشای ڤاریای کرد، تفەکەی دەمی قوت داو بە پەلە رووی وەرگێڕا.

چاوە ئەبڵەقەکانی لڤنسون، ماوەیەك لەسەر پارتیزانەکان گیرسایەوە پاشان وەك بڵێی سیمای تێك شکاوو بچووکتر بۆوە، پارتیزانەکان بۆیان دەرکەوت کە لاوازترو بە تەمەنتر بووە، بەڵام لڤنسون ئیدی چ شەرمێکی لە بێ توانایی و بێ باشاری خۆی نەبوو، چ هەوڵێکی بۆ شاردنەوەی نەدەدا، بە چاوانی خەمبارەوە لەسەر زینەکە دانیشتبوو، بە ئارامی برژانگە درێژو تەڕەکانی پێکا دەداو دانەی فرمێسك دەڕژانە بنجی ردێنییەوە، پارتی زانەکان روویان لێ وەرگێڕا تا نەبادا ئەوانیش جڵەوی خۆ لە دەست بدەن، لڤنسون رووی ئەسپەکەی وەرگێڕاو بە ئەسپایی لە پێشیانەوە کەوتە رێ.

هێزەکە دوای کەوتن.

گونجارنکو کە دەستی لاواندنەوەو دڵدانەوی بە شانی ڤاریادا دەهێنا، بە شەرمەوە گوتی: مەگری، ئەمە کارێکی باش نییە.

لڤنسون جار جارێ کە خۆی فەرامۆش دەکرد، بە دوو دڵییەوە سەیری دواوەی دەکرد، کە بیری دەکەوتەوە باکلانوف نەماوە سەر لە نوێ دەستی بە گریان دەکردەوە، بەم جۆرە تەنیا نۆزدەکەسیان لە دارستانەکەدا دەرچوون.

کوت و پڕ دارستانەکە کۆتایی هات، پارتیزانەکان قوببەی شین و روناکی ئاسمان، کێڵگە خەنەییە دوورەکانیان کە لەم لاو لەولای جادەکەوە لەبەر تیشکی هەتاودا پان بوو بوونەوە، بە دی کرد. لە دووری میلێکەوە قامیشەڵانێك دیار بوو کە بریقەی چۆمێکی شینی پڕ ئاوی گرتبووە باوەش. خەرمان جاڕێکی لە تەنیشتەوە بوو خۆی بە تاجی کۆمەڵە خەرمانێکی گەورەی بە شکۆوە با دەدا، لێرەدا جۆرە ژیانێکی دی لە گەڕدا بوو، ژیانێکی پڕ کۆشش و شادی بەخش، خەڵکی بە جل وبەرگی رەنگاو رەنگەوە، وەکو مارو مێرووی رەنگاو رەنگ خڕ بوو بوونەوە، سواڵەی گەنم لە حەوادا لوولی دەخوارد، کومپاین بە دەنگی وشك و سافەوە خشەخشی دەکرد، حیلکەی پێکەنینی کیژان لە نێو تۆزو گەردو کای بریقەدارەوە دەبیسترا.

لە پشت چۆمەکەوە زنجیرە چیایەکی شین باو دیار بوو، لەلایەکەوە ئاسمانی شینی خستبووە سەر شانی و لەلایەکی دییەوە دارستانی پرچ زەردی گرتبووە باوەش.



له نێو قوتە پیرۆزەکانی کوێستانەوە، پەڵە هەوری تەنك و سووری کاڵ، کە لە دەریاوە باری هەڵگرتبوو، چەشنی شیرێکی هەڵچووی پڕ کەف کە لە گوانی چێڵانەوە بێتە دۆشین، دەرژایە ناخی دۆڵەکەوە.

لڤنسون بە بێدەنگی و بە چاوانی تەڕەوە روانییە ئاسمانی بەرین، ئەو ئاسمانەی کە مژدەی نان و ئیسراحەتی دەدانێ، روانییە خەڵکانی غەریبی خەرمان جاڕەکە، ئەو خەڵکەی دەبوو بە زوویی وەکو ئەو هەژدە کەسەی بە دوایەوە بوون، بە دڵ و بە گیان خۆشی بووێن.

ئەوجا لە گریان کەوت.

ئینسان دەبێ بژی و ئەرکی خۆی ئەنجام بدات.

1925 – 1926

تەواو

1986/6 - یاخسەمەر

حەمە کەریم عارف

چاپی یەکەم/ 1987





## پەراوێزو رونکردنەوە:

- مینەر: کەسێك پیشەی مین نانەوە بێ.
- بالأڕۆ: مصعد کهربائی
- ماکزیمالست: ئەندامی پەڕگیری تروریستی و نیمچە فاشستی حزبی سوسیال شۆڕشگێڕەکان بوو.
- ئەفرا: دارێکە لە بابەتی چنار، پڕ گەڵاو لق و پۆپە، بەرزییەکەی دەگاتە بیست میترێك
- غان: جۆرە دارێکی زۆر زەلامە.
- چامیزا: جۆرە دانەوێڵەیەکە دەکرێتە ئارد
- ئوزیب ئابرامیج: نازناوی لڤنسون-ە.
- اسکیتسل: جۆرە گەمەیەکە، هەندێ دار وەکو نیشانە لە عاردی دەچەقێنن و بە گۆ لێی دەدەن.
- سوخاری: جۆرە نانێکی شیرن و وشك و سوکە.
- قوزاق: بە سەربازی سەردەمی تزار دەگوترا.
- یەهودا: یەکێك بوو لە حوارییەکانی پێغەمبەر عیسا، کە سەرەنجام خیانەتی لێ کردو بووە مایەی کوشتنی ئەو پێغەمبەرەو بە خۆیشی لە سوێی پەشیمانی ویژدان و عەزابی رۆحیدا خۆی کوشت. ناوی یەهودا رەمزی خیانەت و دوو روویە.
- گاردی سپی: دەستەیەکی دژ بە شۆڕش بوو، لە جەنگە ناوخۆییەکاندا دژ بە شۆڕشگێڕان دەجەنگین.




**حەمە کەریم عارف**

- کەرکووکییە و لە ساڵی 1951دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی 1975 کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (170) رۆژنامەی هاوکاری ساڵی 1973 بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی 1976ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك, نووسەری کوردستان, کەلتوور, نووسەری کورد, گوڵانی عەرەبی, ئاڵای ئازادی تا ژمارە 00222, گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی, بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك, نووسەری کوردستان, کەلتوور, رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: 222 بەناوی گۆڤەند, زنار, سیپان, پاکزاد, محەمەدی حاجی, سیروان عەلی, دیدار هەمەوەندی, هێژا, ح. ع بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.
- جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و رێکخراوێکی سیاسی نەبووە, لە ساڵی 1974 – 1975دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە, لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ, بێ وابەستەگی حیزبی, پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات, چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە, لێ زۆربەی هەرە زۆریان, بە تایبەتی ئەوانە لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاو بوونەتەوە, لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

1- تیرۆژ, کۆ چیرۆك, چاپی یەکەم 1979
2- کۆچی سوور, رۆمان, چاپی یەکەم 1988
3- بەیداخ, چیرۆك, 1988
4- داوەتی کۆچەرییان, کۆ چیرۆك چاپی دووەم 2005
5- لە خۆ بێگانە بوون, کۆمەڵە چیرۆك, چاپی یەکەم (1999) دەزگای گوڵان
6- کوچ سرخ, کۆ چیرۆك, بە فارسی, وەرگێران چاپی یەکەم 1987 شاخ
7- نینا, رۆمان, سابت رەحمان, دوو چاپ, شاخ, شار 2002
8- نامۆ, رۆمان, ئەلبیر کامۆ, دوو چاپ, شاخ, شار 2003 دەزگای ئاراس
9- رێبەر, رۆمان, مەهدی حسین, یەك چاپ (شاخ)
10- شکست, رۆمان, ئەلکساندەر فەدایەف, چاپی شاخ (راه کارگر)




11 – هاوماڵەکان, رۆمان, ئەحمەد مەحمود, دوو چاپ, شاخ, شار 2000 گوڵان

12– بێناسنامەکان, رۆمان, عەزیز نەسین, 3 چاپ شاخ, شار 2003

13– قوربانی, رۆمان, هیرب میدۆ, چاپی یەکەم 2004 دەزگای شەفەق

14– دووره ولات, رۆمان ع. ڤاسموف, چاپی یەکەم2000 دەزگای گوڵان

15– ئازادی یا مەرگ, رۆمان, کازانتزاکیس, چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران

16– چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی, دوو چاپ, شاخ, شار 2004 کتێبخانەی سۆران هەولێر

17– ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی, چاپی شاخ 1985

18– دلێریی خۆراگرتن, ئەشرەف دەهڤانی, چاپی شاخ

19– مەسەلەی کورد لە عێراقدا, عزیز شەریف

20– مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد, ئیحسان نوری پاشا, یەك چاپ

21– خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ, مەسعودی ئەحمەد زادە, چاپی شاخ

22– کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو, د. کوینتەر دیشنەر, چاپی شێیەم 2004 دەزگای ئاراس

23– لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس, نەجەف قولی پسییان

24– گوزارشتی مۆسیقا, د. فۆاد زەکەریا.

25– دەربارەی شیعر و شاعیری, رەزا بەراهەنی.

26– ڤنسنت ڤان گوگ, شانۆنامە, باول ئایز لەر

27– بە دوعا شاعیرەکان, شانۆنامە, جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:12)

28– جولەکەکەی ماڵتا, شانۆنامە, مالرۆ.

29– دادپەروەران, شانۆنامە, ئەلبیر کامۆ.

30–بەد حاڵی بوون, شانۆنامە, ئەلبیر کامۆ.

31– چاو بە چاو, شانۆنامە, گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)

32– ریچاردی سێیەم, شانۆنامە, شەکسپیر.

33– گەمەی پاشا و وەزیر, شانۆنامە, عەبدوڵلائەلبوسێری.

34– کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا, چاپی یەکەم 1998 وەزارەتی رۆشنبیری.

35– هونەر و ژیانی کۆمەڵایەتی, پلیخانۆڤ, چاپی یەکەم 2005 دەزگای موکریانی

36– پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت, ئیڤلین ریید.

37– لێکدانەوەیەك لە مەڕ نامۆ, لویس ریی.

38– منداڵە دارینە, چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.

39– فاشیزم چیی؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان, یەلماز گونای

40– شوانە بچکۆلەکە, چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان

41– زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)

42– لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە.

43– کۆمەڵێك ئەفسانەی جیهانی (23 ئەفسانە)

44– زندە خەون, کۆمەڵە چیرۆکی چیخوف, چاپی یەکەم (2001) دەزگای موکریانی

45– ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی, چاپی یەکەم (2004) کتێبخانەی سۆران, هەولێر



46- جێ پێ, کۆمەڵێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان:(سادقی هیدایەت, جەلال ئال ئەحمەد, بوزرگی عەلەوی, سادقی چوبەك, مەنسوری یاقوتی)

47- چیرۆکستان, کۆمەڵێك دەق و رەخنە, چاپی یەکەم 2005 نووسەرانی کەرکووك

48- چۆنیەتی فێر بوونی زمانی فارسی, چاپی یەکەم (2000) حەمە کەریم عارف

49- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف

50- پەلکە رەنگینە, حەمە کەریم عارف, چاپی یەکەم (2004) وەزارەتی رۆشنبیری

51- کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە

52- چزیشفسکی, فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس

53- چایکۆ فسکی, ژیان و بەرهەمی.

54- ئیدگار ئالین پۆ, ژیان و بەرهەمی.

55- جاك لەندەن, ژیان و بەرهەمی

56- گوگول, نووسەری ریالیست

57- یەڵماز گونای, ژیان و بەرهەمی

58- سادقی هیدایەت, ژیان و بەرهەمی

59- خافرو غ لە شیعر دەدوێ, ژیان و بەرهەمی

60- رێبازە هونەرییەکانی جیهان

61- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا, چاپی یەکەم (2004) دەزگای سپیرێز

62- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەلاَتدا ( بە شەریکی) چاپی یەکەم (2001) دەزگای گولاَن

63- راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا, حەمە کەریم عارف

64- دیدار و دەق و رەخنە.

65- دیداری چیرۆکڤانی.

66- قوتابخانە ئەدەبییەکان, رەزا سەید حسەینی.

67- ناودارانی ئەدەب, حەمە کەریم عارف

68- هەزار تۆپی شیعری نوێخوازی و چەند باسێکی دی, حەمە کەریم عارف.

69- کورد لە سەدەی نۆزدە و بیست دا, کریس کۆچرا, چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران

* لە راپەرینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێران) بلاَو دەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بلاَو کردنەوەی هەبن, ئامادەیە بە خۆرایی پێشکەشیان بکات و...